ژمــارەی ســپاردن لــە بەرێوەبەرایــەتی گشــتی کتێبخانەکان : ١١٨٢

چاپخانە : چاپخانەی زانا

ساڵ :٢٠١٦

تیراژ : ٥٠٠ دانە

نرخ : ١٠٠٠٠ دینار

ڕۆژبەڕۆژ بیانووی بێدەنگبوون زۆرتر دەبێت ، تا زیاتر ببینی و زیاتر تێکەڵ بیت زیاتر تەنهایت لا خۆشەویستر دەبێت ، من باش ئەمزانی کە ئەزمون ئەمانگەیەنێتە ساتێك کە ئیتر شانازی بە تەنیا بوونی خۆمانەوە بکەین ، ئەوتا ئێستا رۆژگارێك تێکەوتووین وامان لێهاتووە .

ئەم رۆمانە یەکەم پلەی نوسینمە و یەکەم هەنگاومە بۆبلاوکردنەوە وەك کتێبێك بۆ ناو کتێبخانەی کوردی و یادگاری یەکانی مێژوو ،هەر بۆیە پەرە بە پەرەی پیرۆزە لام و خۆشەویستە وە گرنگی یەکی تایبەتی هەیە لام لەروی بیرو پێکهاتەیەوە بە دڵنیای ماندوو بوون و شەونوخونی زۆری ویستووە . پێشکەشی دەکەم بە هەردوو خونچە جوانەکانم ( تینا - کاردا ) .

زەبەنگ بهاالدین نجم الدین

هێلـین گیـان ئـەوەی تـۆ لــە مـن نزیـک دەکاتــەوە دووری یــە ، ئــەو بۆنـــەی هەمیشـــە لـــە دوکـــەڵی هەناســـەم دێـــت داخـــی مـــۆمێکی کـــوژاوەی خۆمـــە و پریشـــکە ســـووتوەکانی تۆیـــە ، روخســـاری تـەنیایی مـە کـە ئـاوا بـێ رەنگـی کـردووم ، ئـەزانی هێلـین بـە بیـرم دێ نــەنکم هەمیشــە پێــی دەگــووتم ، تــۆ لــە ئێوارەیــەکی غەمگینــدا دیـار نـامێنی ، تـۆ لـە نێـوان خورئـاوا بـوون و سـێبەری قـۆخێکی تــەڕدا لــە نــاو تــاریکی و تــەمومژێکی ســەختدا ئیتــر بــێ دەنــگ دەبـــی ، لـــە شـــوێنێکدا کـــە خۆشـــت درکـــی پـــێ ناکـــەی ئیتـــر هەناســـەکانت دەنگیـــان نـــامێنێ و جێـــت دەهـــێڵن ، ئیتـــر کەســـێك نامێنێـت بــە دوای هــەنگاوەکانتا ویــڵ بێـت ،کەسـێك نامێنێـت بــە نـاوی خۆتــەوە بانگـت بکـات ، لەوێـدا بـە تـەنهایی تـا کۆتـا گـوزەر دەکـــەی ، هەمیشـــە نـــەنکم پـــێ ی ئـــەوتم کـــورم ئەگـــەر ئەتـــەوێ هــەموو رۆژێـك بــە هێمنــی بمـری ئـەوا بـرۆ عاشـقی کەسـێك بــە ،هـەر کەسـێك بێـت گرنـگ نـی یـە گرنـگ تـۆ عاشـقی بیـت ئـەو کـات هــەموو رۆژێ مـردن ئـەبینی و لــە بـاوەش ئەکـەیت و مــاڵ ئاوایشــی لــێ دەکــەی ، هێلـین گیـان بـروام پـێ بکـە مـن بـاش ئـەزانم عەشـــق فرینێکـــی هێمنانەیـــە بـــەرەو ئاســـمانەکانی جەهەننـــەم ، مـن وا هەسـت ئەکـەم مـن و تـۆش بـەرەو ئـەوێ ئـەفرین ، بـەڵام نـازانم ئـاخۆ ئــەوەی ئێمــە دەیکــەین هــەمان رێچکــە و رێگــە بێــت

یــان ئــەکرێ ئاســمانێکی تــر هــەبێ جیهــانێکی جیــا لــەم ئاســمانە تاریکــەی ئێمــە هــەبێت ، بــەڵام کــە بەرێچکەکانــدا دەچمــە خــوارەوە هـــــەموویان ئـــــەبرم و وورد وورد لـــــە دڵـــــە خنجیلانـــــەکانمان ئــەروانم ، ســەرەنجام ئەگەڕێمــەوە ســەر ئــەو ترســەی کــە هــەر ئـــەو ئاســـمانەی جـــاران بێـــت ، مـــن ئەترســـم تـــۆش گیـــرۆدەی بەدبــەختی یــەکانی خــۆم بکــەم ، لــەم جیهانــە وێرانــەدا تــا ئەگەیتــە ئــەو پلەیــەی مــەرگی خــۆت بــە بــەرچاوی خۆتــەوە ببینــی ئــەبێ هــەر بەدبــەختی بژمێــری ، خــەمی مــن ئەویــە بــە بەدبــەختی یــەکانی خۆم تۆش رەنگ نەگری بە نەگبەتی یەوە.

هێلیـــنش بـــە سەرســـورمانێکی زۆرەوە کـــەتێ نـــە ئەگەیشـــت لـــە مەبەســـتی ووشـــەکانم بـــە چـــاوێکی کـــراوەی پـــر لـــە ســـۆز و خەمگینــەوە پەنجــەکانی هێنــا بــە تاڵــە تاڤگــەی یــەکانی قژیــداو بــەرزی کــردەوە بــۆ ئــەودی هــەورەکانی خــەیاڵی مــن و ســەیری کـــردم و ووتـــی : بـــە مانـــای چـــی فـــرین بـــەرەو ئاســـمانەکانی جەهەننــەم ؟ مردنــی چــی ؟ گیــرۆدە بــوونی چــی ؟ مــن لــە تــۆ تێناگـــەم چـــی دەڵێـــت ، ئـــەم ووشـــانەت لای مـــن هـــیچ مانایـــەك ناگەیــەنێ ، پــێم بڵــێ ئــەی ئەمــەی ئێمــە چــی یــە ؟ شــتی ســەیر

ئـەڵێت ئـەزانی مـن هـیچ هـیچ تێناگـەم ؟ مـن وا هەسـتەکەم ئێسـتا کەوتومەتە گێژەڵوکەی گومانەوە لە هیچ تێ ناگەم بروا بکە .

راسـتی یەکـەی مـن خۆشـم زۆر درکـم بـە ووشـەو رسـتەکانم نـەدەکرد سەرخۆشـی یـان بـێ ئاگـایی یـەك دیـار بـوو بـە قسـەکانمەوە لەگـەڵ ئـەوەی هـیچ مەسـتی یـەکم نـەبوو بـەڵام ووشـە و وێنـەکانم هـەمووی تێکـەڵ کردبـوو ، بۆیـە ئـاورێکم بـۆ دایـەوە بەسـەرێکی نزمـەوە وەك ئـەوەی لـە جەنگێکـدا دۆرا بـم یـان لەگـەڵ پەیمانـەکانی خۆمـدا بـەزینێکم بـەدی کردبێـت بـە هێواشـی پـێم ووت : ئـاخر مـن ئـەزانم ئـەم عەشـقەی مـن و تـۆ بـێ گەیشـتن بـەو سـەرنجام و ئامانجـە دیـاری کـراوەی لـە مێشـکماندایە هـیچ مانایـەکی راسـتەقینەی نـامێنێ وئـەو کـات کۆتاییمـان بـەرەو وێـڵ بـوون یـان شـیت بـوون ئـەچێت . دەنـا مـن تـۆم ئـەوێ بـە گـەردونێك عیشـقەوە و عەشیقیشـم ئـەوێت بـە مشـتێ لـە سـۆزەکانی تـۆوە ، منـیش نامـەوێ بفـرم بـەرەو ئاسـمانەکانی جەهەننـەم لەگـەڵ تـۆدا ، نامـەوێ لـە نەهامەتـەکانی عەشـقدا بـژیم ، بـەڵام پـێم وابـێ ئەمـە مەحاڵـە لەکۆتایـدا هـەر ئـەبێ لـەوێ بـین و لـە کۆتایـدا ئـەبێ ئێمـەش لـەوێ بسـوتێین چونکـە ئەمـە تـەنها پێگـەو مەملەکەتی ئاخیرەی عەشقە!

هێلـین گیـان مـن عاشـقێکی نەگبـەتم ، نـە ئـە تـوانم بـێم بـۆ لات ، نـە ئەشـــتوانم لـــە بیـــر خۆمـــت بەرمـــەوە ، مـــن ڕۆژ لـــەدوای رۆژ دەگـــەرێم تـــا تێـــربم ، بـــەناو کـــۆڵا نـــەکانتا ئـــەڕۆم لەهـــەر چڵێکتـــا هـەزارەها لقـی لـێ دەبێتـەوە هێلـین تـامی تـۆ لـەتامی ئـەو میوانـە دەچێـــت کەبـــەرەنگی بـــاران و بـــۆنی بـــا ڕەنگیـــان دەگـــۆڕێ ، هەمیشـــە دوێنێـــت لـــەمڕۆو ئـــەمڕۆت لـــە سـبەینێ نـــاچێ ،بۆیـــە هـــەردەم بـــەدوای نهێنیـــە بـــۆن خۆشـــەکانتا ئەگـــەڕێم ،هەربۆیـــە هـەموو جـارێ بەباوەشـێکی تـەرەوە بـۆلات دێـم ،هـەموو بـارینێ لـــەوەی تـــر تـــەڕتر دەبـــم ،بۆیـــە هەمیشـــە برســـیتم هێمنیـــت ئەوەنـدەی تـر خـاوی کـردم چاوەکانیشـت هـەموو ڕۆمانـەکانن !! بۆیـــە هـــەرگیز لەخوێندنـــەوەیان تـــەواو نـــابم ، بـــەڵام لەگـــەڵ ئەمانەشدا من لە عەشقدا نەگبەتم خۆم باش خۆ ئەناسم .

لەوێـدا مـن ئەمویسـت شـتێك روون بکەمـەوە ئەمویسـت هـێمن تـر قسـەی بـۆ بکـەم روونتـر شـتەکان بڵـێم بـەڵام ئـەو بـۆ ئـەوەی مـن زیـاتر بـەرەو ورێنـە کـردن نـەچم بـۆ ئـەوەی نەگەمـە دۆخێکـەوە لـە نـاو خۆمـدا وون بـبم زیـاتر لـێم نزیـك بـووەوە یەکسـەر ووتـی : ئـەی ئـەوە نـی یـە مـن هـەم ، ئـەوە نـی یـە عەشـقیش هەیـە ئـەی جەهەننـــەمی چـــی کـــام جەهەننەمـــە ئـــەڵێیت تـــۆ ؟ کـــوا مەملەکـــەتی

عەشـــق جەهەننەمـــە ؟ مـــن وا ئـــەزانم کـــە مەملەکـــەتی عەشـــق بەهەشـت بێـت ، بـەڵی عەشـق خـۆی بـۆ خـۆی بەهشـتە بەهەشـت ، هەمیشــە ئــەوەم بیســتوە کــە مـرۆڤ کاتێـك عاشـق دەبێـت باڵــەکانی ئـەیفرێنن بـۆ ئـەودیو هـەورەکان بـەرو فردەوسـی ئەبـەن . ئەگـەر واش نــەبێت دە بــاش بزانــە مـن ئـەو جەهەننەمــەی لەگـەڵ تـۆم بـم لــە بەهەشــتە خــەیاڵی یــەکانی ئێــرەم پــێ خۆشــترە ؟ ســەیرکە کاردۆ

نهێنــی بـوونی مـرۆڤ چیـی یـە ؟ گـەر نـەتوانێ پەنجـە بـۆ ئـاگر نـەبا خــەونی باڵنـدە چـی یـە ؟ گـەر نـەتوانێ سـەما لەسـەر هـەور بکـا ! تـوڕەیی بـا چـی یـە ؟ گـەر نـەتوانێ بـاوەش بـە خاکـدا بکـا ! جـوانی گـوڵ چـی یـە ؟ گـەر نـەتوانێ مـاچی هـەتاو بکـا ! هێمنـی دەریـا چـی یە ؟

گـەر نـەتوانیێ فرمێسـك بـە ماسـی بـدا ، ئـەی ئامـانجی عەشـق چـی یــە ئەگــەر خــەم و ئــەزار هەڵنــەگرێ . مـن ئامــادەم لەگـەڵ تـۆ تـا ئـــەودیو گرکانـــەکانی بـــوون بـــڕۆم مـــن تـــۆم ئـــەوێت بـــە هـــەموو رۆحمــەوە ئەمــەوێت بــۆ تــۆ بــژیم و بــۆ تــۆ بمــرم وە مــن هەمیشــە هەم و لەگەڵتم .

زەردەخەنەیـــەکم کـــرد و بـــە بێتاقـــەتی یەکـــەوە پـــێم ووت : کامـــە تۆ هـــەیت ؟  لـــە کامـــە شـــوێن ؟ لـــە کامـــە کـــات ؟  تـــۆ لێـــرەی لێـــرە ، ئێـــرەش کـــە هـــەر خـــۆی بـــۆ خـــۆی جەهەننەمـــە ، کاتـــەکانیش وەك ئـــاگر ئەســـوتێن و بـــە بـــادا تۆزیـــان ئـــەچێ  تـــۆ لـــەوە ئـــەچێ درك بـــەوە نەکـــەی لـــە چ نیشـــتیمانێکدا ئـــەژیت لـــە چ وێرانەیەکـــدا گـــوزەر ئەکـــەی ، تـــۆ تێناگـــەی لـــەم مەملەکەتـــە کاتێـــك دووکـــەس بـــەر یـــەك ئەکـــەون و بـــە یـــەك ئەگـــەن  وەک بەریەککەوتنـــی دوو مـــادەی کیمیـــاییە؛ گەر کارلێـــک بـــکەن، هەردووکیـــان دەگـــۆڕێن ، ئێمـــەش هەر واین ئاوا نامێنینەوە ئەگۆرین ، بروا بکە ئەگۆرێین .

هێلـــین گیـــان مـــرۆڤ کە عاشـــق دەبێـــت، لەوانەیە لەبەر خـــاتری ئەومرۆڤـــی عاشـــق منـــداڵەکانی جێبهێڵێـــت، دایـــک و بـــاوکی خـــۆی بفرۆشـــــێت ، تەنـــــانەت وڵاتەکەیشـــــی بـــــدۆرێنێ ، ئەگەر زۆر میهرەبـــان بێـــت، عەشـــق پیـــاوت پێـــدەکوژێت و دزیـــت پـــێ دەکـــات، عەشق ئاوایە..! قورسە قورس بروا بکە .

راســتی یەکــەی مــن ویســتی ئــەوەم نــەبوو بــەو بابەتــە بــاس کــەم لــەو کاتــەدا  چونکــە خــۆم مێشــکم تێك ترنجــا بــوو ، خــۆمم لــە خــۆم بــۆ جیـــا نەکرایـــەوە بـــە تـــەواوی لـــە نـــاو خۆمـــدا ئاڵۆزگـــابووم ، نـــەم ئـــەزانی مـــن لـــە نـــاو خۆمـــدام یـــان خـــۆم لـــە نـــاو مندایـــە ، ئەســـڵەن

کوچـەو کـۆڵان نـەما بـوو بـە دوای خۆمـدا نەگـەڕێم ڕاسـتە لـە زۆر کۆڵانــدا خــۆمم بینــی بــەڵام لــە زۆریکــی تــردا هێشــتا تارمایشــم دیارنــەبوو لەوانەیــە لـێم بپرسـێ خۆتـت بـۆچی یـە ؟ یـان پـێم بڵـێ ی ئــەوە نــی یــە خــۆت لەگــەڵ خــۆتی ، ئەگــەر مەبەســتیش لــە ونکردنــی بەشـێکتە کـە نـازانی دووکـەڵ و تارمایـت کـوا ؟ ئەمـە شـتێکی خـراپ نـی یـە ، خـۆ ئـەوە تـا ئـەو خەڵکـە نـەك بەشـێکیان بگـرە هـەر هیچـی خۆیـان لەگـەڵ نـی یـەوە ئاسـایی گـوزەر دەکـەن ئیتــر تــۆ چیــت داوە لــەم سەرکەشــی و شــێتی یــە دە دانیشــە بــە دەردی خۆتــەوە خـوا دوو تیکـە نـانی داوە بیخـۆ و بلـێ ( الحمـد لله ) بـۆ تـۆش وەك مرۆڤـەکانی ئـەم زەمانــەت لێهـاتووە بـۆ قەناعـەت نــەماوە بــە شــتەکان بـۆ خـۆت خسـتۆتە ئـەم گێـژاوەوە چ سـوودێك ئـەبینی لـەم تۆفانـەی خۆتـت تێخسـتووە .سـەیرکە کـاردۆ گیـان دڵـی مــــــن وەک پیانۆیــــــەك وایە، ئاوازەکــــــانی نابەخشــــــێت بە هەمووکەس،تـۆ نـەبیت کـەس نـی یـە بزانـێ ئـەو پیانۆیـە بژەنـێ ، وە دڵــی مــن تــەنها بــە پەنجــەکانی تــۆ دەژەنرێــت مــن تــەنها لــە ســۆزی تــۆدا گــەورە دەبــم ، کــاردۆ دەکــرێ چــاوی گــەردوون بسـڕنەوەو هەناسـەکانی بـاران بخنکێـنن ، دەکـرێ دەنگـی بـا ببـڕن وســەوزی لــە گیـا بسـتێننەوە ، دەکـرێ هـەورێك لـە کونـە دارێکـدا زینـدان کــەن وملــی دەریـا ببڕنــەوە .دەکــرێ پــەیام لــەنیێردراوان

بســتێننەوەو منــاڵی باوانمــان هەڵگرنــەوە دەكــرێ تــاریكی شــەو وونكــەن و ڕوونــاكیی ڕۆژیــش داپۆشــنەوە دەكــرێ نــاوی بونــەكان بیــر هــەموو كــەس بەرنــەوە بــەڵام نــاكرێ ڕۆحــی ئــەو لەناومنــدا بیربەرنــەوە نــاكرێ هەناســەكانم بــێ چــاوی ئــەو بێنــە دەرەوە ناكرێ لایەكمان جیا كەنەوە !!

ئــاخر ئــە ئەمەیــە قــوری كــردووە بەســەرمندا ، دوو تیكــە نانەكــە نــاڵێم ئەلحمدەكــەش نــالێم ، باســی خــوداش ناكــەم مــن ســاڵانێكی زۆر لەگــەڵ خــودا كێشــمە كــێش و شــەرمان بــوو، خۆشــاردنەوەو وونبونمــان هــەبوو ، ســەردەمانێك ئــەو بــانگی منــی دەكــرد ســەردەمانێك مــن هانــام بــۆ ئــەو ئــەبرد ســەردەمانێك ئــەو بــە دوای منــدا ئەگــەرا و ســەردەمانێك مــن بــە دوای ئــەودا ئەگــەرام نــە مــن لــەو تێگەیشــتم نــە ئــەویش منــی ویســت وەك مێگەلەكــەی ئێــرەی ، ئــاخر خــۆ مــن ئەگــەر رۆژێــك بینــیم و پــێ ی ووتــم تــۆ بــۆ ئاشــت نەبوویتــەوە لەگــەڵ مــن بــۆ نــەهاتی بــەرو رووم ؟ ئــەڵێم ئــاخر تــۆ هەمیشــە وونــی وون عەشــق لەگــەڵ ســەرابا نــاكرێ ئــەی خــوا خۆشەویســتی باوەشــەكانی هــەردوولای ئــەوێ خۆشەویســتی ئەوەیــە كــە پێكــەو بگــرین و پێكــەوە قاقــا پــێ بكــەنین ئیتــر ئەمــە زۆری ئــەوی باســی بكــەم خــۆ ناكرێــت لــەم گۆبەنەگــەدا كــە

ناومەتــەوە لــە گــەڵ نــاخی خــۆم و هێلـین بیـر لــەم بابەتــە ئالۆزانــەش بکەمــەوە بۆیــە واز لـــە بیــری ئــاینی بێـنم باشــترە ئێســتا ، کێشــەی مــن ئەوەیــە ئێســتا هــیچم بــۆ بــاس نــاکرێ لەبــەر ئــەوەی پارچــە پارچـــە بـــووم و پارچـــەکانی خـــۆم وا بـــڵاو بوونەتـــەوە دەهـــرێکم ئـەوێ خـۆم کـۆ بکەمـەوە ! هـەموو ئەمانـە لـە نـاو بیـرو خەیاڵـەکانی خـۆم بـوون بـێ ئاگـا بـووم لـەوەی هێلینیشـم لەگەڵدایـە تـا لـەپر بـە دەنگێکـــی لاوازتـــرە پـــر بـــوو لـــە غـــەمگینی و حەســـرەت دەنگێـــك وەك نەوەیـــەکی بـــەجێماو وەك ســـوارێکی مانـــدوو ووتـــی : ئـــاخر مـــن ئێســـتاش تێناگـــەم بـــۆ مـــن نـــیم ؟ بـــۆ ئـــەبێ عەشـــق لـــە دوا ویســـتگەی جەهەننـــەم بێـــت بـــۆ وا تـــاریکی ئـــەبارێنی بەســـەر ئـــەم خۆشەویســتی یەمانــدا ئــاخر ئــەبێ مــن و تــۆ چ گوناحەیــەکمان کــرد بێــت وات لــە مــن کــرد منــیش نــازانم ئــەی مــن چــیم ؟ کــێم ؟ ئەمــە تــۆ بــۆ وات لێهــاتووە ؟ لــەوە ئــەچێ بێــزار بــووبی لــێم یــان وەك جــاران خۆشــت نــەوێم مــن هەســت ئەکــەم لــە ناخــەوە تــۆ گــۆڕاوی هەســـتەکانت وەك جـــاران لـــە دەرگـــای دڵـــم نـــادەن ، ئـــاخر کـــاردۆ گیــان بــۆ تــۆ نــازانی ئــەم دڵــەی مــن لای تــۆ نــەبێ لــە هــیچ باخێکــدا ئــۆقرە نــاگرێ ؟ تــۆ نــەبی هــیچ پیاوێــك بــە شــازادەی خــۆی نــازانێ تــۆ نـــەبی ئـــەم پێکـــەنین و گریـــان و حـــەزو عەشـــقەی مـــن لـــە هـــیچ مەملەکــەتێ جێگــەی نــابێ ئــەم کەشــتی هەســت و ســۆزەی مــن لــە

ڕۆخـی دەریـای پـاکی تـۆ نـەبێ لـە هـیچ کەنارێکـدا لەنگـەر نـاگرێ .

منـــیش بـــە بیرکردنێکـــی قوڵـــەوە ئـــەموت ئـــاخر ئەمـــەش قوربەســـەری یـــەکی تـــرە ، خـــۆ مـــن خۆشـــم نـــازانم تـــۆزێ پـــێش ئێســـتا چـــیم ووتـــوە ، بەراســـتی ســـەیرە ! کـــە لەگـــەڵ هێلـــین ئـــەبم هـەموو بیـرم ئەشـێوێ بینینـەکانم بـۆ ڕێـك ناخرێتـەوە ، پـێ ئـەچێت ئێمــە هــەر خۆمــان وا نەگبــەت بــین ، ئاســودەیی بــە خۆمــان ڕەوا نــابینین . پــێ ئــەچێت ئیرەیمــان بــە پێکەنینــەکانمان بێــت بۆیــە هەمیشــە گریــانێ ئەکەینــە مێــوانی ، یــان لەوانەیــە فێــر نــەکرابین چــۆن بتــوانین بــە ئاســودەیی بــژین تەنانــەت لــە خوێندنگاکانیشــدا فێریـــان نـــەکردین چـــۆن خۆشـــبەخت بـــین چـــۆن بـــە دوای بەختـــەوەری و پێکەنینـــدا بگـــەڕێین هـــەموو مـــادە کیمیـــایی و فیزیایـــەکان و ســـەراپای میـــژووی کوشـــتارەکانی عومـــەر و عــەلییان هــەمووی پــێ ووتــین ، بــەڵام وانەیــەك نــەبوو فێرمــان بکـات ئەوەنـدە نەترسـین و ئەوەنـدە نـەگرین فێرمـان بکـات ئەوەنـدە تاریکی بەسەرر یەکدا نەبارێنین .

ئـــەو فـــەقیرە لـــە مـــن تێناگەیشـــت بۆیـــە هـــەر دەســـتی ئەهێنایـــە ناودەســـتەمەوەو تونـــد دەســـتەکانمی ئەگوشـــی لێـــوی لـــە ڕوخســـارم

نزیـك كـردەوە و ئـەیوت : كـاردۆ گیـان مـن هـەر تێناگـەم تـۆ بـۆ وا ئەكـەی تـۆ بـۆ ئەتـەوێ هـەموو شـتێ تێـك بـدەیت ، ئـەم پەیكـەرە جوانــەی عەشـقی نێوانمــا بـۆ ئەشـكێنی بـۆ ئەتـەوێ ئــەم عەشـقە پاكـە بكـوژی خۆشەویسـتیمان بخنكێنیـت كـەی راسـتە ئەمـەی تـۆ ئەیكەیت ، بۆ وا ئەكەیت بۆ؟

بەراســـتی مــــرۆڤ كاتێـــك كە نزیـــك ئەبێـــتەوە لەوكەســـەی كەخۆشـــی دەوێ لێـدانی دڵـــی خێراتـــر دەبێــت منــیش ســات دوای ســات زیــاتر گــوێم لــە ترپــەكانی دڵــم دەبێــت !هەناســەكانی وەك بایـەكی سـووك لـە رومەتـەكانی ئـەدام گـوێم لـە دەنگـی ترپـەكانی دڵی ئەویش ئەبوو .

ئێســـتا شـــتەكە وا لـــێ ئـــەكات وەك ئـــەوەی ئـــەم نـــەبوونی و هـــەژاری و شـــەرو دەردو بەڵایـــەی ئـــەم نیشـــتیمانە هـــەمووی خـەتای مـن بوبێـت،ناحەقیشـی نـی یـە ئـەو نـازانێ مـن لـە عەشـقا چەندێكـە پاڵـەوانم بـەڵام ئەترسـم لـە ئازارەكـانی ئـەو لـە خەمـەكانی خـۆم بـۆ ئـەو بـەڵام ئـەو لـە شـێواویەكانی منـیش تێناگـا لـەم سـاتەدا بۆیە ناحەقی نی یە سەری سورماوە .

ئــــای بــــەو نیشــــتیمانەیا بیــــرم کەوتــــەوە نیشــــتیمان ، ئــــەمیش ســـەردەمێکی زۆر خۆشـــمان ئەویســـت و ســـروودمان بـــۆ ئـــەوت .. ئێمـە کۆمەڵـە گـەنجێك بـووین هەمیشـە ئـاڵای نیشـتیمان لـە ناخمانـدا بـــوو وێنـــەی شـــەهیدەکان و پێشـــمەرگە کانمـــان کـــەبس ئـــەکرد و ئـەمان کـردە ملمـان ، هێنـدەمان حـەز لـە شـەرواڵ و ریشـی درێـژ بـوو وامـان ئـەزانێ ئـەو کاتـەی شـەرواڵ لـە پـێ ئەکـەین ئیتـر بوینەتـە خـاوەنی دەوڵـەت ، ئێسـتاش ئـەو شـەرواڵە نەگبەتـە پارچـە پارچـە کـراوەو پڵیتـە نـەوتاوی یەکـەی زۆپاکـەی پـێ ئەسـرێت . جـا کـوا کـێ ئێسـتا رووی ئـەوەی پێـوە مـاوە شـەرواڵ لـە پـێ کـات ، جـاری وایـە ماڵـەوە یـەك مانـگ قسـەت لەگـەڵ ناکـەن چونکـە تـۆ یـەك رۆژ شـەرواڵ لـە پـێ کردبـوو ، یـان ئـەو ریشـەی ئێسـتا کـە مـرۆڤ ئەترسـێنێ یەکسـەر وێنـەی تیرۆرسـت و تـرس و تۆقـان و تەقینـەوەو سـەربرین و کوشـتنت ئـەداتێ ، ئـەرێ شـەرواڵی چـی و ریشـی چـی ؟ ئـاخر نیشـتیمان پەیوەنـدی چـی یـە بـە شـەرواڵ و ریشـەوە ؟ ئـەم نیشـتیمانەی ئێمـە تـازە سـواخ دراوە بـە خیانـەت و نەهـەماتی و لـەبیر کـردن . بیـری شـتێکی تـری شـەرواڵم کەوتـەوە ، شـانۆگەری شـەرواڵ ، ئەمـە ئـەو شـانۆگەری یـە بـوو کـە لەگـەڵ هاورێکـانم لـە گـردی شـەهیدان لـە سـەر کێڵـی گۆڕەکـان نمایشـمان ئـەکرد ، نـازانم نمایشـەکە بـۆ خۆمـان بـوو یـان بـۆ مردووەکـان یـان

بــۆ ئێســتای نیشــتیمان بــوو بــۆ ئــەم وێرانەیــەی کــە ئەویشــمان تێخســتووە ، ئــەم بیرکردنەوانــەم هێنــدەی تــر هێلینیــی غــەمگین کــرد و ئــەو نــەی ئــەزانی مــن لــە کوچەیــەکا گــوزەر ئەکــەم پــرە لــە خـــەیاڵ و بیرکردنـــەوە ی رابـــردووە وونـــەکان و داهـــاتوو ە تاڵــەکان ئــەو نــەی ئــەزانی مــن ئەمێسـتا لــە رێبــواریکی کــوێر ئــەچم لەگــەڵ ئەوەشــدا پێویســت بــوو دەســتی بگــرم بــۆ لای خــۆم بــانگی بکــەم ، بۆیــە دەســتەکانیم گرتــە دەســتیم نزیــك کــردەوە لــە لێوەکــانم و بــە لێــوم ســەر روی دەســتیم بــە هێمنــی مــاچ کــرد و پــێم ووت : هێلــین گیــان لــەنێوان مــن و تــۆدا ژیــان هەیــە ... چەنــدێك دوربــین لــە یــەکتریش ...چەنــدێك یــەك بگــرێنین و چەنــدێك ئــازاری یــەك بــدەین .. مــن هەمیشــە ئەوزەویــەم کــە تــۆ گــوزەر ئەکــەی بــە ســەریا تــۆش ئــەو ئاســمانەی هەمیشــە لــە ســەر ســەرمی . بەراســتی مــن زەویــم و تــۆش ئاســمانی .. بۆیــە هــەتا هــەوری بــارانی عەشقت دا نەکات گوڵی سووری من سەر دەر ناکات لە خاك.

لەبــەر ئــەوەی بابەتــەکان و قســەکان وا تێکــەڵ بووبــوون ئــەمجارە کــەمێ زیــاتر بێتاقــەت بــوو بــەرەو ئــەوە دەرۆیشــت لــە دەرگــای تــورەی یــەکانی نــاوەوەی خــۆی بــدات ووتــی : کــاردۆ وا بکــەی ئەرۆم بەسە تکایە با نەرۆم تکایە بەسە بەس !

هەستم کـرد ئیتـر تـەواو خەریکـە بیـزار ئـەبێت بۆیـە ویسـتم سـەر لـەویش تێـك نـەدەم وام پـێ بـاش بـوو کـە لـەم سـاتەدا ئـەو بـروات بۆیــە پــێم ووت : هێلــین گیــان ئەگــەر ئێســتا ئەتــەوێ برۆیــت ئـەوا بـرۆ ئاسـایی یـە تەنانـەت ئەگـەر ویستیشـت ماڵئـاوای بکـەیت و بـە زیـزی بـرۆی ئـەوا بـرۆو بـەڵام لەگـەڵ هـەنگاوەکانت هـیچ مەڵی هیچ ووشەیەك مەدرکێنە .

راسـتی ئـەو نـەی ئەویسـت بـروات و بێـزاری یەکەشـی بـەرەو مانـدوو بـوونی ئـەبرد بـە مـۆنی سـەیری کـردم و پێـی ووتـم : نـا کــاردۆ گیــان دڵنیــا بــە کــە رۆیشــتم هــیچ نــاڵێم چونکــە دوای رۆیشتن ووشە سوودی نی یە.

قســەکانی هێنــدە راســت بــوون نــەم ئــەزانی چــی بڵــێم ســەیری چاوەکـانیم کـردوو ووتـم :راسـت ئەکـەیت لـە دوای شـکاندنی دڵ ووشـە قـەدری نـامێنێ بـەڵام بـاش بزانـە هێلـین گیـان مـن دڵنیـام هـەر کاتێـك ویسـت خـۆت ببینـی ئـەوا لـەو کاتانـەدا ئاسـان ئاسـان دێیتــەوە لام و خــۆت ئەدۆزیتــەوە ، چونکــە تــۆ لــەناو هێلانــە بچکۆلەکانی رۆحی مندای هەتا مردن لەوێ لانەت کردووە .

ئـەو کـات بـە ئاسـانی و هـێمن هـێمن هـەنگاو بنـێ و وەرەوە لام لـە سـەر چڵـە تووەکـانی جەسـتەم بنیشـەوە و خـۆت بـدۆزەرەوە لـە ناخما .......

هێلـین گیـان مـن تـۆم خـۆش ئـەوێت بـەس پـێ ئـەچێت خـۆمم خـۆش نـەوێ خـۆم ، پـێ ئـەچێت نەگبـەتیم لەگـەڵ خۆمـدا هـەبێ مـن نەهامـەتیم هەیـە لەگـەڵ خۆمـدا بـروا بکـە ،ئەمـە کـاری ئێسـتام نـی یـە بـە تـەنها مـن هەمیشـە لەگـەڵ خۆمـدا لـە جـەنگ و شـەردا بـووم هێنـدە یـەکمان برینـدار کـردووە چـە نێکـیش ئاشـت ببینـەوە هێشـتا برینـەکانم قەتماغـەی ئـەمێنێ تـا تـەواو رێـك نەکـەوین و دەسـت کەینـەوە ملـی یـەکتری ، مـن و خـۆم لـە سـەرەتای بوونمـەوە رێـك نەبووین پێکەوە هەمیشە لە کێشمە کێش و جەنگدا بووین .!

بـا بزانـی مـن هـەموو ڕۆژێ جیـا لـە ڕابـردوو هـەنگاو دەنـێم بـە پۆشـاکێکی پولەکـە ئاسـا پێکـانم جیـا لــە جـاران هــەڵم دەگــرن ڕێگاکــەم شــەپۆلی دەریایــە کــی ڕەنگینــە هــەموو ڕۆژێ جیــا لــەدوییێنێ بیــرت دەکــەم وەك ئەســتێرەیەك لەهــەر ســەیرکردنێکدا بریســــکەییەك دێتـــە بـــەر گلێنـــەکانم هـــەموو ڕۆژێ جییـــا لەوســاپێکەنین هـــەموو جەســـتەم دادەپۆشـــێ تـــۆش وەك تـــەڕی لەســەر لێوەکـانم دەنیشـی هـەموو ڕۆژێ جیالەهـەموو سـاتێ لـەناو

خــــەونێکتا گــــوزەر دەکـــــەم وزۆر ئاســـــان وون دەبـــم وزۆر ئاســـــان دەتدۆزمەوە جیا لەهەموو جارێ لەناو هەناسەیەکتا ئەتوێمەوە !

لـــــەوە ئـــــەچوو ئیتـــر هەســـتی هێلیـــنم ئـــازار دابـــێ و ئیتـــر ووردە ووردە ئەکەوتە گریان .

بــەدەم گریانــەوە ئــەیوت ئەمــە تــۆ چیتــە ؟ مــن ئــەزانم تــۆ خــۆتم لــێ گێـل ئەکـەی ، منـیش نەمئـەزانی چـی بکـەم نـەم ئـەزانی چـی بڵـێم ؟.

ئــەویش هــەر ئــەگریا و ئــەیووت : کــاردۆ بــۆ راســتیم پــێ ناڵێــت مـن لـە تـۆ تیناگـەم بـەخوا ئـاخر تـۆ ئەتـەوێ بگـەی بـەچی ؟. لـەم تــۆرە ئـــاڵۆزەی مێشــکی تــۆدا چـــی هەیـــە پـــێم بڵـــی هەســـتەکەم ئەتـەوێت منـیش وون بکـەی یـان خـۆت وونکـردووە یـان شـتەکانت ئـــاڵۆز و تێکـــەڵ کـــردووە منیشـــت لەناویانـــدا بـــۆ نادۆزرێتـــەوە ؟ تکایە تێم بگەیەنە .

پـــێ ئـــەچوو کــە تــەری فرمێســکەکانی هێلــین هاریــان کــردبێتم و رەگــی شــێتیم گرتبــێ بۆیــە منــیش خــۆم تــورە کــرد و ووتــم : مــن ئەمــەوێ مــن تــۆ بگــەین بــە بــە یــەك هــەنگاوو ، لەســەر یــەك رێگـا و هـەمان مەبەسـت ، ئەمـەوێ لـە یـەك ماڵـدا بـین ئەمـەوێ

یـەك سـەرینمان هـەبێ بەشـەو بـە رۆژ پێکـەوە هەناسـە بـەین ، بـەڵام ئەترسـم ، لـە دوای ئـەوە ئەترسـم ، لـە کارەسـاتەکانی دوای گەیشـتنمان بـە یـەك ئەترسـم ، تـۆ نـازانی دوو عاشـق کاتێـك پێـك ئەگـەن چـی ئەقـەومێ لـە گەردونـدا تـۆ نـازانی دوای ئـەوە چ ئافاتێك هەڵدەکات و چ جەنگێك دروست ئەبێت ؟

سـەیری لـێ ئـەهات بـە سەرسـورمانێکی زیـاترەوە و بـە گریانـەوە ئـەیووت : لـە چـی دوای ئـەوە ئەترسـی ؟ ئافـاتی چـی و جـەنگی چـی ، مـن هـیچ تێناگـەم لـە تـۆ ، هەسـت بـە ورێنـەت ئەکـەم یـان بـە وون بوونـت تکایـە مەمخـەرەوە نـاو گومانـەوە لـە نـاو خۆمـدا مـن لاوازم بەرگەی گومانەکان ناگرم .

کـاردۆ: ئەترسـم پـاش ئـەوەی گەیشـتینن بـە یـەك داوای منـاڵ بکـەی ناچـار ئـەبێ منـاڵێ بخەینـەوە ئـاخر مـن لەمـە ئەترسـم لەمـە بـۆ تێناگـەی ( نـازانم ئەمـە پەیوەنـدی چـی بـوو بـە قسـەکانمانەوە بـەڵام هـەر ئـەوە بـوو کـە ئـەو راسـتی ئـەکرد مـن لـە دۆخـی ورێنـە و سـەر لێشـیواویدا بـووم ئـەو کاتـە دەنـا مـن هـەر بیریشـم لـەو بابەتـە نەکردبووە ).

هێلـین : جـا ئـەوە ترسـی بـۆ چـی یـە ؟ منـداڵ فریشـتەی ژیانـە . بێگومـان ئێمـەش هـەر منـداڵمان ئـەبێت ئـەوە بابـەتێك نـی یـە ئێسـتا باسی بکەین جارێکە .

کـاردۆ : نـا مـن نامـەوێ منـاڵم هـەبێ ئەترسـم لـە پرسـیارەکانی لـە گلـــەیی یـــەکانی لـــە پـــەروەردەکردنی لـــە گـــەورەکردنی لـــەم مەملەکەتە کاولەدا لەم جیهانە پر نهێنی یەدا.

هێلین : لە پرسیاری چی ؟

کـــاردۆ: ئـــاخر مـــن خـــەمی ئـــەو ڕۆژەمـــە کـــە مناڵەکـــەم فـــامی کـردەوە ئیتـر لـێم ئەپرسـیت .. بابـە دونیـا بـۆ وایـە ؟ بـۆ وەک حیکایەتـەکان پاڵەوانـەکانی جـوان نـین و بـۆ هـەموو خۆیـان بـە پاڵـەوان ئـەزانن ؟ بـۆ پاڵـە وانێـك نـی یـە بێـت بـە هانامانـەوە کاتێـك ئـەم گورگانـە ئەیانـەوێت لـەت لـەتمان کـەن ؟ بابـە چ حیکمـەتێک لەوەدایـە بـە حیکایـەتی پـڕ درۆ سـەدان شـەو ئێمـەتان ئەخـەوان ؟ چ حیکمـەتێك بـوو ئێمـەتان وابەسـتەی هـەزارەها خـەون کـرد کـە نـەك هـەر نایەتـە دی بـەڵکو ئێسـتا کـاڵ کـاڵیش بوونەتـەوەو بگـرە خەوەکانیشـمان نـەماوە ... ئـاخر بابـە کـوا فریشـتە لەگـەڵ بارانـدا ئـەبارێت ؟ کـوا شـەیتان نانمـان لەگـەڵ ئـەخوات ؟ ئـەی بـۆ پێتـان

ئـەوتین ئەگــەر درۆ بکــەن خــوا کوێرتــان ئــەکا ئــەی بـۆ ئــەم دێـوە دزانــەی ئێـرە وایـان لـێ نایـە ؟ کـە خـوا دڵـی لـە جنێـو ئەشـکێت ئـەم هـــەموو ڕۆژنامانـــە بـــۆ ناســـوتێنێت ؟ کـــە درۆی پێناخۆشـــە ئـــەو هـــەموو تەلەفیزیۆنانـــە بـــۆ هـــەن؟ بابـــە دارا نیـــو ســـەدەیە دو دار ئـەبینیت و بـۆ ناپرسـێت ئـەی کـوان باڵنـدەکان ؟ بـۆ ناپرسـێت لـەم وڵاتــەی ئێمــەدا بـۆ پەپولــە وا زوو ئــەمرێ ؟ ... مـن تێناگــەم بابــە کـــە ســـێو میـــوەی شـــەیتان بیـــت و ئێمـــەی لـــە بەهەشـــت پـــێ دەرکـــرابین بـــۆ دکتۆرەکـــان ئـــەڵین بەســـودە و عەرەبانچیـــەکان هـاواری بـۆ ئەکـەن ؟ بـۆ لـە مەکتـەب وانـەی سـێومان پـێ ئـەوترێ ؟ بەو بەهەشتەیا بیرم کەوتەوە بابە نیشتیمان کوا بەهەشتە ؟

هێلینش بـە دەم گریانـەوە ئـەیوت :ئەسـڵەن مـن منـاڵم نـاوێ تـا یـەك زەرە لـە خۆشەویسـتی تـۆ بـەرێ ، مـن تـۆم ئـەوێ تـۆ، بـەس دیـارە هیچ ناوێ تەنانەت منیش ناوێت .

ئـەمجارە گریانەکـەی زیـاتر بـوو هـاواری ئـەکرد تـۆ منـیش نـاوێ نـا نـا نـا ، دەنـا بۆ وا ئەکـەی بۆ ؟ مـن لـە هیچـی تـۆ تێناگـەم لـە هـیچ هیچ ؟ .

بە هێمنی باوەشم پیاکرد و بە گوێیدا چرپانم و پێم ووت :

هەناسەکەم باشە ئەی تۆقەت ناپرسی ؟؟؟

هێلینیش بە هەنسکی گریانەوە  ووتی چی ناپرسم ؟

ووتم تۆ ناپرسی ؟

کـاتی بـەناو خەونـە خۆشـەکانتا گـوزەر دەکـەی ، لـە نزیـک گـوێ یـەکانت کـێ یـە حیکایەتـە کۆنـەکانی نـەنکیت بـۆ بـاس دەکـا باسـی بووکە بە بارانی و پیاسەی سنەوبەرت بۆ دەکا.

ئـەی تـۆ قـەت پرسـیار نـەکردووە بـۆ لـە سـەر هـەموو رێگاکـان هەمیشە گوڵ کەوتوە ؟

قـــەت زانیوتـــە بـــۆ منـــاڵان بـــە رووتـــا پێدەکـــەنن و گـــۆرانی بەکۆمەڵت بۆ ئەڵێن ؟

بـۆچی ناپرسـی ئـەو گەڵایانـە کـە وا بـەهێمنی بەسـەرتا دەوەرێـن ، بۆ ئاوا لە دەورت سەما ئەکەن ؟

ئــاخر قــەت  هێلــین گیــان بیــرت نەکردۆتــەوە بــۆ گــوڵی ســەر پەنجەرەکـەت  ووشـك ناکـا ؟ لەگـەڵ ئـەوەی کـە تـۆ قـەت ئاویشـی نادەی ؟

ئـەبێ کـەی بـێ بپرسـی بـۆ هەمیشـە کـە بـەفر دەبـارێ جـێ پێکـانی تۆ تواوەیە ؟ ئەی بۆ لەدوای تۆشەوە بەفر گڵولە ناکا ؟

ناپرسـی بـۆ تێپـەرینی هـەزاران شـەوی تاریـک و بـێ ڕەحـم کـێ یـە لـە نیـو پەنجـەکانی خۆتـا تەنیایـە لـە نێـۆ پیخەفەکـەتا لـە دەنگـی تۆ زیاتر شتێکی دیکە نابیتسێ ؟

ئـەی کاتێـك چەنـد جـار لـە پەنجـەرەوە لـە دەرەوە دەروانـی و کـێ دەبینی ؟

ئـەی ناپرسـی کـاتێ پرچەکـەت دەکەیتـەوە تەوقـەکان چـی یـان لـێ دێ ناپرسی بۆ یەك تاڵ لە قژ ناوەرێ ؟

ئـــەی ئـــەو شـــەوانەی مانـــگ دیـــار نـــامێنێ ناپرســـی کوچـــەکانی خەیاڵی تۆ چی رووناکی دەکاتەوە ؟

سەیرە ناپرسی ! وەختێ پیاسە دەکەی ، بۆ هەتاو بەرناکەوێ ؟

ئەی ئەم چەترە چۆن ئاوا لەگەڵتا ئەفرێت وگوزەر دەکا ؟

ئـەی تـۆ لەمانـە تـێ ناگـەی خاتونەکـەم تێناگـەی لـەم خەونـە پـر میهرانــە ؟ هێلیـنش بــە دەم گریانــەوە ووتــی لــە چــی مـن لــە هـیچ

تـێ ناگـەم لـە هـیچ ئەوەنـدە ئـەزانم مـن تـەواو ئیتـر تـەواو ئەگـەر وا بکەی هەر نامەوێ بژیم .

ویسـتم ژیـری کەمـەوە بـەس نـەم ئـەزانی چـی بکـەم بۆیـە هەوڵمـدا بابەتەکــە بگــۆرم و شــتەکانی بیــر بەرمــەوە خۆشــم هەســتم کــرد هــەموو بابەتــەکانم تێــك شــێواندووە و خۆشــم نــازانم چــی دەڵــێم هەســتم ئــەکرد مانــدووم بۆیــە پــێم ووت ســێو نــاخۆی بــۆت بێــنم هێلین گیان ؟

وەڵامێکــی دامــەوەو ووتــی : ئــەی تــۆش ئــەیخۆی لەگــەڵما (بــەدەم هەنسەکەوە) .

منـیش خــەریبو لەگــەڵ ئـەو دڵـم پـر ئـەبوو بـەڵام پێشـم ووت : مـن سێو بخـۆم ؟ نـا مـن سێو نـاخۆم ، نـا نـا قـەت قـەت نـای خـۆم مـن !.

لــەتاو گریــان و حەســرەتەکانی دڵــی لــە تــاو بــێ هێــز بــوونی لــە خەمـدا نــەی ئـەزانی چـی بڵـێ روی تێکردمـەوەو ووتـی : ئـەی بـۆ نـاخۆی لەگـەڵما بـۆ ؟ ئـەی مـن سێوم بـۆ چـی یـە بـێ تـۆ بـۆ ئەتـەوێ سێوەکەش لەگەڵما نەخۆی ؟.

کاردۆ : ئاخر من حەزم لە سێو نی یە .

هێلین : بۆ حەز لێ نی یە ؟

کاردۆ : سێو ئای لە سێو ، خۆزگە بمتوانیبا لەو دنیاش دوای مردنم سێوێکی ترم ئەدا بە حەوا تا خودا ببینێ ئێمە چ ملۆزمێکین هێلین گیان ..تا ببینێ و بزانێ ئادەم سێوی پێ ناخورێ .. .

ئاخر بۆ بە تەنها سێوێ مردن و ژیان لێك جیا کاتەوە ئەی هەنار و قەیسی و ترێ و ئەوانی تر چۆن هەست بە تەنهایی و بێ قیمەتی ناکەن سەیری بۆ سێوێ رۆژانە چیمان لێ دێ نەهامەتیەکانمان و جەنگ و ترسەکانمان هەمووی هەر بۆنی سێوی لێ دێ ..

سێوێك کە بە دوو قەپاڵ ئەخورێ ..

سێوێك کە لە بازارەکان هەراج ئەکرێ ..

هەر ئەو سێوە ئێمەی کردە بەرچنەی خەم و پێکەنین و گریان و ژیان .. هەر ئەو سێوە هەرزانەش ژیانمان لێ ئەکرێ .

سـەد خۆزگـە سـێو هـەر نەبوایـە .. مـن رقـم لـە سـێوە قـەت بـۆم ناخورێ بۆیە نایخۆم لەگەڵتا .

هێلــین : ( بــە تــورەی یــەکی زۆرەوە بیــزاری دەر ئــەبری ) وای لــە تــۆ بــۆ وا ئەکــەی بــۆ ؟ مــن تێناگــەم مــن ئــەرۆم تــەواو تەحەمولم نەما دڵم خەریکە دەردێ بەسە بەس ئەرۆم ..

زیــاتر تــورە بــوو هــەر ئــەگریا ئــەیوت ئــەرۆم مــن ویســتم شــتەکە چاك بکەم بەڵام وا بزانم ئەمەندەی تر تێکم دا .

چەنــدێکم کــرد نــەمتوانی پــێ ی بلــێم مــەرۆ بــەڵام توشــی ورێنەیــەکی سـەیر بـووم لـە خەفـەتا کـە ئـاوا ئـەمبینی مـن ئـازاری ئـەدەم دووبـارە ویسـتم بابەتکـە بگۆرمـەوە شـتەکانی بیـر بەرمـەوە هێمنــی بکەمــەوە بۆیــە ووتــم ..هێلــین ئــەزانی کــە مــن چــاوم بــەم قیامەتــە هــەڵهێنا .. قســەیەکم لــێ وەرنــەگیراوە بــە بــەلێ یــان نــەخێر..ئــەزانی هێلــین لــە م نیشــتیمانە ئــازادەدا بــێ ئــەوەی بــزانین هــەمووومان زینــدانین .. بــە دەم قســەکانمەوە بیــرم لــەوە دەکــردەوە کــە وا باشــترە مــرۆڤ بچێــتە جێگایــەکی دوور دوور و هــەموو شــتێك و هــەموو کەسـێکیش ئیهمــال بکــەیت ، ئیــدی نــە لەکــەس دەڕەنجیی و نە عاشقی کەسیش دەبیت .

هێلـــین : زینـــدانی چـــین کـــاردۆ گیـــان کـــوا زینـــدانین ؟ ئـــەوەتا پێکـــەوەین دوو خۆشـــبەختیرن مرۆڤـــی دنیـــاین ئەگـــەر تـــۆ وا نەکـــەی کـــاردۆ گیـــان ، تکایـــە ڕێـــگە مەدە بە خەمۆکیەکانـــت بتکـــات بەو کەســـەی کە تۆنیـــت ، تـــۆ مرۆڤێگـــی پـــر میهـــری تکایـــە خـــۆت و منـــیش ئـــازار مـــەدە ، ریگـــە مـــەدە تارمـــایی یـــەکانی ناخـــت رێگاکان لێ وون کەن تکایە .

کـاردۆ: بـەڵێ ئـەی ئـەو هـەموو دەرگـاو پەنجەرانـە نـابینی ؟!... مـن کـوا پـر میهـر مـن مـرۆڤم بـۆ تـۆ نـازانی مـرۆڤ چ بەڵایـەك لەسـەر ئـەم زەوی یـە ،ئـەزانی هۆنیـا مـن تەنانـەت لـە شـتەکانی تۆش تێناگەم تۆ بۆ هاتی ئەمرۆ ؟

هێلـین : ئـەی ئـەمرۆ رۆژی لـە دایـك بـوونی تـۆ نـی یـە ؟ هـاتم تـا سوپاســی خــودا بکــەم کــە تــۆی هێناوەتــە ئــەم ژینــە تــا ئــەم رۆژە لەگەڵ تۆ پیرۆز کەم تا ئەمرۆ لەگەڵ تۆ هەناسە بدەم .

کـاردۆ : ئـەی کـە هـاتی بـۆ ئێـرە بـۆ پـێم ئـەڵێیت رۆژی لـە دایـك بوونـت پیـرۆز بێـت ئـاخر نـازانی مـن بەمـە دڵـم دێشـێ بابـە گیـان ئـاخر مـن بـە شـەو لـە دایـك بـووم بـە شـەو تێناگـەی ، بـۆ تـۆ تـا ئێستا نازانی جیاواری زۆرە لە نێوان رۆژ و شەو .

هێنـدەی تـر هێلـین تـورە بـوو ووتـی شـەوی چـی و رۆژی چـی تەواو من ئەرۆم .

خۆشـم نـازانم بـۆ وام لێهـاتووە ئـەمرۆ ، ئـاخر ئێمـە وایـن هەمیشـە لـە گرنگـی زۆرەوە شـتەکان ئەشـێوێنین نـەك چاکیـان بکـەین ئـەوە نـازانین کـە سروشـت خـۆی رێسـای خـۆی هەیـە و ئـەبێ بـە رێسـاو یاسـایانەی ئـەو گـوزەر بکـەین دەنـا خۆشـمان ئەشـێوێنین ئـەوەتا مـن لـە بـری ئـەوەی دڵـی هێلـین ژێـر کەمـەوە سـات دوای سـات زیـاتر ئـازاری ئـەدەم و خۆشـم زیـاتر رقـم لـە خـۆم ئـەمگرێ و شـتەکانم لـێ تێـك ئـەچێ بومەتـە هـۆی بێـزار کـردن و دڵگرانکردنـی هێلیـنش بەراسـتی قورسـە بزانـی دەتەوێ بزانـی دەبـێ چ بـکەی ئـەوەتا ئـەویش گەیشـتە تینـی و تـەواو تەحـەمولی نـەما و ووتـی : ئەمەوی برۆم تەواو .

راسـتی منـیش ئەمویسـت بـروات وا باشـتر بـوو تـا کـەمێك هـێمن ببینـەوە ئـەو لـە گریانـەکانی منـیش لـە ئازارەکـانم لـە هـەمان کاتـدا ئـە شمویسـت نـەروات بـەو گریـان و حوزنـە زۆرەوە دەنـا دڵـی خـۆم لـە ناخـەوە دەردێ بۆیـە ویسـتم بابەتەکـەی لـە بیـر بەرمـەوە پێم ووت :

هێلـین گیـان تـۆ وا ئـەزانی زەریاکـان تـەنها ئـاون زەویـەکان تـەنها خـاکن ؟ . وا ئـەزانی گریـان تـەنها فرمێسـکە سـەیرکە بـا باسـی خۆشەویسـتی و باسـی رەحـم و بـەزەیت بـۆ بکـەم ..چیـت پـێ بڵـیم ؟ بڵـێم کـە ژیـان هێنـدە بـێ مانایـە درۆکـانی خۆشـترە لـە ڕاسـتیەکانی . هێلـین تـۆ ئـەزانی گریـان ئەوەیـە کـە نـازانی چـی بڵێیـت و ئـەو کاتـە ووشـە تاقـەتی نامێنێـت قسـە بکـات ، هێلـین گیـان کێشـەی مـن ئەوەیـە مـن سـەیرم لـەم خـەڵك و وڵاتـە دێ ، ئـەزانی لای ئێمـە راسـتتر وایـە هـەموومان بـۆ نیشـتیمان بگـرین و بـە نەتەوەکەشـی پـێ بکـەنین ، مـن ئێسـتا تێگەیشـتم لـەم نیشـتیمانەی ئێمـەدا جیـاوازی نـەماوە لـە نێـوان ئێمـەو ئاژەڵـدا ئـاخر جیـاوازی نیـوان ئێمـەو ئـاژەل تـەنها عـەقل نـی یـە بـەڵكو ویژدانـە ویـژدان ...تەنانـەت نـەك لـە ژیـان بـەڵكو بگـرە لـە مـردنیش هـیچ تـێ ناگـەین ئێمـە . ئـاخر چـۆن لـە مـردن تێبگـەین خـۆ ئێمـە کەسـێ ناناسـین لـە گۆرسـتانەوە هـاتبێ بۆیـە ئـەبێ برِوامـان بـە رۆمانـەکانی ئـەوێ نـەبێ کـە لـە وەهمـەوە دەیگێرنـەوە ، کەسـێ نەهاتۆتـەوە تـا بۆمـان بـاس بکـات لـەوێ چ باسـێکە چ گوزەرێکـە ..

سـەیرکە هێلـین بـا بـە ووردی بـۆت شـی بکەمـەوە تـا تێبگـەیت لـەمن ، رۆحەکـەم عەشـق تاوانـە تاوانیکـە بەرامبـەر مـرۆڤ ئـەکرێ ، ئـەزانی بـۆ ؟ مـن پێـت ئـەڵێم بـۆ ؟ چونکـە لێـرە عەشـق بەشـەرەوە ئـەکرێ منـیش زۆرانبـازی مەیـدانی عاشـقان نـیم ، دەی ئـاخر مـن شـەرم پێناکرێـت مـن چـۆن بتـوانم ئـەم هەمووشـەرە بکـەم ؟ کـە مـن دڵـی چۆلەکەیـەکم بـۆ ناشـکێ نامـەوێ بـۆ چرکەیـەکیش بـێ پشـیلەیەك ئـازار بچێـژێ نامـەوێ هـیچ منـاڵێ برسـی بـێ ئیتـر پێم ناڵێ ی لاوازێکی وەك من چۆن شەری پێ ئەکرێ .

ئەگـەر بێـزار بـووی لـە قسـەکانم هێلـین گیـان بـا قاوەیـەکت بـۆ دروست بکەم ؟

ئەگـەر وەك جـارانیش تـاڵ دەرچـوو کێشـە نیـە چەنـد تـاڵ بێـت چاوەکانی خۆت لە لایە بە قاوە تاڵەکانی منەوە بیخۆرەوە .

هێلین : قاوەی چی ؟ من رقم لە قاوەیە نایخۆم .

منـیش لام سـەیر بـوو ووتـم ئـەی بـۆ دایـم ئـەتووت قاوەیـەك دروسـت بکـە بـا پێکـەوە بیخۆینـەوە ؟ بـە هەنسـکەوە وەڵامـی دامەوەو ووتی .

هێلـین :چونکـه ئەمویسـت ئـەو شـیرینی یـە زۆرەی تـۆ بـە قـاوه کەم کەم بکەمەوە لە دڵما .

هەسـتم کـرد باشـتر بـووو لـە بیـری چـووەوە کـە ئـەیوت ئـەڕۆم ، دیـار بـووی ئەیویسـت مـن بهێنیتـەوە دنیایـەکی جـوانتر و پـاکتر بۆیـە پـێ ی ووتـم کـاردۆ باسـی منـداڵیتم بـۆ بکـە ئەمـەوێ بـزانم تـۆ چۆن بووی کە مناڵ بووی ؟

منـیش لەوێـدا قسـەی دکتۆرەکـەم بیـر کەوتـەوە کـە پـێ ووتـم مێشـکی مـرۆڤ وەك جەسـتەی وایـە ئەگـەر توشـی خـەم و ئەشـکەنجەی زۆر بێـت خـۆی شـتەکان ئەسـڕێتەوە تـا لـەوە زیـاتر ئـازاری نـەدات ، ئەمـە پـێ ئـەڵێن سیسـتمی بـەرگری بـەڵام نـازانم ئێستا ئەمـەی چـۆن تـێ بگەیـەنم ، ئـاخر ئێسـتا ئەمـەی پـێ بڵـێم لـێم شـێت ئەبێتـەوە و فرمێسـکەکانی سـەر لـە نـوێ ئەمسـڕنەوە و ئـەمکوژن پـرم ئەکـەن لـە ئـازار باشـتر وایـە کـەمێکی لـە یادەوەری یەکانم بۆ باس بکەم تا ئەویش و خۆشم هێمن ببینەوە.

بۆیـە بـە گوزەرێـك بـە نـاو یادگـاری یـە بیرماوەکانمـا پـێم ووت : مـن منـاڵێکی چـەتوون بـووم زۆر کـە دەرگاکـەم لـێ دا ئـەخرا بـە سـەر دێوارەکـەدا ئەهاتمـە دەرەوە ، هەمیشـە بـە منـاڵی دەسـتەکانم

وەك نەخشـــەی جیهـــان بـــوو هێنـــدەی داخ پێـــوە بـــوو . ڕۆژێـــك پـــارەی ڕۆژانـــەم هـــەبوو دەیـــەها ڕۆژ تـــەنها فلسـێکم پـــێ نـــەبوو ، شـــەندەها ڕۆژم بـردە سـەر بـە ئـاواتی کرینـی لەفەیـەکی قاورمـە و ئاوتەکەم نەهاتە دی .

هێلین : ئەی بۆ عاقڵ نەبووی ؟

کـاردۆ : چونکـە منـاڵ بـووم لاسـار بـووم ، ئـێ سروسـتی منـاڵ لاسـاری و عـەجولی یـە بـە تایبـەتی لـە منـدا ؟ مـن زۆر جـار لام سـەیرە کـە گـەورەکان بـە منـاڵان دەڵـێن دانیشـن یـاری مەکـەن مـەجوڵێن زۆر ڕا مـەکن هـاری مەکـەن ئـەی منـاڵ ئەمانـە نـەکات چـی بکـات ئـەی منـاڵ لـە غـەیری ئـەم شـتە منالّیانـە چـی دی هەیـە تا بیکات .

هێلـین : وەك ئـەو شـتانەی ئـەمرۆ ئـەتووت ، باشـە ئـەی کەسـێ نـەبوو بڵـێ بـۆ وا ئەکـەی ؟ کەسـێ نـەبوو ڕێگـە ڕاسـتەکانت نیشـان بـدات؟ بـە خـوا دڵنیـام تـۆ بـە منـاڵیش هـەموویان شـێت کردووە وەك وەك چۆن منیش تێك داوە .

کـاردۆ : بـا هـەبوو ، بـەڵام بـە شـەقەوە پێیـان ئـەوتم ، ئـەزانی ئەمەنـدەیان شـەق لـێ ئـەدام خـەیاڵم لای مێشـکم نـەبوو ئەونـدەی

خــەیاڵم لای ئازارەکــانی قــنم بــوو . کــەمێ پێکــەنی ئەمــە تــۆ چــی بــووی هــا بەراســتی دیــارە عــەجول بوویــت زۆر ؟ منــیش پێکــەنیم ووتــم : پێیــان ئــەوتم تــۆ هــەژدیهای هــەژدیها ، ئێســتاش نــازانم ئــەبێ هــەژدیهای نەگبــەت کــێ بــێ وا منیــان بــەو ئەشــوبهان . . بــاوەر ناکــەم هــەژدیها ئــەو کــات هێنــدەی مــن هــار بــووبێ ، بــەس بــاوکم دایــم دڵــی بــەوە خــۆش بــوو کــە هــاورێ ی چــەتوون و چەقاوەســوو م نــەبوو ئــەو فــەقیرە نــەی ئــەزانی خــۆم ســەرکردەی چەتوون و چەقاوەسووەکانم .

هێلـین :کـاردۆ گیـان مـن ئێستا ئـەبێ بـرۆم بـا توشـی کێشـە نـەبین ، لــەوە زیــاتر پێکــەوە بــین بــاش نــی یــە ، ئیتــر کــاتی ئەوەیــە بگەرێمەوە ماڵەوە .

هەســتم کــرد کــەمێ ئــارام بۆتــەوە پــێم ووت باشــە بــەدڵی خــۆت ، وویســتم دوا ووشــە کــە ئــەمرۆ پێــی بڵــێم لــە دوای ئــەو هــەموو ئــازار و گریانــەی پــێم بەخشــی ووشــەیەك بێــت هــەموو خەمــەکانی ئــەمرۆی بســرێتەوە بۆیــە پــێم ووت ئــەزانی هێلــین مــن کەســم نەدیوە وەك تۆ ؟

هێلین : بۆ من چیمە ؟

کاردۆ : تۆ .... تۆ  لە گریان و لە پێکەنینیشدا هەر جوانیت  .

یـــەکترمان وا جێهێشـــت ئـــەتوت هـــەموو ئـــەو منداڵانـــەی لـــە جەنگـــەکان ســـوتا بـــوون ئێمـــە ســـوتانبوومان ئـــەتووت دوو تاونبـــاری راکـــردووین  ئـــەتووت دوو ســـیخوری وونـــین، ئەمـــە چـی یـە دوو بـەد بـەخت کـە یـەکیان خـۆش ئـەوێت بـۆ کاتژمێرَیـك یـەکیان بینـی و تێـر یـەکیان ئـازار دا کـەچی بەمـە دەڵـێن گونـاحی گـەورە نـازانم گوناحەکـە ئەوەیـە کـە مـن ئـەو پێکـەوەین یـان ئـەوەی یەکترمان ئازاردا رۆژێکمان بە گریان پێکەوە بردە سەر  .

ئـەو رۆیشـت ، کـە سـەیری جـێ پێکـانیم دەکـرد بیـری  جێپیکـانی منـاڵی خـۆمم کەوتـەوە کـە دایکـم ئـەیبینی لـە نـاو چیمەنەکـەداو ئـەیزانی چومەتـە دەرەوە لەسـەر دیوارەکـەوە لـە کـۆڵان یـاریم ئـەکرد  .. بیـرم کەوتـەوە کـە ئـەو کـات منـداڵیم هـەلوکێنی  ئەکـرد چـەنێك شـاد ئـەبووم  کـەچی ئێسـتا چەنـدە بـێ ئومێـد ئـەبم کاتێـك دەبیـنم منـداڵان لاسـایی گـەورەکان دەکەنـەوە و  هـەلوکیان نـەماوە هـەموویان فرێـداوە  و لـە جـێ ی هـەلوك و تـۆپ ئـەم ئـامێرە تـازە بەدفەرانـەیان پـێ یـە،  ئێسـتا لـەدەرەوەی ئـەم ژورەی خـۆم لـە کۆڵانـەکانی شـارادا  ژیـان قورسـە زۆر  .....زۆر  سـەختە وەك مـرۆڤ بـژی  حەسـرەتەکە لەوەدایـە لـە ژوریشـەوە حـەز بـە

مردنــی خـۆت ئەکـەی بـەڵام ئـەوە نـازانم ئـاخۆ ئـەم حـەزی مردنـە هـی ئەوەیـە کـە ئێسـتا تـەواو شـێت بـووم یـان تـەواو کامـل بـووم و خەریکـە ئیتـر خـۆم خـۆم ئەناسـم ، بـە خـوا هێلینـش ناحـەقی نـی یـە ئـەویش ئەمەنـدە گریـا چاوەکـانی گـۆمی خـوێنی دڵـی بـوون هێنـدە سـووربوونەوە ، ئـاخر مـن عەشـق لام بۆتـە سـەرابێك لـە نێـوان بـــوونی خۆمانـــداو حـــەزە نەگریســـەکانی دەرەوەدا ، ئیتـــر خـــۆ عەشـیقیش خـۆی لەدەسـت دانـــی عەقڵـە بـۆ هەمیشـەی بۆیـە سـاتە وەختـێ عاشـق دەبـین دڵنیـام کـە دەبینـە منـداڵێکی سـاوای بـێ عـەقڵ بەڵام هەر هێندەی ئەو منداڵەش لەناو عەشقکەدا پاکین .

ئیتـر کـە تـەنیا ئـەبم بیـر لەمـە دەکەمـەوە ، مـن حـەز دەکـەم کـێ بـم پێـدەچێت ئەو شــەوەی مـن خوڵقـابم دایکـم خەیـاڵی بە خۆڵمێشــەوە کردبـــێ بێـــزووی بە ســـووتوی جگـــەرەوە کردبـــێ ئـــەگینا ئـــەم پارچـە نـاخ خۆڵەمێشـەی وەك منـی نـا ئـەبوو سـەیرە لـەوە ئـەچێت ئەبێت هەمیشە رۆحە پاکەکان بە تەنهایی بمێننەوە .

ســـەیری جێپێکـــانیم کـــرد و ســـووك ســـووك دەرگاکـــەم داخســـت چـــاوەرێ نـــەبووم وەك جـــاران ئـــاوور بداتـــەوە زانـــیم ئـــەمرۆ ئـــاور ناداتـــەوە چونکـــە چاوەکـــانی مانـــدوو بـــوون هێنـــدە گریـــان مـــن

مانـــدووم كردبـــوون ، ئـــای لـــە بـــێ دەماغیـــەكانی مـــن زۆر جـــار ئەوانن خەریكە ئەمتۆپێنن .

كـــە هاتمـــە وە حەوشـــەكە بـــە بینینـــی دارگوێزەكـــەی نـــاو بـــاخی حەوشەكەمدا بیرم كەوتەوە !!

كـە منـاڵ بـووم لـە كـۆڵانی خۆمـان یـاریم دەكـرد وەختـێ – بـا - هــەڵی ئــەكرد گەڵایەكــی دارەگوێزەكــەی مــاڵێ بــاوكم ئــە كەوتە خـــوارەوە لە بەردەممـــدا لـــەویادا یاریەكـــەم ئەوەســـتاند چـــاوەڕێم دەكـــرد بەڵكـــو - بـــا -كە بگەڕێـــتەوە و گەڵاكە بگەڕێنێـــتەوە بـــۆ دارەكە.... .

هێشـتا نیـو كـاتژمێر نـەبوو هێلـین رۆیشـتبوو نـازانم چـۆن وا خێـرا گەیشـتەوە ماڵـەوە تەلـەفۆنی بـۆ كـردم لـەوە ئـەچوو پێكـانی بـە ر زەویەكە نەكەوتبێ .

هـەموو جـار ێ كـە ئـەهات بـۆ لام گەڵایـەكی لەگـەڵ خـۆی دەهێنـا ئــەیوت مــن نامــەوێ وەك خــەڵك خۆشــم بۆێیــت مــن ئەمــەوێ عاشـق بـم بۆیـە ئـەم گەڵایـەم بـۆ هێنـاوی چوونكـە ئـەم گـەڵا جوانـە گوڵاكـان دروسـت ئـەكات ، منـیش ئـەمكرد بـە پێكـەنین وئـەمووت بــەس نــی یــە رەگەكــەت بــۆ نــەهێناوم ، ئــەویش ئــەیوت ناشــرین

گاڵتـەم پـێ ئەکـەی شـەرت بـێ ئـەمجارە قەدەکـەی بـۆ ئـەهێنم بـە درکەکەیـەوە بـا پەنجـەکانت برینـدار بکـات منـیش پـێم دەوت دڵـت هێـت وام لـێ بکـەی ؟ ئـەیوت مەگـەر درکـەکان لـە دڵـی خـۆم بچەقێنم .

ئـای لەگـەڵ تـۆ چـیم لـێ دێـت هێلـین ، ئەمـە چەنـدەم جـارە زەنگـی تەلەفونەکـە لـێ ئـەدات ئێسـتا ئـەڵێت بـۆ هـەڵی ناگرێـت نـازانێ لـە نـاو خەیاڵـەکانی ئـەودا سـەما ئەکـەم ، ئـۆی ئـەلوو ئـەلوو بـە شـپرزەی دەسـکی تەلەفونەکـەم هـەڵگرت و یەکسـە ر ووتـی بـۆ هەڵیناگری بەساقە چی بووە چیتە ؟

کاردۆ : من ئەڵیت ئەلو من ؟

هێلین : بەڵی تۆ ئەڵێم چیتە بە قوربان ، بۆ وەڵام نادەیتەوە ؟

کـاردۆ : مـن باشـم رۆحەکـەم .. هێشـتا ووردە بەرسـیلەی پێکـەنین لە ناخمدا ماوە .. هیشتا بۆنی تۆم لێ دێ .

پـێ ئـەچوو زۆر بیتاقـەت بوبێـت و ئەیوسـت بچـم بـۆ لای ماڵیـان بۆیە پێی ووتم

: لای ماڵی ئێمە هەتاوە ئەی لای ئێوە ؟

کـــاردۆ : لای منــیش هــەتاو بــە ئاســمانەوەیە ، بــەڵام خــۆری مــن جیــاوازە لــەوەی تــۆ ..خۆرەکــەی مــن روونــاکی تۆیــە هێشــتا لێــرە مــاوە ... مــن و بیرکردنــەوە لــە تــۆ هێنــدە پێکــەوە بــووین ئێســتا بوینەتــە خوشــك و بــرا .. ســەیرە لــە یــەکیش بێــزار نــابین بگــرە زیــاتر یــەکمان خــۆش دەوێ ، مــن و بیــر کردنــەوە لــە تــۆ لــە مــن و تــۆ ئــەچیت مــن و تــۆ لــە یــەك ئــەچین . مــن ... سەرشــێتترین پیاوی وڵاتم تۆش ئازاترین مێینەی گەردوونی

مـن ... دلـۆپێکم لـە عەشـق ، تـۆش ... تکەیـەکی لـە خۆشەویسـتی . مـــن لـــە گـــەڵا وەریوەکـــانی پـــایز دەچـــم تـــۆش ...وەك کلـــۆ بەفرەکانی زستانی.. ئەبینی ...

چــەنێك لــە یــەك نــزیکین.... مــن هێشــتا باشــم .... مــن هێشــتا باشــم هێشــوە ترێکــانی خەمــەکانی نــاخی خۆشــم تێنوســەکەی رەشــی کردووم ئەمەوێ تا ماوم بۆ تۆ بنووسم ..

زۆر باشـــم ئـــەم زەمیلـــە ووشـــەیەی لـــە نـــاو رۆحمدایـــە هێشـــتا ئـۆقرەی پـێ بەخشـیوم دەتـوانم گـوزەر بکـەم و دڵـە بچکۆلانەکـەی تــۆ بفــرێنم بــۆ ئــەودیو هــەورەکان تــا لەگــەڵ نەورەســەکاندا ســەما بکا تا پێکەنینەکان بە نامەی کۆترەکاندا بۆ بنێرم .

هێلــین : ده باشــه ئێســتا بــا بــرۆم ئیشــەكانم بكــەم دوای قســه ئەكەینــەوه . لەگــەڵ ئــەوەی كــەمێك پــێش ئێســتا پێكــەوه بــووین بــەڵام بیـرت ئەكـەم رۆحەكـەم دەی بـا ئێسـتا جـارێ بـرۆین خـوات لەگەڵ .

كــاردۆ : خــوات لەگــەڵ ، لــێم ببــوره تكايــه مــن قــەت نامــەوێ تــۆ ئــازار بـدەم بــەڵام چــی بكــەم تــۆ نــەبێ كــی بەرگــەی بــێ مێشـكی يـەكانم بگرێـت . خـوات لەگـەڵ هێلـين ئـەو تـەرايی يـەی ئـەمرۆ لـه چــاوی تــۆدا بينيــنم ... هيچــی لــه ئــاوی كەوســـەر كــەمتر نــەبوو هەردڵۆپێك فرمێسك تكەيەك لە ئاوی كەوسەر بوو .

نــازانم مــن ئەمويســت لـــەناو ئـــەم خەونـــەيا بمێنمـــەوه يـــان بێمـــه دەرەوه كێشــەكه ئــەوه بــوو دەروەو نــاوەوەم لــه يــەك بــۆ جيــا نــه ئەكرايـەوه ، خۆشـم تەنانـەت نـەم ئـه زانـی بـۆ ئـەمرۆ وام كـرد بـه هــەرحاڵ مانـدووم كـەمێ بنـووم باشـتره نوسـتن مردنێكـی كـاتی يـه بــەس خۆشــه ، باشــه ئــەبێ مــردنيش وا خــۆش بێـت لەوانەيـه وا بێــت هــەر بۆيــه ئــەوەی دەروات ناگەرێتــەوه ئــەزانێ ئــەوێ خۆشـتره ، كـوره وەڵا هـەموو شـوێنێ لێـره خۆشـتره بـەس نـی يـه لــەوێ ئــەزانی بــۆ كــوێ ئــەچيت و چــی ئەكــەی ، يــان لەوانەيــه ئەوێش هەر نەبێ يان لەوانەيه لێره خراپتر بێت .

لەگەڵ پاڵکەوتنم لە دەرگاکە درا .

تەقــە تــەقێکی زۆری بێــزار کــەر بەراســتی دەنگەکــەی زۆر ناخۆش بوو ..

باشــە خــۆ مــن چــاوم نــەچووبووە خــەو ئەمــە کــێ بــێ ئێسـتا ، مـن تێناگــەم ئــەم عالەمــە بــۆ واز لــە یــەك نــاهێنن ؟ بابــە مانــدووم ماندوو.

بــە بــەردەوامی لــە دەرگاکــە ئــەدرا ئــەتووت کەســێکە پێــداگرە لەســەر کردنــەوەی ئــەو دەرگــا دامــاوە ئــاوا بــڕوات نەیکەمــەوە ئەکەوێتە بەر لەقە .

دەنگێکی گر ئەیوت کاردۆ لە ماڵی ؟

ئــەرێ مــن نــازانم جەرەســێکی گــەورەم کــردووە بــە دەرگاکــەوە ئـەم تەقـە تـەق و هـاوار هـاوارە چـی یـە ئـەم عالەمـە بـۆ فێـر نـابن بۆ ئەو جەرەسە گەورەیە نابینن ئەی خەڵك بۆ دای ئەنێن .

کــە دەرگاکــەم کــردەوە جــوانرۆی هــاوڕێم بــوو وەك جــاران بــە شــپرزەی هــاتبوو ، یەکســەر خــۆی کــرد بــە ژوراو هاتــە حەوشەکەوە ئەتووت راویان ناوە .

کاردۆ : جوانرۆ ئەمە تۆی بۆ لە جەرەسەکە نادەی ؟

جوانرۆ : ئاخر بێ دەماغ لە جەرەسی سەد ماڵدا تەنها دوانی ئیش ئەکات ئەو دوانەش کارەبایان نی یە جا بۆ خۆم کەر بکەم بە دیار شتێکەوە کە نەبوونی باشترە . منیش خۆم کەمێك تووڕە کردو ووتم دە وەرە جەرەس بۆ بەشەری ئاوا دابنێ ، دە بروا بکە مادام وات ووت ئەوە هەر لێی ئەکەمەوە .

جوانرۆ : لێ ی مەکەرەوە (بە پێکەنینەوە ووتی) نا نا بەساقەو بم ئەمە حەوتەم جارە لێ ئەکەیتەوە دوای داشی ئەنێتەوە نەکەی ئاممان دەستم دامێن بێ هەر زەرەر لە بزمارەکان ئەدەیت و چەکوشەکە ماندوو ئەکەیت و هیچی تر .

کاردۆ : دە باشە وەرە ژورەوە سەرم ئێشێ زۆر قسە مەکە دەی وەرە ژورەوە .

جوانرۆ : هههههههه جا توخوا تۆ کەی سەر نەێشاوە پێم ناڵێیت ؟ .

کاردۆ: ئەلێم چا ئەخۆی یا قاوە ؟... لەگەڵ تۆمە جوانرۆ دە ئەو موبایلە نەحلەتی یە لا بەو جوابم بەرەوە ئەمە تۆ بۆ لای

مـن هـاتووی یـا بـۆ لای ئەنتەرنێتەکـەی دراوسـێکەمان ئـاخر ئـەو نەگبەتـە ئەگـەر ژمارەیـەکی نهێنـی بخسـتایەتە سـەر تـۆ ئـاوا بـە بەلاشە لیت نە ئەخوری .

جـوانرۆ : بـەدەم سـەیرکردنی موبایەلەکەیـەوە ( کـە مـن زۆر پەسـت ئـەبم بـەو کەسـانەی قسـەت بـۆ ئەکـەن و تەلـە فونەکـەیان بـە دەسـتەوەیەو سـەیر ناکـەن و سـەیری تەلەفونەکـە ئەکـەن ، ئـاخر باشـە تـۆ قسـە بـۆ کـێ ئەکـەی بـۆ مـن یـان بـۆ تەلەفونەکـەت بـەس ئیتـر ئەمـە جوانرۆیـە چـی لـێ بکـەم هەرچەنـدە ئەوەتـەی ئـەم ئـامێرە داهـاتووە زۆرینـەی خەڵکەکـە وایـان لێهـاتووە ) ووتـی : ئـەزانی کـاردۆ هاوریکـانم زۆر زۆر بـوون شـتی سـەیر سـەیر دائـەنێن لەسـەر ووڵەکـەیان ، یـەکێکیان شـاعیرێکی هەسـت ناسـکە و شـیعری جـوان ئەنوسـێ ، بـەس نـازانم سـوودی چـی یـە شـیعر نووسـین ، ئـاخربڵێ ئـەم دوو کەلیمـەی تـۆ چـی لـە دنیـا ئـەگۆرێ ، پاشـان کـوا مرۆڤـەکانی ئێسـتا ئەونـدە هەسـتیان مـاوە شـیعر بخوێننـەوە ، مـن وای بـۆ ئـەچم نوسـین سـوودی هـەر نـەبێت لـەم رۆژگارەی ئێمەدا .

بـە بێتاقـەتی پـێم ووت سـەیرکە مـن هـەموو ئـەو کەسـانەم خـۆش ئەوێ کە ئەنوسن وە زۆریش رقم لێ یانە کە ئەنوسن .

جــوانرۆ :جــا تــۆ شــێتی ئەمــە چــۆن ئــەبێ ؟ کــە ئەنوســن و کــە نانوسن ؟

پــێم ووت ئــەبێ لەبــەر ئــەوەی نوســینەکان وام لــێ ئەکــەن هــەتا هەنگاوزیاتر بنێم لەم ژیاندا .. پێکەنینم ...گریانم...

زیاتر بە ژیان دێ و بە مردنیش دێ .

جــوانرۆ : باشــە تــۆ وا بیــر ئەکەیتــەوە ئــەی خــەڵکیش خۆعــەقڵیان هەیەبۆبیرکردنــەوەیان وەك تــۆ نــی یــە ، بــەخوا تــۆ بونــەوەرێکی سەیری من سەر لێ دەرناکەم .

کــاردۆ : ســەیرکە جــوانرۆ ئــەوەتا پــێڵاویش زمــانی هەیــە .. بــەڵام نــاتوانێ قســە بکــا مێــزیش قــاچی هەیــە بــەڵام ناتوانێــت بــڕوا مریشــکیش پــەری هەیــە بــەڵام ناتوانێــت بفــڕێ ، کولــەش چــزوی هەیــە بــەڵاَم ناتوانێــت پێــوەت بــدات ، کەســانێکیش هــەن عــەقڵیان هەیە ... بەڵام ناتوانن بیر بکەنەوە ...

بــا شــتێك پــێ بڵــێم جــوانرۆ مــرۆڤ بــە ســێ ڕێگــە ئەتوانێــت بگــات بـــەم بیرکردنەوانـــەی مـــن ، یەکـــەم لـــە ڕێگـــەی تێرامـــان و بیرکردنــەوە کــە ئەمــەیان لــە هــەمویان باشــترە و ئاســانترە وە

هــەروەها ووزەو خەســارەتی کــەمتر دەوێــت ، دووەم لــە رێگــەی خوێندنـــەوە و چاولێکردنـــەوە وگـــەران ، ســـێهەم لـــە رێگـــەی ئەزموونـــەوە کــە ئەمــە لــە هــەمویان ئــازاری قــوڵترەو خــەمی زیاترە بەڵام بیر چوونەوەی نی یە .

جـوانرۆ: ئـەزانی چـی بـەقوربان بـرۆ چایـەك لـێ نـێ بـا جگەرەیـە کیشـی بـۆ دابگیرسـێنم ، مـن تاقـەتی ئـەم شـتانەم نـی یـە خـوا ئـەکا سـە یارەیـەك ئـەکرم ئـەوە خەوەکەمـە ئـەم شـتانەی تـۆ بەشـەر تێك ئەدات کاکە گیان .

کـــاردۆ : ( بـــە پێکەنینێکـــەوە ) ئـــای لـــە خەوەکـــەت چەندێکـــە بچوکە .

ئـەویش بـە فشـقیاتەوە ووتـی بـۆ تـۆ ئەتـەوی ببیـت بـە سـا حێبـی کۆمپانیـایی تەلـەفونات ئـەی بابـە پـێم نـاڵێی تـۆ حـەزت لـە چـی یـە چیت خۆش ئەوێت ؟ .

کـــاردۆ : مـــن هەمیشـــە ووشـــەم خـــۆش دەوێ بەتایبـــەت ئـــەوو ووشـانەی مێشـکم زیـاتر دەکەنـەوەو ئـەتوانن ئاسـانتر رێگاکـانم بـۆ روون بکەنــەوە ، ووشــە مــرۆڤ ئەباتــە جیهانێـك هــەموو وێنــەکان بـــە شـــێوەیەکی دی ئـــەبینێ و چێـــژی لـــێ وەردەگرێـــت ، ئـــەو

کەسەشـــم خـــۆش ئـــەوێت کـــە لـــێم تـــێ دەگـــات ، ئـــەوە تەنیایشـــم لـــەولاوە بووەســـتێ ئەویشـــم خـــۆش ئـــەوێت بـــەڵام ئـــەوەش بزانـــە جـوانرۆ گیـان تـەنیایی بـە ئاسـانی دروسـت نابێـ "سـەرەتا مـرۆڤ ئـــازاری ئەبێـــتە پاشـــان ئاوارەکـــە ئەبێـــە خەفەت، خەفەتەکـــەش ئەبێـتە بێـدەنگی و بێـدەنگیش ئەبێـتە تەنیـایی ، بـە واتـا تـەنیایی بـە ئاسـانی بـە دەسـت نایـەت قوربـان تـەنهایی خـۆی بـۆ خـۆی جیهانێکی گەورەیە .

جـوانرۆ : کـورە کـوری بـاوکم پـارەت هـەبێ ئەمانـەت هـەمووی ئەبێ بروا بکە .

کـاردۆ :پـارە ، ئـەزانی جـوانرۆ هـیچ شـتێك نـی یـە هێنـدەی پـارە رەوشـــتی مـــرۆڤ تێـــك بـــدات بـــاش بزانـــە " لە هەر وولاتیکـــدا پـارە بـوو بە دەسـەڵاتدار ، یەکسـانی و ئـازادی مانـای نابێـت ئیتـر رەوشـت تێـك ئـەچێت لـەو کۆمەڵگایـە ئیتـر مرۆڤایـەتی نـامێنێ هەموو جوانی یەکان ناشرین دەبن .

جـوانرۆ : ئـا تـۆ بیـدە بـە مـن بزانـە نابمـە ئەشـرەفی شـەریفان بزانـە رەوشت بەسەر عالەمیشا بەش ناکەم .

کــاردۆ : دە بــا شــتێك پــێ بڵــێم براکــەم ،ئەو کــاتەی کە دەســت دەدەیــتە قەڵەم و دەتەوێــت وەســیەت نــامەکەت بنوســی بــۆت دەر دەکەوێـــت تەنهـــا کەســـێک کە هـــیچ بەشـــێکی لە ســـەروەت و سـامانەکەتدا نـیە هەر 'خـۆتی 'ئیتـر پـێم ناڵێیـت پـارەو سـەرەوەت و سـامان بـۆ چـی یـە بـە قوربـان ئـەی نەتبیسـتووە ئـەڵێن پـارە چڵکـی دەستە .

بــا بچــم بــۆ لای چاکــە وا بــزانم ئــاوا بــروا ئــەم چایــە پــێ ناگــات تۆش خەریکی ئەم قسە زلانە ئەبی .

لــەوە ئــەچوو بزانــێ حــاڵم بــاش نــی یــە بۆیــە ووتــی دە ئــەزانی چــی وەرە بــا بچینــە دەرەوە چاکــە بخۆینــەوە ، ئــەو ئەیویســت کــەمێك لــە حاڵەکــەم بگــۆڕێ راســتی یەکــەی پــێم بــاش بــوو تــا کــەمێك هــەوا بگــۆڕم بۆیــە منــیش ووتــم باشــە بــا بــرۆین بــەس بۆســتە بــا چاکــە بکوژێنمەوە ئەو کات دەرۆین.

جـوانرۆ : ئـەزانی شـتێکی تـۆم لا سـەیرە ، کـورە شـتێکی چـی وەڵا هــەموو شــتەکانت ســەیرن ، باشــە کــاردۆ ئــەوە تــۆ بــۆ قــەت نــاڵێ ی نــا ، هیچــی کــەس رەت ناکەیتــەوە ؟.. ئەمــە چــۆن تەحــەمول ئەکەی هەموو ئارەزوەکانی خەڵك بێنیتە دی ئەی خۆت ؟

کـاردۆ : جـوانرۆ گیـان  مـن ئـەڵێیت .. مـن لـە لمـی کـەنار دەریـا ئەچم ..............

چــەنێك نەورەســەکان چیرۆکــەکانیان لەســەرم بنوســنەوە دەریــا دێت و بە ئاسانی دەیسڕێتەوە .

بـەس لـەوە ئـەچو تاقـەتی جـدیاتی نـەبێ ووتــی ئـەی بـرا شـتەکەی قـورس کـردەوە  بابـە مـن ئـەم شـتانە تـێ ناگـەم بـۆم بکـە بـە کـوردی ، ئەزانی چی تۆ چا ئەخۆی ؟

کاردۆ : بەڵێ  .

جوانرۆ :  دە با برۆین، ئەڵیم کوێت پێ باشە بچین کاردۆ ؟

 کــاردۆ : لام گرنــگ نــی یــە هــەر شــوێنێك بێــت شــوێنەکان هــەمووی وەك  یــەکن ، تەنانــەت بـۆ ژیــانیش جیـاوازی نــی یــە مـرۆڤ لــە کـویێ بـژی چــی جیـاوازیەکی هەیە لەکـوێ دەژیـت، کاتێــک لە قســەکانت نــاگەن لە هەمــوو شــوێنێک غەریبەیــت مـرۆڤ لـە شـوێنێك هەسـت بـە هێمنــی و دڵنیـایی دەکـات کـە لـێ ی تێبگـەن و ڕێگـەی بـدەن وەك چـۆن خـۆی دەیـەوێت ئاوهـا بـژی دەنا وا نەبێ شوێن هیچ مانایەکی نی یە .

جــوانرۆ : چــۆن شــوێنەکان هــەمووی وەك یــەکن ؟ ئــاخرا بــرا نــەرۆ بــەس پـێم بڵــێ ئێـرە و ئـەو ئەوروپایــە وەك یـەکن خـۆ ئـەوە خـــۆت چوویتەتـــە ئـــەوروپاو لـــەوێ ماوەیـــەك ژیاویـــت چـــۆن بەراورد ئەکرێن لە روانگەی تۆوە ؟ پێم ناڵێیت .

کــاردۆ : مــن کــە چــووم بــو ئــەوروپا جیاوازیــەکی ئــەوتۆم نــەبینی لەگەڵ ئێرە .

جوانرۆ :کورە ویژدان هەبێ ئاخر هەر ئێرەو هەر ئەوێ !.

ئـــەوەی لای مـــن بـــوو جیـــا بـــوو لـــەوەی لای ئـــەو بـــوو ، بیرکردنــەوەکانمان جیــاوازی زۆر بــوو لەســەر شــوێنەکان ئــەو لــە گۆشــە نیگاکــانی خــۆی ســەیری ئــەکرد منــیش لــە پانتــایی یــەکی گەورەتر لەوەی ئەو بۆ شتەکانم ئەروانی .

کــاردۆ : ئــاخر نەگبــەت مــن لــە گۆشــە نیگایەکــەوە بیــر ئەکەمــەوە تــۆش لــە گۆشــە نیگایــەکی کــەوە ئــەیبینی دڵنیــا بــە جیــاوازی هەیــە لە نێوان بینین و بیرکردنەوکانمان لەسەر ئەو بابەتە .

جــوانرۆ : کــوره ئــاخر گۆشــەی چــی و تەرەماشــی چــی ئــەوان ئــەژین بابــە گیــان گــەران و کــەیف و تــەرەف و کــەبل و مــەپل هەموو شتێکیان هەیە .

ئەمویســت بــە زمانەکــەی خــۆی بــۆی روون بکەمــەوە بــەس نــەم ئــەزانی چــۆن ، پــێم ووت وەرە بــا تێــت بگەیــەنم مــرۆڤ وەك پارچە یەك ئاڵتون سەیر بکە .

جوانرۆ : تێ ناگەم .

کــاردۆ : وا دابنــێ هــەموو مرۆڤــەکان ئــاڵتونن وە هــەرە یەکــەیان بیســت چــوار عــەیاری هــەبێت واتــا بــا شــی بکەینــەوە بــە دەم رێگاوە .

جــوانرۆ : بــەس بــە قوربانــە تــێکم نەیــەیت وەك خــۆت بــەخوا مــن پارچــەو مارچــەم نــی یــە تــا چــاکم بکەنــەوە پێــی دوای بــە ســەقەتی ئەمێنمەوە.

کاردۆ : نانا خەم مەخۆ .

کــاردۆ : ســەیرکە وای دابنــێن بــاوك یــەك خاڵــە یــان یــەك عــەیارە وە بــەپێی باشــی و خراپــی کــەم و زیــاد دەکــات ئــەم خاڵــە وە دایــك

یـەك  خـاڵ خێـزان یـەك خـاڵ خوشـك بـرا یـەك خـاڵ ئـیش وە پـارە وە هاورێ وە بەم شێوەیە .

جـوانرۆ : بەشــەرەفی هــەرچی پیـاوی بَــی شــەرەفە یــەك کەلیمــە تێ ناگەم .

کـاردۆ : نـا ئاسـان شـی ئەکەمـەوە ئێسـتا ئـەو کـات تـێ ئەگـەی کـاك شەرەف .

لــە وڵاتــی خۆمــان مــن خــاوەنی بیســت وچــوار خــاڵم بــەڵام بــەم شـێوەیەی خـوارەوە . بـاوکم یـەك خـاڵ ، جـوانرۆ باشـە بـۆ یـەك خــاڵ ئــەی زیــاتر کــەمتر ، بەشــێوەیەکی گشــتی بــاوکم نــە زۆر باشــە لــە گــەڵم نــە زۆر خراپــە بــەڵکو ئــەو هاوســەنگ بــووە لــە مامەڵـە کردنـی لەگـەڵم  بـە واتـا ئـەو یـەك خـاڵ ئـێ دایکیشـم نـی یـە بـە واتـا ئـەو خاڵـە فت ، ئـێ خوشـکم نـی یـە وە بـرام نـی یـە ئـەوەش فــت  ، وە ئاســتی خوێنــدنم باشــە وە لــە پــارەدا مــام ناوەنــدم وە لــە هاورێ .

جـوانرۆ ئـا ئەمـە بڵـی کاکـە لـە مـەیا دە خـاڵ هەیـە نـۆ خـاڵی خـۆمم وا نی یە ؟

کاردۆ : بە پێکەنینەوە نا بابە هەر دە خاڵەکە تۆی .

کـاردۆ : ئەمانـە هـەمووی کـۆ بکـەرەوە لەگـەڵ کۆمـەڵی پەیوەنـدی کۆمەڵایـــەتی و بـــاری خۆشەویســـتی و عەشـــق و پـــاکی بـــوونی خۆمـــان و جـــوانی خـــودی تاکـــەکان ونەتەوایـــەتی و نیشـــتیمان پـــەروەری وهەســـتەکانمان و سروشـــت و حـــەزەکانمان بەمانـــە هەموویەوە دەکاتە بیست وچوار خاڵ .

جـوانرۆ : ئـێ جـا ئەمـە پەیوەنـدی چـی یـە بـە ئـەوروپاوە ؟ ئـی خـۆ پیـاوی ئـەوروپا ئەمانـەی هـەمووی هەیـە و سـەد خـالی زیاشـی هەیە بابە ئەوان پاشان پاشا .

هــەر ئەمویســت ئاســانتری کــەم ووتــم نــا ئــەوانیش هــەر بیســت وچــوار خاڵیــان هەیــە ووتــی چــۆن ؟ ووتــم ئــەوان راســتە شــتی زۆریـــان هەیـــە بـــەڵام زۆر شتیشـــیان نـــی یـــە ســـەیرکە ئـــەوان خۆشەویسـتیان نـی یـە بـەو جـۆرەی ئێمـە ، ئـەوان هـەموو تـەنیان هەسـتیان نـەماوە سـۆز لــە ناخیـان تروسـکەی نایـەت ، ئــەوان نـازانن جیـاوازی چـای تـاڵ و شـیرین چـی یـە ، ئـەوان لـە ماچـە قەدەغـە کراوەکـان نـازانن ئـەوان رۆیشـتنێکن هەمیشـە جـێ پێکـانی خۆیـان ئەشـارنەوە نـە بـادا کـەس دوایـان کـەوێ بیـان ناسـێ و

لێیـان تــێ بگـا ، چ وێرانەیــەکن ئێمــەش خــەوێکین چرپــە کولــەی شــەومان لــە چـاوی یەکـدا رائەخــەین نــەبادا کەسـمان لــە کــەس وون ببــێ ئێمــە هــەموومانین بــەڵام ئــەوان تــەنیان گرنگــرتین شــتیان ئـەزانی چـی یـە ؟ کـات ، ئـەوان کاتیـان نـی یـە . کاتیـان نـی یـە بـۆ خۆشەویستی بۆ ژیـان بـۆ پێکـەنین بـۆ گریـان بـۆ هـیچ شـتێ کاتیـان نی یە .

جوانرۆ : جا کە کات هیچ مانایەکی نەمێنێ

کاتژمێریان بۆ چیە، بە پێکەنینەوە.

کــاردۆ:بــە پێچەوانــەوە کــاتژمێر بــۆ ئــەوان زۆر گرنگــە چونکــە کاتی پێ ئەپێون تا بزانن کەی ئەگەنە مردن .

جــوانرۆ: بــەس کاکــە لــەوێ یاســا هەیــە ژیــان هەیــە خۆشــی هەیە.

کاردۆ: یاسا ئەڵێیت ، تۆ ئەزانی یاسا چی یە ؟

جوانرۆ : ئەی بۆ نازانم قانون ئەڵێیت .

کــاردۆ : یاســا ئــەو پێوانەیەیــە کــە دەوڵەمەنــدەکان بــۆ فــەقیرەکانی دا ئەنێن تا نەتوانن بە ئارەزوی خۆیان هەنگاو بنێن.

جوانرۆ باشە تۆ مەبەست ئەوەیە یاسا نەبێ باشترە ؟

کاردۆ: نا ئەوە نالێم سەیرکە مرۆڤ پێویستی بە شتێك هەیە تا ئارەزووە ئاژەڵی یەکانی پێ کونترۆڵ بکات ، خۆی سێ کاراکتەر هەن بۆ بەرێوەبردنی ژیان لەم جیهانەدا ، یەکەم رەوشت واتە ئەخلاق بە زمانەکەی تۆ ئەگەر مرۆڤ ئەمەی هەبێت ئەتوانێ دەسەلاتی هەبێت بەسەر خۆیدا و کۆمەڵگاشدا سەرجەمیان لە یەکسانی و ئاسودەی دەژین تەنانەت مرۆڤ خۆشی ئاسودە ئەژی و هە میشە یەکسان دەبێت لەبەر ئەوەی رەوشتی رێگەی نادا ئازاری بەرامبەر بدات یان بەشی بخۆری یان هاوکاری نەکات . رەوشت جوانی یەکانی ژیانت فێر ئەکات .

جوانرۆ : جا ئەمە لە کوێ هەیە ؟

پێکەنیم ووتم : ئەمە نی یە تەنها لە خەیاڵدا هەیە دەنا جیهانی وا لە راستیدا بوونی نی یە .

دووەم ئاین یان باوەرەکان ئەمەش هۆکاریکە تا لە رێگەی ترس و تۆقین و پاداشت و خۆشی دەستورێك دابنێیت بۆ هەڵسوکەوتی خەڵکەکە و رێنمونیان بکەیت رێگەی کۆمەڵێ

شتیان پێ بدات و کۆمەڵێکیان لێ سانسۆر بکات بە واتا ژیانی ڕۆژانەیان بۆ ڕێك بخات ، هەرچەنە بە بۆچوونی من ئاین و باوەڕکان لە ئەمرۆماندا لە نەخۆشیەکان زیاتر ئەبنە هۆی کوشتنی خەڵك بەڵام ئیتر ئەویش هەرهەیە کۆمەڵگایەکی زۆر بەمە ئەڕۆن بەرێوە .

جوانرۆ : ئێ بە خوا باشە ئەمەیان هەیە ئەمە بۆ ئەم میللەتەی ئێمە نەبێ بە ڕۆژێ ڕوونـاك سواری یەك ئەبن و یەك ئەکوژن . بەس باشە ئەی ئەمەش خۆ وەك ئەخلاق نی یە بڵـی نی یە وا نی یە ؟

دووبارە پێکەنیم ووتم نا ئەوەشیان نی یە .

جوانرۆ : چۆن تێناگەم ئەوە نی یە ئێمە دینمان هەیە ؟ کاکە ئەی هاوار ئەی بۆ نیمانە ؟

کاردۆ :من ناڵێم دین یان ئاین نی یە بەڵام ئاخر لەبەر ئەوەی ئاینەکان جیاوازن وە هیچیشیان بروایان بەوی تریان نی یە وە هەمووشیان ئەوی تر ڕەت ئەکەنەوە ئەوەتا لە سایەی سەری دینەوە ئەبینی ڕۆژانە چی منداڵ و گەنج و پیر ئەکوژرێن و سەر ئەبرێن .

جـوانرۆ: ئـاخر بابـە دینەکـەی ئێمـە وانـی یـە بـە خـوا کاکـە لـە وڵاتـی ئێمـە دا ئەگەر خـوداش بـوونی نەبێـت، ئەوا دەبێـت خۆمـان خودایەک درووست بکەین.

کـاردۆ : نـا ئـەوەی ئێمـەش وایـە و واش نـی یـە لەوانەیـە بڵـی ی چـۆن سـەیرکە کـەلتوری ئێمـە پـاککترە و دینەکـە نـەیتوانیوە بـە تـەواوی یچێتـە رۆژانەمانـەوە ئـەوتا سـەیری بـاو باپیرانمـان بکـە بزانـە کـە دیانـەتیان کـردووە چـەنێك توانیویانـە پێکـەوەش بـە جـوانی بمێننـەوە کەسـەکان هـەموو وەك یـەك پـاك بـن . نـەك وەك ئێسـتا ئـەڵێن یـەك خـواو پێغەمبـەر هەیـە کـەچی هـەزارەها کتێبـی پیـرۆز و مەزهـەب و پێغەمبـەریان لـێ دروسـت کـردووە سـەریان لە خۆشیان و لە خەڵکەکەش تێك داوە .

ئـێ سـیهەمیش ئـەو یاسـا جوانـە بـوو کـە سـەرمایەداری دروسـتی کـردووە تـەنها بـۆ پرکردنـی گیرفانـەکانی خـۆی لـە سـەر حسـابی سـکی هـەژاران و نـەداران تەنانـەت لـە نێـوان خۆشـماندا هـەمووما‌ن داوای مـافی یەکسـانی و یاسـایی دەکـەی بـەڵام تـا بڵێی لەگەڵ یەکدا نا ئینسانین نا یاسایین.

جوانرۆ : ئێ باشە ئەی مردن ئەی تۆ لە مردن تێگەیشتووی .

کـاردۆ : نـا کێشـەکە ئەوەیـە هێشـتا ئێمـە لـەم دنیـا نەگەیشـتووین ئیتـر چـۆن ئـەتوانین لەسـەر مـردن بـزانین پـاش ئـەوە چ پێویسـتی یـەکمان بـە تێگەیشـتن هەیـە لـە مـردن بـە بۆچـونی مـن تێگەیشـتن لە مردن دابنێ بۆ کاتی مردنەکە خۆی .

جـوانرۆ : ئـەزانی کـاردۆ تـۆ ئـەمرۆ بـۆ چایـەك مـن بـە خۆتـەوە تێك ئـەدەیت بـرۆ بابـە بـرۆ بـا دوو نوکتـەی خـۆش بـۆ بکـەم و بیـر لـــەو شـــتە قۆرانـــە مەکـــەرەوە ، بـــەدەم نوکتـــەکانی جـــوانرۆوە گەیشـتینە چایخانەکـە لـەوێ رامیارمـان بینـی لـە نـاخی خۆمـا پێکـەنینم ئـەهات کـە بیـرم کەوتـەوە کـەمێ پـێش ئێسـتا باسـی دینمـان ئەکرد ئەوە لێرە یەکێ لە هاورێ دیندارەکانمان بینی.

ئـەم رامیـارە هەمیشـە پـێ ئـەوتم براکـەم کـاردۆ مـردن چـاوەرێ ی کـەس ناکـات تـا ئـەوەی نـەی ووتـوە بیڵـی و ئـەوەی نـەیکردووە بیکـات ، کـەی دەسـت ئەکـەی بـە نـوێژ و ئیتـر تۆبـە بکـەی ؟ مـن ئـەو قسـەیەی ئـەوم لا جـوان بـوو نـەك ئـەوەی نـوێژ و تاعەتەکـە نـا ئـەوە تـری راسـتەکات مـردن چـاوەرێ ناکـات . رۆژێکیـان لێـی پرسـیم تـۆ لـە چـی پەشـیمانی لـە ژیانتـا کـاردۆ ، ووتـم لـەوە پەشـیمانم ئـەوەی کـە ئـەمتوانی لـە ژیانـدا بیکـەم و نـەمکرد وە پەشـیمانی مـن بـۆ ئـەوە نـی یـە کـە کـاری هەڵـەم کردبـێ ، نـا بـە

پێچەوانــەوە بــۆ ئــەو کــارە راســتانەم پەشــیمانم کــە لەگــەڵ کەســی هەڵــەدا کردوومــە .دەنــا مــن بــروام وایــە ئــەبێ هــەموو جــوانی یــەکانی ژیــان تــام بکــەم بەختــەوەری بــە دەســت بێــنم چونکــە مــردن چــاوەڕێ ناکــات بــەس تــا ئێســتاش کێشــەکەم ئەوەیــە نــازانم بەختــەوەری راســتەقینە لــە چــی دایــە لــە کوێدایــە ئــەها شــتێکی کەشــیم بیرکەوتــەوە ئــەو هەمیشــە ئــەڵێت مــرۆڤ تاوانبــارەوە شــوێنی جەهەنەمــە ئەگــەر لــە پێنــاوی شــتێکدا بمرێــت کــە لــە خــۆی بچــوکتر بێــت . مــن ئەمەشــیم بــە دڵ بــوو بــەس بــە هــەمان شــێوە لــە ئاراســتەیەکی تــرەوە ، جارێکیــان لــێم پرســی تــۆ بــۆ ئــەژیت پێــی ووتــم ئــاخر خــۆ کوشــتن حەرامــە . وەڵامێکــی ســەیر بــوو بۆیــە نــەمزانی چــی بڵــێم بــێ دەنــگ بــووم چونکــە لای مــن مــردن پەیــــوەندی بــــە ئێمــــەوە نیــــە،چونکــــە هەتاوەکــــو بــژین،مــردن بــونی نیــە،کــاتێکیش کــە مــردین ،ئەوســا چیتــر ئێمــە بونمــان نیــە ، دوا ئــەوە ئێســتا هــیچ مرۆڤێکــی مــردوو گلــەی لــەوە نــەکردووە کــە مــردووە وە کەســیش نەگەراوەتــەوە تــا پێمــان بڵێت بمرین یان نەمرین باشترە .

کــە گەیشــتینە نــاو چایخانەکــە رامیــار لــە بــەرمان هەســتا و ووتــی وەرن لێرە دانیشن .

دانیشـــتین دوای ســـەلام بـــەڵام بـــێ کـــەلام ، گرنـــگ چـــا کـــەمان خوارد .

رامیار : هەستەکەم هیلاکی کاردۆ چیتە ؟

جـــوانرۆ : کـــورە وەڵا منـــیش وا ئـــەڵێم بابـــە ئەمـــە تـــەواو نـــی یـــە ئەمرۆ هەر شێتی کردم

رامیـــار : چەنـــد جـــارم پـــێ ووتـــی وەرەوە ســـەر رێـــرەوی دیـــن و نـــوێژ کـــردن بـــروا بکـــە تـــە واو ئیســـراحەت دەکـــەیت ناخـــت پـــاك و دەرونـــت ئـــارام ئـــەبێت براکـــەم ئـــەزانی تـــۆ ئەوەتـــەی لـــە دیـــن دوور کەوتویتەتەوە خراپت بە سەر هاتووە .

کاردۆ : رامیار پرسیارێ بکەم ؟

رامیار : فەرموو براکەم .

کاردۆ : تۆ قەت عاشق بووی ؟

رامیار : استغفر الله .

جـــوانرۆ : مـــن عاشـــقم مـــن ، ئـــەزانی کـــاردۆ بـــرادەرێکم هەیـــە وەسـفێکی جـوانی عەشـق ئـەکات ئـەڵێت کـە عاشـق ئـەبیت هـەر لـە

خۆتــەوە بــەعزە خواردنێـك ناخۆیـت و هــەر لــە خۆتــەوە کــە خـۆر ئـــاوا ئـــەبێت ســـەیری ئەکـــەیت و خـــەیاڵ ئەتباتـــەوە کـــە رەســـم ئــەگریت پشــت ئەکەیتــە کــامێرا و ئیتــر گــوێ لــە گــۆرانی خێــرا ناگریـت و کــە خــەڵك قســەت لەگــەڵ ئەکــەن بــە شـیعر و شــانامە جـواب ئەدەیتــەوە بــە کـوردی یەکــەی کــەر ئــەبیت و ئــاە .... ئــەی توخوا کاردۆ تۆ پێم بڵێ عاشقبیت یان نا ؟

کـــاردۆ : مـــن عاشـــقێکی ســـەیرم وەك عاشـــقە کـــانی تـــر نـــیم ، عاشـقێکی تـۆزاوی بـە رابـردوو ئـەزانن بـرادەران جـاران ئێمـە کـە عاشـقی راسـتەقینەی یـەکتر بـووین بەنـانێکی تیـری و داڵانێکـی تــۆزاوی و بەرچنەیـــەك خۆشەویســـتی رازی بـــووین ، ئەمانـــە هەسـتن هەسـت ئـەزانی هەسـت چـی یـە بـا بزانـی ئەگەر کەسـێك لەهەسـتت تێنەگـات گرنــگ نـیە ، سـەرت بەرز بـکەوەو بۆخـۆت پێبکەنە ، تێگەیشتن لە هەست کاری هەموو کەسێك نیە !

جـاران مرۆڤـەکان مـرۆڤ بـوون مـرۆڤ هەسـتیان هـەبوو دلێکـی پـر لــە میهرەبــانین هــەبوو ، بــەڵام ئێسـتا ماڵەکـان گەورە بـوون و دڵەکـان بچـوك بـوون . خـەمی پرکردنـی گیرفانـەکان زیـاتر بـووە لــە خــەمی پرکردنـــی دڵــەکان ئێســتا ئــەو دڵانــە خــاڵی بونــەتەوە، ئیدی ژیان سادەی و میهرە پاکەکانی لەدەستدا .

جــاران عەشــق کەســی ئــازاو قارەمــانی دەویســت بۆیــە هــەموو عەشــقەکان بوونـــە داســـتان ، ئێســـتا عەشـــق وەك بڵقـــی ســـەر دەریایـــەکی تورەیـــە زۆر زوو دیـــار نـــامێنێ ئـــەوتا رامیـــار بـــە عەشق ئەڵێت استغفر الله .

رامیار : بابە من هەر نازانم عەشق و مەشق چی یە .

کــاردۆ : ئــەی چــۆن خــوات خــۆش ئــەوی ؟ چــۆن بــەم هــەموو ئیمانەتــەوە تــا ئێســتا عاشــقی خــوا نــەبووی ؟ بــۆ تــا ئێســتا لــە لــە نــاخی خۆتــا نــەبووی بــە هــاورێ و خۆشەویســت و عاشــق لەگــەڵ خودا ؟

جـوانرۆ: بابـە وەڵا مـن تاقـەتی ئـەم قسـانەم نـی یـە کاکـە بیبرنـەوە مەوزعەکە با گوناح بار نەبین .

رامیـار: نـا گوناحبـار نـابین جـوانرۆ ، راسـت ئـەکات کـاردۆ ئێمـە نــەك نــەمانتوانی وە خــودا بناســین بــەڵکو خۆشــمان نەناســیوە هــەر بۆیە هەست بە ئارامی قورئان ناکەین لە ناخماندا .

بــانگی ئێــوارەی داو لــەو کاتــەدا وەك ئــەوەی بڵێــت واز لــەو بابەتــە بێنن .

رامیـار: بـه ئیجازەتـان براکـانم مـن ئـەبێ بـرۆم بـۆ نـوێژ کـاتیکی تر یەکتر ئەبینینەوە خوا ئاگای لێتان بێت .

کاردۆ: خوات لەگەڵ کاتێکی تر یەك ئەبینینەوە .

رامیــار : ئــاواتم وایــە تــۆش رۆژێــك لەگــەڵم بێیــت بۆنــوێژی جەماعــەت ئــەو کــات هێمنــی و راسـتیت بـۆ دێتـەوە کـاردۆ گیـان بـروا بکــە تــەنها رێگــەی ئیمــان مــرۆڤ پــاك ئەکاتــەوەو هێمنــی دەرونی پێ ئەبەخشێت .

منـیش بــە زەردەخەنەیەکــەوە پــێم ووت : بــەخوا تــا مــن خــاوەنی ئەم عەقڵە بم بروا ناکەم ئەو ئاواتەت بێتە دی .

رامیار : نا وا نی یە من دڵنیام هەر رۆژێك دێت ئەگەرێیتەوە .

کــاردۆ : مــرۆڤ هەمیشــە بــەرەو پــێش ئــەچێت قــەت ناگەرێتــە دواوە رامیــاری هــاورێم بــەڵام هــەر چۆنێــك بێــت مــن دڵنیــام رۆژێـك دێـت تـۆ وەك منـت لـێ دێـت بـەس نـازانم بـە هـەمان بیـر یـان بـە هـەمان رەفتـار دەبـێ ، دوای ئـەوە رەنگـە مـن لـە چـاو زۆر کـــەس بـــە هێواشـــی بـــرۆم ، بـــەڵام گرنـــگ بـــۆ دواوە ناگەرێمـەوە کاکـە رامیـار ئێمـە هەمیشـە لۆمـەی یـەك دەکـەین کـێ

راســـتەو کـــێ هەڵەیـــە بـــەڵام ، نـــەمانزانی هـــەمووومان نێچیـــری دەســـــتی دواکــــەوتوی خۆمــــانین . مــــرۆڤ ڕووی گـــــورگ و گیانلەبـــەرە خوێنخۆرەکـــانی دیکـــەی ســـەر گـــۆی زەوی ســـپی کردۆتـــەوە..ئەمەنـــدەی خراپـــە کـــردووە بـــە نـــاوی باوەڕەکانـــەوە کاکـە رامیـار لـە ژیانـدا گرنـگ کـەس ئـازار نـەدەیت و ە رێگـەش نـەدەیت کـەس ئـازار بـدات ئیتـر هـەر ئەمەنەیـە ژیـان بـۆ لـەوە زیاتر قورسی بکەین !

جـوانرۆ : ئـەرێ بابـە بـا بـرۆین ئەمـە چـی یـە ئـەم موناقەشـەیە بـە پێوە.

هەستاین و هەموو رۆشتین .

جوانرۆ : باشە کاردۆ ئەزانی تۆ کابرایەکی سەیری ؟

کاردۆ : بۆ ؟

جـوانرۆ : ئـاخر تـۆ بـەم حاڵـەوە چـۆن هـاورێ یـەتی رامیـار بـۆ ئەکرێ ؟

کـاردۆ : نـا وا نـی یـە مـن رامیـارم خـۆش ئـەوێت راسـتە ئـەو لـە دەرەوە ســـواخ دراوە بـــە بەســـتنەوە دەرەکـــی یـــەکان و خـــۆ هەڵخەڵەتانـدن بـەڵام لـە نـاوەوە کەسـێکی پـاك و بـە ویژدانـە ، تـا ئێســتا ئــەو ژەنگــەی دەرەوە کــاری نەکردۆتــە ســەر نــاوەوەی ئەگەر بـــتەوێ لەگەڵ هەر مرۆڤێـــك لە مرۆڤەکـــان بە ئەنـــدازەی شـــعوریان قســـەیان لەگەڵ بـــکەی ، ئەوا ناچـــار دەبـــی هەمـــوو تەمەنت بە بێ دەنگی بمێنیتەوە.

جـوانرۆ : ئـەی باشـە بـۆ یارمـەتی نادەیـت ؟ بـۆ رێگـای راسـتی نیشان نادەی ؟

کـاردۆ :سـەیرکە جـوانرۆ یەکـەم راسـت بـوونی نـی یـە لـە ژیانـدا تەنانـەت هێڵـی راسـت نـی یـە تـۆ ئەگـەر بـە میکرۆسـکۆپێك سـەیری هێڵێکـی راسـت بکـەیت ئـەبینی گرنجـە و راسـت نـی یـە ئەمـە خـۆی بـۆ خـۆی زانسـتە. پاشـان هـیچ مرۆڤێـك بـێ عـەقڵ نـی یـە تـەنها ئەوەندەیە هەندێك هەیە حەز ناکات بە کاری بهێنێ لە ترسا .

جوانرۆ : واتە چی راست بوونی نی یە ؟

کـاردۆ : واتـا راسـت یـان راسـتی بـوونی نـی یـە هـەموو راسـت و هەڵەیــەك لــە دروســت كردنــی مێشــكی مــرۆڤ خۆیــەتی ئەمــەش هۆكارەكــەی بــۆ ئــەوە ئەگەرێتــەوە كاتێـك مـرۆڤ هیوایــەكی بــە مێشـكی نـامێنێ ، بـەنا دەباتـە بـەر خورافـات و وەهـم، ئەگـەر تـۆ بگەرێیتــەوە بــۆ ســەرەتاكانی دروســت بــوونی مــرۆڤ ئایــا هەڵــە هــەبووە راســت هــەبووە ؟ كــێ زانیــوێتی كامــە راســتە و كامــە هەڵەیــە ؟ ئــەی چەنــدەها راســت نــەگۆراوون بــە درێــژای مێــژوو بــۆ هەڵــەو چەنــدەها هەڵــەش نــەگۆران بــۆ راســتی لەبــەر ئــەوە هــەموو راســتی و هەڵەیــەك وەهمــی مێشــكی مــرۆڤ خۆیــەتی ، دووەم براكــەم رامیــار ئێسـتا تەمــەنی بیســت وپـێج ســاڵە مـرۆڤیش كــە بــوو بــە بیســت و دوو ســاڵ ئیتــر شــتە ســەرەكی یــەكانی نــاگۆرێ مەگــەر زلــە تونــدەكانی رۆژگــار بیگــۆری ، ســێهەم پێویسـت ناكـات كەسـەكان بگـۆری تـا لەگـەڵ تـۆ بگـونجێن پێكـەوە ، بـوونی ئێمــە هێنــدە زۆر نــی یــە تــا نــەتوانین پێكــەوە دوو چــا بخۆینــەوە دوای ئــەوە هــەر رۆژێــك دێــت ئــەویش ئــەگۆرێ بــە ئاراسـتەیكا بـەس نـازانم چ ئاراسـتەیەكە پاشـان بـە خـوا جـوانرۆ لە ســەد نەفەر یەک نەفەر شــایەنی ئەوەیە لەگەڵــی بــدوێی، لــێگەڕێ خەڵـک چـی پـێ خۆشـە بـا بیڵـێ، چـونكە هەمـوو كەس ئـازادە، كە بێ عەقڵ بێت.

جوانرۆ : باشە تۆ بۆ وات لێهاتووە کاردۆ ؟

منـیش بـە قاقـا پێکـەنیم ووتـم هـەتیو چـیم لـێ هـاتووە خـۆ شـاخم لـێ نەرواوە ؟

جوانرۆ : نا کاکە وا ناڵێم هەستەکەم تۆ پری لە شتی سەیر .

کـاردۆ : ئــەزانی جـوانرۆ ...( کــەمێك بــێ دەنــگ بــووم )..تــۆ ئـەزانی .. مـن چەنـد جـار لـە سـڵەمینەوەی خۆمـان تۆقـاوم ، چەنـد جــار لــە گریــانی خــۆم رام کــردووە لــە منداڵێمــدا ، لــە پێکەنینــە دەســتکردەکانی خــۆم وەرس بــووم هێنــدەم بینــین ، بیرکردنـــەوەم بۆتـــە خویـــەك و ورکـــم پێـــوە گرتـــووە لەگـــەڵ بیرکردنـــەوە خۆشەویسـترین هـاورێین ، مـن و ئـەو تـەنهایی هەمیشـە پێکـەوەین .

جـوانرۆ : هەرچەنـدە بـە باشـی تـێ ناگـەم بـەڵام بـۆ وات بەسـەر هاتووە ؟

کـاردۆ : ئـەزانی بـۆ ، مـن لـە ژیانمـا ئەوەنـدە دۆرام تـا رێگـای بردنـەوە تـەواو فێـر بـووم لێـرە ئـەبێ هەمیشـە بـراوە بـی دەنـا زوو ئەفـەوتێ ی و ئـەخورێی . لێـرە هـەموو شـتێ قورسـە ، تەنانـەت

بـوون بــە مــرۆڤیش قورســە زۆر لێــرە  هەنــدێك كــات هــەبووە لــە ژیانمدا حەزم كردووە ئیتر لەوێدا ژیان بوەستێنم .

ئــاخر جــوانرۆ  لێــرە ژیــان ترسـێكی بــێ ســەرەتایە و ترســیش ژیـانێكی بـی كۆتـایی . لـەم وولاتـەدا دەبـێ بگـرین هـەر بگـرین لـە پێكەنینیشـــدا هـــەر دەبێـــت بگـــرین تەنانـــەت فرمێسكەكانیشـــمان ووشـــك بكـــات ئـــەبێ هـــەر بگـــرین . ئـــەزانی جـــاری وا هەیـــە گریـــانم فـــوو دەكاتـــە میزەڵانـــە رەشـــینەكەی ئاســـمان ..زیـــاد زیـــاد زیـا ئـەكا بـەڵام ناتـەقێ ، گـەر هێنـدەی كونـەكانی ئاسمان پەنجـەم هەبوایـــە هـــەموم دەگـــرتن تـــا فیرعەونـــەكانی ئێـــرە لـــە تاســـەی گریانمـــان كـــاس بوونایـــە  هـــەر ئەمانـــە منیـــان وا پـــر كـــردووە جـــوانرۆ گیـــان خۆزگـــە ئـــەو یادگـــاری یـــە ناخۆشـــیانەمان وەك نوســـیەنەكانی ســـەر تەختـــە رەشـــەكانی منـــاڵێ مەكتـــەب ئـــەبوو بمانتوانیایە بیسرینەوەو ئیتر نەیانبینینەوە .

جـوانرۆ  لـە ژیانـا سـێ جـۆر كـەس هـەن ، جۆرێكیـان تـا مـردن لـە شـتەكان تـێ ناگـەن جـۆرێكی تریـان لـە منـاڵی یـەوە فێـر ئـەكرێن و لـــە شـــتەكان تـــێ ئەگەیـــەنرێن ئەمانـــە شانســـدارەكانن ، جـــۆری سـێهەم كـە ئـەوە مـنم ئەوانـە ئـەزموون و رۆژگـار فێریـان ئـەكات جـــا وا وەیـــلا لـــەوەی ئـــەزموون فێـــری ئـــەكا ئـــەو كەســـە قـــەت

شـتەکانی بیـر ناچێتـەوە هێنـدەی ئـازار بـە فیربوونەکـەوە چەشـتووە ، هەنـــدێك شـــتیش هەیـــە کاتێـــك تێیدەگـــەیت ئیتـــر تێگەیشـــتن و تێنەگیشـــتنەکە هـــیچ لـــە دۆخەکـــە ناگۆرێـــت ئیتـــر هـــەر شـــتەو یاســـایەکی هەیـــە لـــە ژیانـــدا بـــەڵام مـــن بـــروام وایـــە ئەگـــەر گوێڕایـەڵی هـەموو یاسـاکان ببیـت ئـەوا هـەموو خۆشـییەکانت لـە کیس دەچێت .

جـوانرۆ : دە تـۆ بـا شـتێك بـۆ بگێرمـەوە لەسـەر ئـەو عەقڵـەی بـاس کـــرد بـــۆ رامیـــار ، ئـــەڵێن پیاوێـــك هـــەبوو رۆژێکیـــان چـــوو بـــۆ حـــەمامی دەروە ، کـــە خـــۆی داکـــەن ســـەیرێکی قـــونی خـــۆی کـــرد ووتـــی بـــە ســـاقەی عـــەقڵم بـــم شەســـت و پێـــنج ســـاڵ عومرمـــە و نەمهێشـتووە یـەك شـەق بـەر کـەوێ ، کـابرای نـاتر گـوێ ی لـەم قســـانە ئـــەبێت چـــاوەرێ ئـــەکات تـــا کـــابرا شـــتەکانی لەســـەر جورنەیـەك دا ئـەنێت ، پاشـان ئەچێتـە لای و ئـەڵێت ئـەو جورنەیـە چـۆڵ بکـە هـی منـە خـۆم لەوێـد ئەشـۆم ، کـابرا بـە بـێ دەنگـی چـۆلی کـرد وە چـووە جورنەیـەکی تـر وە ناترەکـە ووتـی ئـەوەش چـۆڵ بکـە هـی براکەمـە وە کـابرا چـووە دانەیـەکی تـر نـاتر پـێ ی ووت ئـەوش چـۆڵ بکـە هـی باوکمـە بـەم شـێوەیە تـا یـەك جورنـە مایـەوە کـابرا چـووە ئـەوەیان ناترەکـە پـێ ی ووت ئـەوش چـۆڵ

بکـە ، کـابرا ووتــی ئەمــەیان بـۆ ناترەکــە ووتــی بــە نێرەکــەری ، کـابرا شـتەکانی کـۆکردەوەو ووتـی بـە خـوا دیـارە ئـەمرۆ نسـیبەکەم نـی یـە خـۆم بشـۆم ، کـابرای نـاتر ووتـی ئـەك مـاڵ بـە قـور گیـرێ وەڵا تـۆ سـاحێبی ئـەم عەقڵـە بیـت نـەك شەسـت ە پێـنج سـەدو سـی ساڵ عومر بێت شەق ناخۆی قەت .

بـە پێکەنینـەوە بـە واتـا کـابرا بـێ دەنـگ بـوو عەقڵەکـەی نـەگۆری ، ئـاخر سـەیرکە مـن لەگـەڵ ئـەوە نـیم مـرۆڤ عـەقڵی جێگیـر بێـت بـــەڵام پێویســـتە گۆرانکـــاری لــــە خـــودی مرۆڤـــدا ســـەرەنجامی کارلێکـــەکانی دەرەوەو بیرکردنـــەوەی خـــۆی بێـــت بـــە هاوکـــاری سـەرچاوەی بـاش لـە خوێندنـەوە گوتـار و گفتـو گـۆ دەنـا مـن ئـەڵێم پێویست مرۆڤ هەمیشە لە گۆراندا بێت .

جــوانرۆ : وەڵا هــەر هــیچ تــێ نەگەیشــتم بــەس ئەوەنــدە ئــەزانم ئەبێ من لێرەوە برۆم کاتێکی کە ئەتبینمەوە .

کـاردۆ: باشـە کـاتێکی بـاش بـۆ تـۆ بـەس هـا ئـەمجارە کـە هـاتی بـۆ ماڵمان لە جەرەسەکە بدەی باشە .

جـوانرۆ : بـەدەم هـاوارەوە باشـە ئەگـەر بیـرم مـا ، بـای بـەس لێـی نەکەیتەوە تا دێم .

هــەنگاوەکانم هێــدی هێــدی بــەرەو لای مــاڵی هێلینیــان دەبــردم خۆشــم نــازانم بــۆ ، پــێ ئــەچوو حــەزێکی هەرزەکارانــە بــێ یــا جۆرێـك لـە هەسـت كـردن بـە تـاوان و پەشـیمانی یـە كـە لـە منـاڵی یـەوە فێریـان كـردووین لـە سـەری پەشـیمانیم لـەو هـەموو گریـان و ئازارانـەی پێم بەخشـی ، مـن بـروام وایـە دڵـی ئـافرەت لـە بلـوری چــرا ناســکترە زۆر زوو ئەشــکێ . بــە دەم خــەیاڵی خۆشــمەوە ئــەمووت مــن بــووم دەمــووت ســەرنجێك و هــەزار پرســیار ، پرســیارێك و هــەزار گومــان گومانێــك و هــەزار فــەنابوون فــەنابوونیك و یــەك مــردن ، بــەڵام ئێســتا مردنێــك و هــەزار سـەرنج . ئـەمووت باشـە ئێمـە ئێسـتا لـە نـاو ئـەم هـەموو گومانانـە ی رۆحمانــدا چــی بکــەین ، مــن چــی بــە هێلــین بڵــیم خۆزگــە هــەرگیز کەســمان خــۆش نەویســتایە ئــەو کــات کــەمتر ئازارمــان دەچـە شـت . بـۆ ئـەبێ عەشـق لـەم وڵاتـە هەمیشـە ئـازار بـدرێ؟ بـۆ ئـەبێ عاشـقەکان هەمیشـە برینـدارەکان بـن ؟ بـۆ ئـەبێ پاداشـتی خۆشەویستی مەینەتی بێت ، تا کەی ئێمە وا بین ، تا کەی؟

جـاری وا هەیـە هەسـت ئەکـەم عەشـق بـەس لـە سـەر تێکسـت و نوسـینەکاندا هـەبێت ، لێـرە و لەوێـدا خـۆی شـاردۆتەوە تـا ئـازار نــەدرێ .عەشــق ئــەو شــتەیە كــە قــەت نــاوێری بیڵــی ی هەمیشــە

ئـەو شتەشــە کـە خۆشـت ئـەوەێ یـان حـەزت لـێ یـە یـان عاشـقیت بـەڵام نـاتوانی بێڵـی یـان نـاوێری بیلێیـی ، هەمیشـە ئـازارت ئـەدات ئـازارێکی زۆر زۆر جـار نهێنـی یـەکان زیـاتر ئـازاری مـرۆڤ ئەدەن لە دیارەکان.

بـە بـەر قـاپی ماڵـە کەیانـدا تێپـەریم و هەسـتم بـە بـۆنی ئـەو کـرد ووتـم بەسـمە بـۆ ئەمشـەو خـەون بـە ئەسـتێرەوە ببیـنم . گەرامـەوە ماڵـــەوە وەك هەمیشــــە تـــەنیا پـــێش هـــەموو شـــتێ ویســـتم پـــێش نووستن کەمێك قسە لەگەڵ خودا بکەم .

شـــەو بـــاش "خـــودا"م.. ئەمشـــەو هێنـــدەی هەمـــوو تەنیـــای یـــەکان تەنیام.

خـۆم لە کـونجێکی تـاریکی شـوێنێکی مەیـلەو تـاراوگەیەک نـاوە و بەنـاو خۆمـدا ڕۆچـووم، لەگـەڵ بوونـەکانی خۆمـدا رووم لـە تۆیـە .

بیـــر لەوە ئەکەمەوە ، بـــۆ ئەبـــێ بـــاجی گرنگـــی پێـــدانێکی زۆر ئـــازار چەشـــتنێکی بەم زۆرە بـــێ ؟بـــۆ ئـــەبێ گـــەرانێکی زۆر هـــیچ مایەیەکی نەبێ ؟!

ئەمـڕۆ بە درێژایــی ڕێگــا دیوارگەلێــک و بیابــان گەلــێکم بینــی کە ناویان باغ و گوڵزار بوو.

ڕێگــایەکی زۆرم تەی کــرد بەڵام هەر چـــاو و گــوێ و هەســـت و ڕۆحم لای تۆ بوو،من تۆ نیم .

خۆمم بەڵام ئەمەوێ بۆنی تۆم لێ بێ .

ئەزانـــی لەبەر خــۆمەوە گــۆرانیم ئەوتەوە ئەمــوت بەڵکــو بەگوێــت بگات .

خودای من .

کەس هێنـــدەی ئەوەی لە ڕۆحـــی مندایـــە گرنگیـــت پـــێ نـــادات گومـــــانم نـــیە ، کەچـــی هەر تاوێـــک لە عەرش دانەبەزیـــت و بزەیەکت بەدەممەوە نەکرد .

ئەزانـــی خـــودا ، ئەوەی ئـــازارم ئەدا نیـــانی و ســـۆزی تـــۆیە بـــۆ ئەوانەی بە درۆ زیکـــرت ئەکەن و لە ترســـی تەنیـــایی خۆیـــان نـــاوت ئەڵێـــنەوە و موتـــاڵای وتنەکانـــت ئەکـــەن و گـــوێ رایەڵـــی چرپەکانتن .

بەڵام مـــن لەبەر گرنگیـــت لەبەر خـــۆت هەســـتت پـــێ ئەكەم و خۆشم ئەوێیت

خـــودا هـــیچ نـــزایەک نـــاکەم ،. تەنیـــا داوای مشـــتێک ســـۆز و بزەیەكـــی نەرم لەو لێـــوانەت ئەكەم تـــا ڕۆحـــی شـــەقار شـــەقارم بژیێنێتەوە..

شـــەوت بـــاش "خـــودا"م نـــازانم ئـــاخۆ نـــاوت خودایـــە یـــان نـــاوێكی تـــرت هەیـــە نـــازانم كـــێ ئـــەم نـــاوەی لێناویـــت ، لەهـــەر شـــوێنێك ناوێكـت بـۆ دانـراوە لەوانەیـە وەك ئێمـە تـۆش ناوەكـانی خـۆت بـە دڵ نـــەبێ ، مـــن نـــازانم نـــاوت چـــی یـــە لاشـــم گرنـــگ نـــی یـــە خۆشەویستی پێویستی بە ناو ناونیشان نی یە .

زیکرت دەکەم!

مـن ئـاوا تـۆم خـۆش دەوێ ئـەزانم تـۆش مـن خـۆش دەوێ بـەڵام كـەی یـەك دەبینـین ، ئەمـەیان نـازانم ئیتـر نـازانم تـۆ ئـەیزانی یـان نـا ، ئـای خوایـە، چەنـد بیـری خـۆم دەكـەم، بـەبێ هـیچ پاشـبینی و پێشـــبینی كردنێـــك، ئـــاخر مـــن قـــەت نـــەمزانیوە ڕوونـــاك بیـــر بكەمـــەوە، قـــەت نـــەمتوانیوە یادەوەرییـــەكی خـــۆش لەگـــەڵ خۆمـــدا هـەڵبگرم و جارجـار داڵغـەمی پـێ ئاسـوودە بكـەم، پـێم وایـە ئەگـەر

بیرکردنـــەوە پشتڕاســـتکردنەوەی بـــوون بێـــت، مەحووکـــەرەوەی تەنیاییشە .

لـەم قسـانەدا بـووم لـەنیا تەلـەفونی بـۆ کـردم ، هەڵبەتـە لـەنیا کچێکـی شـــۆخ و شـــەنگی زۆر جـــوان بـــوو وێنەکێشـــێکی بلیمـــەتیش بـــوو فلچـەکانی هـەزارەها رۆمـان بـوون لـە رەنگـدا ، هـەر لـە منـاڵی یـــەوە ژیـــانێکی قورســـی پـــر نەهامـــەتی هـــەبوو ، زۆری حـــەز ئـــەکرد مـــن هـــاورێ یـــەتی بکـــەم بۆیـــە منـــیش هەمیشـــە بەختـــەوەر بـووم بـە هـاورێ یـەتی ئـەو هەرچەنـدە زۆر مانـدوو بـووم بـەڵام تەلەفونەکـەم هـەڵگرت ووتـم ئـەلو لـەنیا باشـی . ووتـی مـن باشـم ئـەی تـۆ چـۆنی کـاردۆ دەنـگ و باسـت . یەکسـەر ووتـم : وەڵا مـن ماندووم لەنیا گیان ماندوو .

دەزانی ماندوو بون چۆنە ؟ نا نایزانی .

لەنیا : من نایزانم ؟

کـــاردۆ : بـــەڵی لـــەنیا گیـــان مانـــدوو بونێـــك لـــە نـــاو دەمارەکـــانی جەسـتەمەوە نـا بـەڵکو لـە نـاو هەناسـەکانما لـە نـاو ترپـەکانی دڵمـا ، مانـدووبونێك کـە زۆر جـار وات لـێ ئـەکات ناسـنامەکەی خۆشـت بیـر بچێتـەوە وات لـێ ئـەکات نـەزانی تـۆ لـە چ وڵاتێکـدا ئـەژیت

مانـدوو بونێـك نـەك جەسـتە بـەڵكو رۆحیشـت مانـدوو شـەكەت بێـت من ئێستا بەو جۆرە ماندووم .

لـەنیا تـۆ هێشـتا خـەمی گەورەت بە شـانەوە نەبـووە و چـاوەڕوانی بەدیاركۆلانەكـانەوە خـۆری پـێ ئـاوا نەكردوویـت تـۆ هێشـتا گۆرانیـت بـۆ دۆڕانـی خـۆت نەوتـوە تـۆ هێشـتا ( كـات ) یەخەی كراسـەكەی پـێ نەدڕیویـت و لە بەتاڵیـا نەخشـەی شـەقامەكانت نەكێشاوە .

تۆ چوزانی ماندوو بون بون چیە ؟؟ هەرگیز لێی تێ ناگەی ؟

لـەنیا : مـن نـازانم ؟ ئـای كـاردۆ گیـان ئـەی مـن نـەزانم كـێ ئـەزانێ ؟ بـا چـۆن نـازانم مانـدوو بـوون چۆنـە ئەسـڵەن كـەس هێنـدەی مـن نـازانێ ، مـن ئەوتـەی بـاوكم مـردووە ئـەزانی چـیم مانـدوێتی و حەسـرەت و خـەم چەشـتووە ، مـن زۆر جـار هەستەكەم دروست كەری ماندوێتی و حەسرەت منم.

كـاردۆ : ئـەزانم بـە خـوا لـەنیا راسـت ئەكـەیت بـەس مانـدوێتی خـۆم خەریكـە گـەمژەو گێـژم ئـەكات ببـورە خۆشـم نـازانم چـی دەڵێم .

لـەنیا : باشـە ببـورە نـەم زانـی هێنـدە مانـدویت ، کەواتـە بـا ئێسـتا لـە کاتــت زۆر نــەگرم کــاتی پشــووە ببــورە ئــەزانم بــەڵام ئــەتوانم بــەیانی بتبیـنم کــاردۆ حەزەکــەم تــۆزێ قســە بکــەین ئەگــەر بتــوانی کــاتێکم بـۆ دابنێیـت زۆر سوپاسـت ئەکـەم ، بەراسـتی پێویسـتم پێتـە .

کــاردۆ : بەســەر چــاو بــەیانی کــە لــە کــار تــەواو بویــت لــە کافیکــەی لای مــاڵی خۆمــان یــەك ئــەبینین بــەڵام ئێســتا مانــدووم زۆر ئــەبێت برۆم بنووم ، بە دڵنیایی بەیانی قسە ئەکەینەوە بێ خەم بە .

لــــەوە ئــــەچو لــــەنیا کــــەمێ بێتاقــــەت بــــووبێ بــــە هەناســــەی قســـەکردنەکەیا هەســـتم پێکـــرد لەوانەشـــە ئـــەو بێتاقـــەتی یـــەی هۆکــارێکی تاییــەتی هــەبوبێ هــەر بــۆ ئــەو مەبەســتەش بیــەوێت بەیانی بمبینێ هەر بۆیە هەر حەزی دەکرد بەیانی بێت .

لـەنیا : باشـە دوای کـاتژمێر سـێ چاوەڕێـت ئەکـەم لـەوێ ، شـەوت شاد هیوام وایە پشوویەکی باش وەرگریت و ئارام بنویت .

کاردۆ: زۆر سوپاس هەروەها بۆ تۆش شەوێکی پر ئارامی.

کــە تەلەفونەکــەم داخســـتەوە  قســـەیەکی لـــەنیا م هاتـــەوە یـــاد کـــە هەمیشــە پــێ ی ئــەووتم ، ئەگــەر مــن دوعــا بکــەم تــۆ ببیــنم ، تــۆش دوعــا بکــەی مــن نــەبینی ئــاخۆ خــوا گــوێ بــو دوعاکــەی کاممــان بگرێ ، منیش ئەمووت کەسمان .. ئەویش ئەیوت بۆ ؟

هــەموو جــارێکیش نــەم ئــەزانی پــێ ی بڵــێم بــۆ ؟ تــەنها بێــدەنگ ئەبووم و سەیرێکم ئەکرد.

تــەواوا شــەکەتم ئیتــر ئــەبێ بنــووم لەگــەڵ ئــەوەی کــاتی نوســتنیش ماویەتی بەڵام ماندووم ماندوو زۆر .

لــەتێکی شــەو تێپــەری ئەونــدەی تیکــەیك خــەو چــووە چاوەکــانم ، لــە پــردا خەبــەرم بــووەوەو خەوەکــەش بــە خێــرای ماڵئــاوای لێکــردم و جێیهێشــتم وەك ئــەوەی ئــەویش حــەز نــەکا کــەمێ پێکــەوە بــین ئەمشــەو، بۆیــە ناچــار هەســتام دەســتم کــرد بــە چــا خواردنــەوە ، لــە تــەنیایی شــەودا چــا هــاورێ یــەکی باشــە  خــۆی تــوێژینەوەیەک هەیــە دەڵێــت مــرۆڤ هەتــاڕادەی زیرەکــی زیاتربێــت شــەوانە درەنگترخەویــان لــێ دەکەوێــت ئەمــەش قوربەســەریمە پــێ ئــەچێت بۆ بابەتی نەنوستنەکە من زیرەکەکە بم .

وای وەرە لــە ئێســتاوە بــە خەبــەر بیــت ئــاخر کــاتژمێر چــواری شــەوە ئێســتا مــن چــی بکــەم ، جــاران ئــەمتوانی بخوێنمــەوە ئــەو کــات چێــژم وەردەگــرت لــە رۆمــان و شــیعر و نوســینەکان کــەچی ئێستا هەسـت ئەکـەم ووشـە نانسـم ئـەو کـات رسـتەکان خۆیـان لـە بــەر چاومــا ســەمایان دەکــرد کــەچی ئێســتا هەســتەکەم هــەموو کتێبــەکانم لــێم تــۆراون ، نــازانم بــۆ پیتــێکم بــۆ ناخوێنرێتــەوە ، بێـزارم بێـزار ، بێزاریـەك ئـەم ساتە تەنیایانـەی بـوونم بـە چێـوەی مەرگــدا ئەســوێنێ ، تــەنیایی یــەکانی بونیشــم رۆژ لــە دوای رۆژ زیــاتر ئــەبن و منــیش زۆرتــر هــۆگر ئــەبم پێیانــەوە ، هەســتەکەم بــوون و نــەبوونم یەکســانن لــە هاوکێشــەیەکدا ، زۆر جــار بیــرم لــەوە کردۆتــەوە مــن لێــرە بمێنمــەوە یــان بــرۆم ، جیــاواز یــەکی ئــەوتۆی نــەبووە بــۆ مــن بــەڵام جیــاوازی یــەکی زۆری هەیــە بــۆ کەسانی تر وەك هێلین و نەنکم و جوانرۆ و باوکم .

هەرچەنـد دەکـەم ، نـاتوانم چـن بکەمـە سـنگمەوە و لـە نـاوەوە دڵـم دەربیێنــم هەرچەنــد ئەکــەم .. نــاتوانم هــەموو بیرەوەریــەکانم بسـوتێنم لـە ناخمـا هـەموو ئـەو شـەقامانەی پیاسـەم پێـدا کـردوون کۆیــان بکەمــەوەو گۆرەپانێکیــان لــێ دروســت بکــەم لەوێــدا هــەرچی حــەزم هەیــە لــە خــاچی بــدەم ئاوێنــەکانی روخســارم

وێنـــەکانی نـــاو چوارچێوەکـــانم هـــەمووی بشـــکێنم ...هەرچـــەن ئەکـــەم .. نـــاتوانم نـــاتوانم خـــۆم لـــە خـــۆم دوور خەمـــەوە نـــاتوانم لەناو ئەم عەشقەدا خۆم فێری رق بکەم .

هەرچەنـــد ئەکـــەم نـــاتوانم ، ئەبوایـــە مـــن لـــە مێـــژەوە برۆشـــتمایە ئەبوایـــە زوتـــر تـــەنیا بوومایـــە ئـــەو ئـــازارەم نەبەخشـــیایەوە بەســـەر خۆشەویستەکانما ، بەڵام ناتوانم .

کـــات تێپـــەری کـــرد و زەردەی خـــۆر بـــەدەر کـــەوت شـــکور میلـــی کاتژمێرەکـــە خـــۆی لـــە ســـەعات حـــەوت و نیـــو دا ، پـــێ ئـــەچوو ئـــەو نیـــو کـــاتژمێرە خـــەو بـــە میـــوانی گەرابێتـــەوە لام و چاوەکـــانم قـــورس بـــوون بـــەڵام ئیترکـــات پێویســـتی کـــرد هەســـتم راســـتە ئـــەو خـــەوە میوانـــە خۆشـــی یـــەکی تایبـــەتی هەیـــە بـــەڵام هـــەر شـــتێك لـــە دۆخـــی خـــۆی زیـــاتر بێـــت زەرەرمەنـــدیت تـــوش دەکـــات وەك ئـــەوەی کـــە لـــە رادەی خـــۆی کـــەمتر بێـــت هەســـتم ئـــەکرد بێمـــە دەرەوە لـــە نـــاو خۆمـــا بچـــم بـــۆ دەوامەکـــەم باشـــترە ، بچمـــەوە نـــاو ئـــەو ژیـــان و دەوامـــەی هـــەموو رۆژێـــك هـــەمان قەوانـــە و دووبـــارە دەبێتـــەوە هـــەمان دەمـــوو چاوەکـــان هـــەمان کاراکتـــەرەکانی دوێنـــێ و پێـــرێ ، ئـــەوەی ئـــەگۆرێت تـــەنها جـــۆرو بابـــەتی قســـە کانـــە کـــە بـــە پـــێ ی رووداوەکـــانی رۆژەکـــە بـــاس دەکـــرێن ، ئیتـــر خـــۆ ژیـــانیش بـــە

شـێوەیەکی گشـتی هـەمان شـتە بـەڵام لای ئێمـە زیـاتر هۆکەشـی ئەگەرێتـەوە بـۆ ئـەوەی لـە لای ئێمـە کۆمـەڵێك بـێ دەمـاغ وڵات بــەرێوە ئەبــەن و ئەوانــەی بەرنامــەی ژیانمــان بــۆ دائــەنێن ئەوانــەی رابەرایــەتیمان دەکــەن خۆیــان ســەرتاپا نــوقمی گێلــین ، ئێمـەش لـە سـایەی عـەقلی خۆمـان گەیشـتین بـەم رۆژەی ئێسـتا تـێ ی کـەوتووین بـە هـۆی گـەمژەی ئێمـەوە هـەرچی گەنـدەڵ و دزە گەیشــتە دەســەڵات ، هــەر ئێمــەیان گەوجانــدووە لــە هــەموو بوارەکانــدا ، هەرچەنــدە ئــەوەی وای لــەوان کــردووە وامــان لــێ بکـەن ئەوەیـە کـە هەمیشـە داواکـاری خـەڵك لـە خـوار ئاسـتی بینینـی دەســەڵاتەوە بــووە، لــەم وڵاتــەی منــدا بــێ دەماغــەکان ئەونــدە زۆرن لــە ژمــاردن نایــەن هێنــدەی پشـیلە برسـی یــەکانن هێنــدەی ئــەو چۆلەکانــەن کــە کەســێ نــەماوە گــوێ لــە جریــوەی بــەیانیان بگــرێ هێنــدەی ریشــۆڵەکانی جــارانن کــە ئێســتا بــە میــوانیش نایەنــەوە لامــان لــە بــەفردا و ســەمامان بــۆ ناکــەن لەســەر شەختەکان .!

ئەگــەر وورد ســەیری چڵکــاو خــۆر و کۆیلــە ترسـنۆك دز بکــەی پـرە پـر لـەم وڵاتـە ، تـەنها یـەك جـار بیژمێـرە ژمـارەی دزەکـان لێـرە لـە ژمـارەی شـەمەندەفەرکانی جیهـان زیـاترن ، دزەکـان لـە

وڵاتــی منــدا پاشــان حــەکیمن بازرگــانن و دەوڵامەنــدن ، دزەکــانی وڵاتــی مــن زۆریــان چــالاکوانی سیاســی و چــاودێری سیاســی و پیــاوی سیاســی و ســەرکردەی سیاســین دزەکــانی وڵاتــی مــن لــە دزی هــیچ شــوێنێکی دنیــا نــاچن ...ئــاخر خــۆ کێشــەی دز بــوون ئەوەیــە کــە کەســی دز، هەر دزانــە بیرئەکــاتەوە ، ئەمــەش وا ئــەکات هــەموو دەرەوەی خــۆی بکــات بــە دز تەنانــەت خــەوناکانیش دزراون لێــرە ، یــان ئــەوەتا لەبــەر ئــەوەی لــە بنەرەتــدا خۆیــان دۆراون و وون بــوون لــە هــەموو کایەکانــدا بۆیــە وا ئەکــەن تــا دەرەوە وا لــێ بکــەن و هەســت بــە کــەمی خۆیــان نەکــەن و دەروەشــیان وەك خۆیــان دۆراو و وونبــوو بکــەن .
هەمیشــە پێیــان ئــەوتم ئەگــەر دز لــە ســەر دزێتــی بــەردەوام بێــت لــە کۆتــایی دەبــێ بــە پاشــا بــەڵام مـن بـزانم لـەم وڵاتـەی منـدا نـابێ بـە تەرماشـیش ئـاخر خـۆ هـەر پـارە دزیـن دزی نـی یـە لێـرە هـەموو شــتێ ئــەدزن ، پێکــەنین ئــەدزن لــە لێوەکــان ، کــور ئــەدزن لــە دایکــی و ئەیــدەن بــە کوشــت ، خــەون و ئــاواتی کچــان ئــەدزن بــە کــۆچی گــەنجانی وڵاتەکــەیان خەونــە پەمــەیی یــەکانیان رەش ئەکــەن ، یاریــە جوانــەکانی منــاڵان ئــەدزن ، تەنانــەت لێــرە ووشەش ئەدزن وێنەش ئەدزن .

بەدەم بیرکردنەوەو قسە لەگەڵ خۆمدا گەیشتمە دەوام .

ئێمــە دەوامەکــەمان لــە دائیرەیەکــدا بــوو لــەناو خانووەیەکــدا کــە بــەکریێ بۆیــان گرتبــوین مــن لــە ژوری چێشــتخانەکە دەوامــم ئــەکرد پێشــتریش لــە ژوری نوســتنی قــاتی ســەرەوە بــووم بۆیــە زۆر جــار کــە ئــەهاتم بــۆ دەوام هەســتم بــە برســێتی و خــەواڵوی ئــەکرد جــا وەك ماڵــەوەش کارەبامــان نــەبوو ئەبوایــە زوو زوو فەراشــەکە بچێــت موەلیدەکــە هەڵداتــەوە ســەیرەکە لــەوەدا بــوو هــەموو رۆژێ ئاگامــان لــێ بــوو دراوســێکان چ چێشــتێکیان لــێ ئــەنا تەنانــەت هــەموو جــار گۆشــتی خێــر و ناوســاجی خێریشــمان بۆ ئەهات .

گەیشــتمە دائیرەکــەم ئــەو رۆژە خــەریکی گــۆرینی ئــاڵا رزیــوە کۆنەکــە بــوون و دانەیــەکی تازەیــان هێنــابوو داینــێن لــەوە ئــەچوو رۆژی ئـاَلا نزیـك بـێ بۆیـە سـەیرێکم کـردوو ووتـم ئـای لـەم ئـاڵا نەگبەتــەی مــن چــەن نــان و نــەوتی پێــوە ئــەخوریێ خۆشــی رۆژ دوای رۆژ زیـاتر ئـەرزێ ، جـا ئـەوەی سـەیرە لـەم دائیرانـەدا لـە ســەرەتایی چونــە ژورەوەو هــەمیش دووبــارە دەبێتــەوە ئەوەیــە کــە هــەموو بەیانیــەکیش ئــەبێ بــەیانی بــاش بکــەی لــە هــەمووی وەك ئــەوەی ســاڵێك بێــت یــەکترتان نــەبینیبێ یــان وەك ئــەوەی بــەو

بـــەیانی باشـــەی تـــۆ ئیتـــر رۆژەکـــەی ئـــەوان پـــر ببێـــت لـــە بەختەوەری.

مـن لـەو دائیرەیـە کـاری کـارگێریم ئـەکرد رێـك پێچەوانـەی ئـەو وویسـتەی خـۆم بـوو مـن هـەر لـە سـەرەتاکانی خوێندنـەوە حـەزم بـە کـاری دکتـۆری ئـەکرد بـروا بکـە لەبـەر پارەکـەی نـا ئـەزانم لێـرە بیرکردنـەوەی خەڵکەکـە بـۆ کـاری دکتـۆری لەبـەر پـارەی زۆرێتـی نـا مـن حـەزم بـە زانسـتەکەی بـوو بەراسـتی تامـەزرۆی زانسـتی لەشـی مـرۆڤ بـووم بـەڵام بـەهۆی بـارودخی ئـابووری و کۆمەڵایـەتیم هـەر زوو ئـەو حـەزە بـە نـاخی زەوی دا چـوو ، خـۆ ئـەو حـەزەم لـە چـاوو لێکـەری یـەوە نـەبوو چونکـە لـەم وڵاتـە بۆئـەوەی بتـوانی بژیـت ئـەبێت دکتـۆر بیـت یـان لێپرسـراو بیـت ئیتـر هەنـدێکیان وەك قەسـاب لەسـەر خـوێنی خەڵکەکـە دەژیـن هەندێکیشـیان ئـەو فریشـتەیەن کـە دەگـەن بـە هانـای مرۆڤـەوە بـە ئـەوەی لێپرسـراوەکانیش هەمیشـە خـوێنی خـەڵك ئـەخۆن ئـەوان باشـیان نـی یـە بـە هـەر حـاڵ ، ئـەو فەمانبەرانـەی لـە ژورەکـەی مـن بـوون کەسـانێکی تێکەڵـەیی ئـەم کۆمەڵگایـە بـوون هـەر یەکـەو جۆرێـك بـوو ، یـەکێکیان نـاوی کـاك محمـود بـوو ئـەم پیـاوە کابرایـەکی قـۆز بـوو کەشـخە بـوو زۆر هەمیشـە بـۆنی عەترەکـەی

بــه ژورەكــەدا بـڵاو ئــەبووەوە ئــەم پیــاوە قــۆزە ژنــی هــەبوو ســێ منداڵیشــی هــەبوو راســتی یەكــەی ئــەم پیــاوە منداڵــەكانی زۆر خــۆش ئەویســت و هەمیشــە باســی ئــەكردن بــەڵام هــەرگیز باســی دایكــی منداڵــەكانی نــەدەكرد جــا ئیتــر نــازانم لــە خۆشەویســتی و ئیـرەی بـوو یـان لـە رق و بێـزاری بـوو ئـەم پیـاوە قـەت موویـەكی ریــش پێــوە نــەبینی هەمیشــە ئــەتووت ســەربازە كۆنــەكانی كــاتی رژێمــە هــەموو بــەیانی یــەك ریشــی ئەتاشــی و پێڵاوەكــانی بۆیــاخ دەكـــرد وە پێڵاوەكانیشـــی هەمیشـــە بریقـــەی ئـــەهات هەمیشـــە قاتەكانیشــی پــاك و خــاوێنی یــەكی لــە رادە بــەدەری پێــوە دیــا بــوو ،ئــەوەی مــن ئــەمزانی ودركــم پــی كردبــوو ئەشــێ لەوانەیــە كەســانی تــریش هەســتیان پــێ كردبــێ كــە ئــەم كــاك محمــودە پەیوەنـدی یـەكی نهێنـی هـەبوو لەگـەڵ گـێلاس خـان دا كـە هـەر لـە ژورەكــەی خۆمــان بــوو ئــەویش ئــافرەتێكی هــاری خــۆ دەرخــەر بـوو هەمیشـە حـەزی ئـەكرد تـەداخولی هـەموو شـتێك بكـات خـۆی كردبــوو بــە ســەر دەســتەی ژوورەكــە جــا ســەیرەكە لــەوەدا بــوو خــۆی بــە هــەموو دنیــا ناگۆریــەوە ئــەمیش تەنانــەت بــۆ دائیــرە ئــاڵتونی ئــەكرد بــە خۆیــەوە هەمیشــە مكیاجەكەشــی لــێ ی ئــەرژا جــا چــۆن مكیاژێــك لــەو جۆرانــەی هەســت ئــەكرد دەم و چــاووی گـــەچ كـــاری كرابـــوو ، ئـــەم ئافرەتـــە بونـــەوەرێكی ســـەیر بـــوو

شــەرمی لــە هـیچ  نــەبوو بــەخوا راسـتی یەکـەی کەسـیش دەرەقـەتی نـــەهات هـــاری و دەمەکـــەی لـــە رادە بـــە دەر بـــوو ،جارێکیـــان ئازایـەتیم هێنایـە بـەر خـۆم و پرسیاری ئـەوەم لـە کـاك محمـود کـرد بــەس بەشـێوەیەکی سیاسـیانە پـێم ووت : هەسـتەکەم تـۆ زیـاد لــە پێویسـت  گرنگـی ئـەدەیت بـە گـێلاس خـان ، جـا خـۆ مـرۆڤیش وایـە هـەر ئەوەنـدەی بابـەتێکت بـاس کـرد لای کـە خـۆی پـێ ی خـۆش بێـت ئیتـر خـۆی ئەچێتـە نـاو بابەتەکـەوە ، بۆیـە پـێم ووت : مـن وا هەسـتەکەم وە لەلایـەن ئەویشـەوە بـە هـەمان شـێوە  دڵسـۆز و وەفـــادارە بەرامبـــەرت هەســـتەکەم شـــتێك هەیـــە  لـــە نێوانتانـــا هەمیشـــە گرنگیـــت پـــێ ئـــەدات تەنانـــەت زۆر جـــار بـــە تایبـــەتی خـــواردن بـــۆ تـــۆ ئـــەهێنێ و زۆر جـــاریش خـــۆی چاکـــەت بـــۆ تـــێ ئـەکات جـا ئیتـر نـازانم هەسـتەکانم راسـتە یـان نـا مـن پـێم خۆشـە متمانــەت بــە مــن هــەبێ . ئــەویش ووتــی مــن بەراســتی متمانــەم پێــت هەیــە و ئــەزانم تــۆ کەسـێکی چۆنیــت بــەس ئــاخر براکـــەم کـەس لـە حـاڵی کـەس نـازانێ خـۆ بـەم قـات و ریباتـە نـی یـە کـە ئاســودە یــت بـــەیان بکـــا مـــەرج نـــی یـــە ئـــەو پۆشـــتەیەی دەرەوە هــەمان پۆشـتەی ناخمـان بێـت ، کێشـەی ئێمـە ئەوەیـە  وەك کتێـب لــە بەرگەکەیــەوە ئەروانینــە کەســەکان ئەگــەر جــوان نــەبوو ئیتــر نــازانین ناواخنەکـەی چـی تێدایـە  راسـتی یەکـەی مـن  ژنەکـەی

خـــۆم لـــە جـــێ ی نەبوانـــە هەســـت بـــە بـــوونی ناکـــەم هەســـت بـــە پێگـــەی ناکـــەم لـــە ژیانمـــا ئـــەو نـــاتوانێ هەســـت و ســـۆزم بـــداتێ نـــاتوانێ هەســـتێکی پیاوانـــەم بـــداتێ هەمیشـــە هـــەر یەکـــەمان لـــە جەمســـەرێکین هیچمـــان تێگەیشـــتمان نـــی یـــە بەرامبـــەر یـــەك بـــە تایبـــەتی ئـــەو لـــە مـــن تێناگـــات وە نایـــەوێ تێبگـــات تەنانـــەت ویســـتی خواردنەکانیشـــمان هـــەر ســـفرە تەنانـــەت زۆر جـــار ویســـتومە ئەمانـــەی پـــێ بلـــێم بـــەڵام سـوودی نـــەبووە پاشـــان ووتومـــە بۆباســـی ترس و ئازارەکانی خۆم بکەم

خـــۆ ئەو نەدڵـــی دادەچەڵەکـــێ وە نەپـــێمەوە هـــیلاك دەبێـــت ، لەهەمـــوی کـــاریگەرتر ئەوەیە نەتێـــدەگات ، ئیتـــر منـــیش بێـــدەنگیم لـــێ کـــردوە مـــرۆڤ زۆرجـــار بێـــدەنگ دەبێـــت لەئاســـت هەنـــدێک شتدا جونکە دەزانێت کەئیترقسە هیچ شتێک ناگۆڕێت .

راســتی مــن ئــەم بابەتــەم لــە رێگــەی کەسێکی دائیرەکــەوە بیســتبوو ئـــەو کەســـە ئـــافرەتێکی ژورەکـــەی خـــوارەوە بـــوو لـــە بەشـــی ژمێریـــاری هـــەر خـــەریکی ئـــەخباری عالـــەم بـــوو ( بـــا بزانیـــت ئەگـــەر ئافرەتێـــك لـــە دائیرەکـــەتا هاورێـــت بێـــت و متمانـــەی پێـــت هـــەبێت ئـــەتوانی نهێنـــی هـــەموو کەســـەکان بزانـــی تەنانـــەت سەرجێگاکانیشـــیان ، منـــیش ئـــەم نهێنیانـــەم لـــە کـــەژاڵی هـــاورێم

ئەبیسـت هـەموو جـار ، ئـەو کەسـێکی چـالاك بـوو ئاگـای لـە خشـەی مـارو مێـروو بـوو خۆشـی هیوایـەتی بـوو بـە دوای شـتەکان دەکـەوت تـا بیدۆزێتـەوە کـەس نـەبوو لـە و دائیرەیـەدا ئـەو هـەواڵی نـەزانێ ) هـەر بۆیـە لـە رێـی کەژاڵـەوە ئـەمزانی کـە ژنەکـەی ئـەم کـاك مـەحمودە پەیونـدی یـەکی نهێنـی هەیـە لەگـەڵ دراوسـێکەی تەنیشـت خۆیـان لـە بـەر ئـەوەی ئـەو پیـاوەی ژنەکـەی کـاك محمـود پەیوەنـدی لەگـەڵی هـەبوو کـوری پـوری ئـەم بـوو چـاك ئـەیزانی چـی ئەکـەن و چـی ناکـەن هەرچەنـە ئـەوەی خێزانەکـەی کـاك محمـودیش ئـەیکرد بەشـێکی کاردانـەو بـوو لـە کۆمـەڵی رەفتـاری نەشـیاوانەی کـاك مـەحمود و ئـەو تێنەگەیشـتنەی کـە لـە نێوانیانـدا هـەبوو . بـەکورتی یەکـەی هـەمووی سـەرەنجامی ئـەو پـەروەردە سـەقەتەیە کـە لـە کۆمەڵگاکەماندایـە سـەرەنجامی تاکـەکان بـەرەو هەڵـدێرو خراپـە کاری دەبات یان بەرو دۆران و وونبونیان دەبات .

هـەرچی گـێلاس خانیشـە لـە رقـی مێردەکـەی چۆتـە ئـەم دۆخـی خۆشەویسـتی و سـۆزداری یـەوە لەگـەڵ کـاك محمـود لەبـەر ئـەوەی مێردەکـەی ئـەویش هەمیشـە لـە مەیخانـە مەسـت و سـەرخۆش بـوو پیاوێـك بـوو ئاگـای لـە ماڵ و حـاڵ نـەبوو ئاگـای لـە

پێویستی و ویستی خێزان و منداڵ نەبوو نەی ئەزانی خێزان پێویستی بە بوونە ، ئەونە خەمی بوو پارەی پێکە عارەقەکەی ئێوارەی پێ بێ ئیتر ئاگای لە قنی خۆشی نەبوو ئەمیش لە داخی ژیانە پرنەهامەتی یەکەی گێلاسی خێزانی وای لێهاتبوو بۆیە ئەوانیش هەر ئەوەنە بوو لە تەسکەرەیا خێزان بوون دەنا وەك كەژاڵ ئەیووت هەموو بەتانی یەکانی ماڵیان یەك نەفەری یە لەگەڵ ئەوەش گێلاس خان نەی ئەویست ماڵ لە خۆی تێك بدات کەسێکی زۆرزان بوو ئەیویست لە هەموو لایەك بخوات ، لەبەر کومەڵگاکەشی و منداڵاکانی هەمیشە لە کۆتادا ئەگەرایەوە پاراستنی ماڵەکەی ، ئیتر بەم شێوەیە هەر کەسە بە جۆرێك بۆشایی یە دەرونی یەکانی خۆی پر ئەکردەوە هەر یەکەشیان خۆی بە خاوەن ماف ئەزانی خۆی بە حەق ئەزانی جا ئیتر نازانم ئاخۆ هەموو حەقیانە وا بکەن و نێچیری بەردەستی ژیان بن یان ئیتر ئەمەش بێ مێشکی و بێ فکری خۆیانە . بەڵام من پێم وایە کە کار گەیشتە ئەم ئاستانە ئەبێت بە هەر جۆرێك بێت چارەسەر بکرێت نەك هەڵە شاراوەکان بە هەڵەی نهێنی چارەسەر بکرێت راستە هەر یەکەمان بە شێوەیەك نەخۆشین بەڵام هەموو نەخۆشی یەکیش چارەی هەیە گەر مرۆڤ ویستی چارەسەری هەبێت هەرچەندە زۆر

جــاریش ئێمــەش و کۆمەڵگــەش هــەر بــەو نەخۆشــیەوە ئەمێنینــەوە تا مردن .

هــەر لــە ژورەکــە کەسێکی تــری لێبــوو نــاوی ئــاری بــوو ئــەم پیــاوە وەك ئــەوان نــەبوو کێشــەی ســۆز و پــارەو ئــەو شــتانەی نــەبوو، بــەڵام هــەر وەکــو بــاقی تــری مرۆڤــەکان دەبێــت ئــەمیش لایــەنێکی هــەبێت کــە ســەرقاڵی ژیــانی پێــوە بەرێتــە ســەر ئــەم کــورە هەمیشــە نــەخۆش بــوو نــازانم نــەخۆش بــوو یــان خــۆی نــەخۆش ئــەکرد گرنـــــگ هـــــەر رۆژە لای دکتۆرێـــــك بـــــوو ، رۆژێـــــك کولیســـترۆلەکەی بـــەرز بـــوو رۆژێـــك خوێنەکـــەی کـــەم بـــوو رۆژێکــی تــر ئــەهات ئــەیوت چــەوری ســیانیم زۆر بــەرزە ئــەبێ وەرزش بکـــەم ئـــەبێ نیشاســـتە و گۆشـــت نـــەخۆم ئـــەبێ شـــیرینی تــەرك کــەم ، نــازانم ئیتــر ســەری دنیــایی لــە خــۆی ئەهێنایــەوە یــەك ئــەوە لــە کەسێکی دراوسێمان ئــەچوو کــاك رحیم نــاوێ بــوو نــازانم ئــەم کابرایــە قــەت نــەی ئــەووت باشــم وای ئــەزانی ئەگــەر مــن بـزانم باشـە ئیتـر ئـەبێ بـە چـاوەوە لـە باشـی یەکـەی کەمـە بێتـەوە . بــەڵام مــن وای بــۆ ئــەچووم هــەر یەکــەمان بــە جۆرێــك نــەخۆش بێــت نــاوی یــان دەری ، دەبێــت هــەر کەســەو گیــرۆدەی شــتێك بێــت تـــا نـــەتوانێ بیـــر لـــە ژیـــان بکاتـــەوە ئـــەوە خـــۆ وەك ووتـــم

دەســـەَڵاتەکەش خـــوا هـــەڵناگریَ هـــەر رۆژەی بـــە بابەتێکـــە وە ســـەرقاڵمان دەکـات ئیتـر یـان نـەبوونی کارەبـا یـان نـەبوونی نـەوت یـان نـەبوونی ئـاوو یـا نەبوونـە غـازە هـەر رۆژە بـە شـێوەیەك تەنانـــەت جـــاری وا هەیـــە قـــەیرانی هێلکـــەو قـــەیرانی ســـانتیش دروســـت ئـــەکات بـــەس بـــۆ ســـەرقاڵ کردنـــی ئـــەو عالەمـــە خـــوا هـــــەڵناگریَ درێخـــــی نـــــەکردوە بـــــە مەشـــــغوڵ کـــــردن و ســـەرقاڵکردنمانەوە هـــەر بـــۆی نـــەتوانینن بیـــر بکەینـــەوە بڵـــێن ئێمـــە کێـین و بـۆ وایـن ئـەی ئـەوان کـێن بـۆ وان بـۆ ئێمـە وەك ئـەوان نـین و بـۆ ئـەوان وەك ئێمـە نـین ؟ بـە خـوا ئـەوەی مـن تێگەیشـتووم هـیچ کـەس هـەرگیز تـەواو ئـازاد نییـە. ئـازادی مـرۆڤ، چەنـد کاتژمێرێـك پـاش هاتنـە دنیـا لـەو ئەسـەنرێتەوە ، ئێمـەش لـە سـایەی عـەقلی خۆمـان گەیشـتین بـەم رۆژەی ئێسـتا تـێ ی کـەوتووین بـە هـۆی گـەمژەی ئێمـەوە هـەرچی گەنـدەڵ و دزە گەیشـتە دەسـەڵات ..

رۆژەکەم بەمە دەستی پێکرد .

ئـاری : کـاك کـاردۆ ئـەوە بـۆ ریشـت ناتاشـی کـوری بـاش ، بـۆ تـۆزێ گرنگـی بـە خـۆت نـادەی تـۆ کـورێکی قـۆزی بـۆ ئـاوا خـۆت پیر کردووە لە ئێستاوە ؟

ئەمـە ئـەو پرسـيارەيە كـە مـن زۆر بێـزار دەكـات ئـێ كاكـە ريشـی تۆيـە هـی باوكتـە ئـاخر رێ ی لـە تـۆ گرتـووە ئـەم ر يشـە خـوێری يـەی مـن ، ريشـێ هـەبێ يـان نـەبێ چ رێگايـەك لـە تـۆ ئـەگرێت وەك يـەكێ نـەزانێ ئەگـەر مـن ئـەم ريشـە قـۆرەی مـن نـەبێ ئيتـر دەولـەَت بـەيان ئـەكرێ و ئـەبين بـە خـاوەن ناسـنامەی خۆمـان يـان ئەگـەر مـن ريشـم نـەبێ ئيتـر دنيـا چـاك ئـەبێ و كـەس لـە كـەس ناكەوێ .

كـاردۆ : وەڵا بڵـيم چـی كاكـە گيـان تـەنها ئەوەندەيـە كـە تاقـەتم نـی يە كاك ئاری گيان ريش تاشين حەوسەڵەی دەوێت .

ئـاری : كـورە كاكـە تۆكـورێكی گـەنجی ئـەبێ قـۆز بـی ئـەبێ گرنگـی بـە خـۆت بـدەی ئـەبێ هەميشـە نمونـەی جـوانی و كەشـخەيەتی بيـت ئـەها سـەيری مـن كـە هەميشـە ئەمـەوێت ببمـە نمونەيـەكی بـاش . ئەمـە چونكـە خـۆی دايـم نـەخۆش بـوو نـەی ئـەزانی چـی ئـەوێ و چـی نـاوێ بۆيـە وای ئـەزانی منـيش وەك خۆيم .

سـەيرە ئـەم دنيايـە .. كـاتێ تـەنهاين بـە دوای هاوڕێيەكـدا دەگـەرێين ، كـە پەيـدامان كـرد بـە دوای عەيبەكانيـەوەين، وەختـێ

لــە دەســتماندا بــە دوای یادگارییەکانیــدا دەگــەڕێین ئــەم کــاك ئــاری یــەش وایــە کاکــە تــۆ بــۆ بــە دوای عەیبــەکانی منــەوەی بــۆ بــە دوای کــەم و کــوری یــەکانی منــدا ئەگــەڕێیت .بــەخوا مــن هەمیشــە ئــەلێم بــا ئاگامــان لــە دڵــەکان بێــت ، بــڕوا بکــە هــیچ شــتێک لــە دڵ ئاســانتر ناشــکێت ئیتــر بــۆ دڵــی یــەك ئــازار بــدەین . مــرۆڤ دڵــی زۆر ناسکە بە ووشە ئەشکێ .

کــاردۆ: کــاك ئــاری گیــان شــتێك پــێ ئــەڵیم بــەس دڵــت نــەرەنجێ لــێم تکایە .

ئای : نا کاکە بۆ ئەرەنجێم ئاسایی یە بیڵێ .

ئــەمزانی هەنــدێك کــەس هەیــە ناچــاری هەنــدێ شــتی پــێ بڵــێ ی دەنــا واز لــە کەلــەی ســەر نــاهێنێ بــە تــا پــەرۆی تێــوە نــەپێچیت و تەداخولی هەموو شتەکان ئەکات .

کــاردۆ :کــاك ئــاری گیــان ئەوەنــدەی هــەوڵ بــۆ دروســتکردنی ژیــانێکی نموونــەی بــاش دەدەیــت ، دوو ئەوەنــدە ئاگاداربــە لــەدواجاردا خــۆت نــەبی بــە نموونەیــەکی خــراپ . دوای ئــەوە ئــاو هــەر ئــاوە جــا لــە بــەرداخی شوشــەدا بێــت یــا لــە پــەرداخی ئــاڵتون دا

بێـت هـیچ جیـاوازی یـەکی نـی یـە . منـیش ئـەوەم کـە هـەم ریشـم هەبێت یان نەمبێت ....

ئیتـر بـێ دەنـگ بـوو پـێ ئـەچوو پێـی نـاخۆش بوبێـت کـە وام ووت بەڵام ئەگەر واشم نەوتایە وازی نەهێنا .

بـاش بـوو ئیتـر لـە دوای ئـەم قسـانە ژورەکـە هـێمن بـووەوە و هـەر کــەس ســەرقاڵی کــاری خــۆی بــوو، تــەنها مــن بــە دەم ئــیش کردنیشـەوە هـەر بیـرم ئـەکردەوە لـە نـاو خۆمـداو ئـەمووت سـەیرە رۆژەکانمـــان بـــەرەو بـــاش نـــاگۆرێ ، دەنـــا مـــن زۆر دەمێکـــە چـــاوەرێ ی گۆرانێــك بــووم ، مــن ســاڵانێکە چــاوەڕێی هــاتنی ڕۆژانـی باشـترم . بـەڵام نـازانم بـۆچی هێشـتا هـەر (دوێنـێ)کـان باشــترن دوێنـــێ چرایــەکمان داگیرســان کــاتێ چــوار دەورمــان تاریـك بـوو ، ئـەمرۆ بـە هـەزاران گڵـۆپ چـوار دەورمـان رۆشـن ناکاتــەوە . تێناگــەم بــۆ هــەموو رۆژێ شــتەکان ناشــرینتر و بــێ مانــاتر دەبــن ئەترســم وەك ئــەو کەســانە بــم کــە لــە پــایزدا چـــاوەروانی ســـەوز بـــوونی گـــەڵاکانن ، بـــە خـــوا وا بـــزانم گــەورەترین دوژمنــی مــرۆڤ عــەقلێتی وا باشــترە بیــر لــە مانــە نەکەمەوە .

بــەڵام لەگــەڵ ئەوەشــدا بەراســتی لــە بیرکردنــەوە بێـزار نــابم مــن بوونــەورێکی ســەیرم منـیش نـازانم مـرۆڤ بـۆ ئـەبێت ئەوەنـدە بیـر بکاتــەوە بۆیــە وام بــە بــاش زانــی کــەمێ شــوێنەکەم بگــۆرم بچمــە شــوێنێکی تــر . لــە بەرێوەبەرایەتیەکــەمان ژنێکــی گــەنجی لــێ بــوو مــن هەمیشــە هەســتێکی تایبــەتم هــەبوو بــۆی هەسـتم ئــەکرد هاورێمــە یــان خوشــکمە کــە ئــەمبینی هێمنــی رووی تێــدەکردم لەگــەڵ ئــەوەی ئــەو بــەو شـێوەیە ســەیری نەئــەکردم نـازانم بـۆ مـن وام هەســـت ئـــەکرد نـــازانم ئـــەو چـــی دەوێـــت ، هـــەنگاوەکانم هــەڵیانگرتم چــووم بـۆ لای ئـەو بـە هیـوای کـەمێك هـێمن بوونــەوەم .

کاردۆ : بەیانیت باش نارێ خاتوون.

نــارێ : بــەیانیت بــاش کــاك کــاردۆ فــەرموو وەرە دانیشــە بـۆ وا لــە دەرگاکە وەستاووی ؟ دە وەرە ژورەوە .

مـــن هـــەموو جـــارێ کـــە نـــارێ م ئـــەبینی بەراســـتی مێشـــکم ئیســـراحەتی ئــەکرد لــە جــەنجاڵی یــەکانم لــەوە ئــەچوو روخســاری هــیمن بەخشــی بێــت ،هەمیشــە ئــەویش کــە ئــەیبینم مــن وام هەســت ئەکردلــە چاوەکانیــا ئــەو هەســـت بـــە بیرکـــردن و خۆشەویســـتی

زۆری ئـەکات لـە نـاو چاوەکانیـا ، بـەڵام نـاریێ شـووی کردبـوو ، لەگـەڵ ئـەوەش هەسـتم ئـەکرد کـە هەمیشـە پـێم ئـەڵێ بـۆ نایـەی گـوێ بـۆ خەمـەکانم بگـری...هەرچەنـدە مـن هەمیشـە لـەوە ئەترسـام ، خـوو بـە کەسـێك یـان شـتێکەوە بگـرم، ئەوسـا، ئـەو کەسە یا ئەو شتە کڵاوم لەسەر بنێ...

دانیشـتم چـاوەرێ بـووم دەسـت لـە کارەکـەی هـەڵگرێ و رووم تێبکا .

نـارێ :بـەخێر بێیـت یـاخوا ، جـارێ پـێم بڵـێ چـا ئـەخۆیت بـۆت بانگ بکەم ؟

کاردۆ : ئەگەر بە ئەرك نەبێ بەڵی .

نـارێ : بـاجی چایـەکمان بـۆ ئـەهێنی بـۆ کـاك کـاردۆ ، وا بـزان زۆر شیرین ناخۆی وا نی یە ، باجی با شەکری زۆر نەبێت .

لـە پـاش ئـەوە  ووتـم دەنـگ و باسـت نـارێ خـان  ؟ بـە چـی یـەوە سەرقاڵی ؟

نارێ : باش نیم بەخوا ، هیچ باش نیم  زۆر  هیلاکم .

کاردۆ : بۆ  هیلاکی ؟ هیلاکی چیت ؟

ناریٚ : بە ئیشی ماڵەوە ماندوو هیلاکم زۆر .

کـــاردۆ : ئـــیٚ بـــا پیاوەکـــەت یارمـــەتیت بـــدات ، (هەمیشـــە ئـــەو ئـــەیوت میردەکـــەم زۆر خـــۆش ئـــەوێت تێناگەیشـــتم ئـــەم قســـەیەی بـــۆ ئـــەوە ئـــەکرد تـــا چـــی بـــە مـــن بگـــەیٚنیٚ ، تێناگەیشـــتم لـــیٚ ی ئـــەو لای مـــن هـــاوریٚ یـــەکی نـــاخم بـــوو بـــەڵام لای ئـــەو پـــیٚ ئـــەچوو خۆشەویســـتێکی قەدەغـــەکراو بـــم جـــا ئـــەوە کێشـــە بـــوو مـــن خـــۆم زۆر جـــوان خـــۆم ناناســـی جـــا وەرە بتـــوانم ئـــەو بناســـم ، خـــۆی ناسینی ئافرەت ئەو خەونەی پیاوە کە قەت نایەتە دی.

کاردۆ : دەی پشوویەك بدە بە خۆت ئاگات لە خۆت بێت .

ناریٚ : چی ئەگام لە خۆم بیٚ کاك کاردۆ ؟

کـــاردۆ: مەبەســـتم گـــویٚ مـــەدەریٚ ئیتـــر ژیـــان هیلاکـــی و مانـــدوو بوونە.

ناریٚ : کاك کاردۆ پرسیارێکت لیٚ بکەم ؟

کاردۆ: بەڵیٚ .

نـــاریٚ : کـــاك کـــاردۆ تـــۆ کەســـت خـــۆش ئـــەوێت ؟ بـــۆچی تـــا ئێســـتا ژنت نەهێناوە ؟ کەسێکی دیاری کراو هەیە لە ژیانتا ؟

راستی یەکەی لە وێدا کەمێك وەستام ئەمویست راستی پێ بڵێم نەشمەئەویست پێ بڵێم ، ئەم میللەتەی ئێمە لەو شتە تێناگەن هەرگیز کە ئەم بابەتانە هەمیشە بابەتی زۆر کەسین پێویست ناکات باس بکرێ پاشان خۆش نی یە بابەتێ لای هێلین تا ئێستا نهێنی بێت من وا بە ئاسانی باسی بکەم ، تێشناگەم ئەم پرسیارە ئەو بۆ ئەیکا چی لە رۆحی من داوە تا بیەوێ بیناسێ ؟ ووتم : نەخێر ناری خان .

ناری : باشە بۆ ؟

کاردۆ : لەبەر ئەوەی کەس ئەوە ناهێنێ تۆ چنێ عەشقی بەیتێ ، کەس شایەنی ئەوە نی یە تۆ مشتێ سۆزی بدەیتێ بۆ سەما و ئەویش لە زەرد بوون و مەرگی گەڵایەکدا هەڵپەرێ ، لەم تونێلە تاریکانەدا کەس نی یە کوڵینەیەك عەشق و بەرچنەیەك خۆشەویستی پێ بێ لەم بێ دەنگی یەدا کەس نی یە دوو لای لایە و دوو پەخشان و دوو شیعر بڵێ ئەها چەن پارچە پارچە بووین کەس نەماوە ناونیشانی عەشق و ژمارەی تەلەفونی خۆشەویستی لا بێ ئێمە هەموومان کاتژمێرەکانمان وەستان پەرەکانی یادگاری نوسینەوەمان دران جگە لە عەشق و خۆشەویستی فێری هەموو شتێ بووین .

مـن ئەمویسـت هـەموو شـتەکانی پـێ بڵـیم بـەڵام لەبـەر خـۆی نـەم ئـەتوانی چونکـە مـن نـازانم ژیـانی ئـەو بـە چ شـێوەیەکە و ئایـا سـۆزی ئـەو بـە چ جۆرێکـە لەگـەڵ خانەوادەکـەی وە لەبـەر هۆنیـاش کـە هەمیشـە ئـەیوت بـا کـەس بـەم خۆشەیسـتی یـەمان نـەزانێ ، ئەشمویسـت ئـەوەی تێبگەیـەنم خۆشەویسـتی و عەشـق شـەرکردنە کەسـی ئـازای دەوێـت ، مانـدوو بـوون و هیلاکـی یـە خۆشەویسـتی جەنگـە جـەنگ .. هەمیشـە پاڵتۆیـەك و جـوتێ دەسکێشـی ئـەوێ هەمیشـە بـە ملپێچـێ رووی داپۆشـیوە لێـرە خۆشەویسـتی ئـەڵێ ی جـۆ جۆیـە هەمیشـە خـۆی ئەشـارێتەوە ئەترسـێ بیشـکێنن یـان لـەت لـەتی کـەن لێـرە بـە زەحمـەت خۆشەویستی ئەکرێ ..

کاردۆ :ئەی پێم بڵێ تۆ هاوسەرەکەت خۆش ئەوێت ؟

کـەچی ئـەو ئـەیوت بـەڵێ مـن رێبـازم خـۆش ئـەوێت . ( ئیتـر لـەم قسـەیەی ئـەویش هـەر تێناگـەم ) باشـە تـۆ کـە ئەمەنـە هاوسـەرەکەت خـۆش ئـەوێ بـۆ بـەم چاوانـە ئـاوا سـەیری مـن ئەکـەی بـۆ هەمیشـە بـە تەوسـەوە قسـەم لەگـەڵ دەکـەی بـۆ کـە دەمبینـی ئیتـر تەنانـەت هاوسـەرەکەش لـە بیـر ئەکـەیت ، مـن بیـرم دێ رۆژێکیـان لـە کافێـەك دانیشـتبووم لـە و کاتـەدا ئـەو و

مێردەکـــەی هاتنـــە ژورەوە ئـــەو بـــە شـــێوەیەك هـــات بـــەرەو رووی مـــن خـــۆم تـــەریق بوومـــەوە ، مێردەکـــەی بیرچـــووەوە کـــە لەگـــەڵیا بـــوو تـــەوس و شـــەوقێ لـــە چاوەکانیـــا بـــوو مێردەکەشـــی واقـــی وورمـــا بـــوو دوو جـــار بـــانگی کـــرد تـــا وەڵامـــی دایـــەوە راســـتی مـــن هـــیچ تـــێ ناگـــەم لـــە نـــارێ هەســـتەکەم خـــۆی لـــە نـــاو خۆیـــدا دوو کەسی جیان  ئەمە زیاتر بۆ ئەوە ئەگەرێتەوە کە کەسایەتی

مرۆڤـــەکان دووورە لـــەو قســـە بـــاق و بریقانـــەی کـــە دەیکـــەن ، راســـتی خـــۆی هـــەمووومان وایـــن هـــەمووومان دوو کەســـین ئـــەوەی ناخمـــان کەســـێکی تـــرە جیـــا لەمـــەی دەرەوە ، بـــەڵام ئـــەم دوو کەســـە کـــەی زۆر رارا و بیرگـــــۆرن بـــــە زووی حـــــەزەکان و ئارەزوەکـــــانی دەگـــۆرێن ، هەســـتام ووتـــم باشـــتر وایـــە بـــرۆم نـــارێ خـــان کـــاری زۆرم هەیە کاتێکی تر یەك ئەبینینەوە .

نارێ : بە ئیسراحەتی خۆت ، چاووم روون بوەوە بە بینینت .

ئـــەو رۆژە لـــە دەوام زۆر هەســـتم بـــە هیلاکـــی دەکـــرد لـــەوە ئـــەچوو مانـــدوو بـــونی دوێنـــێ شـــەوم تیـــا مـــابێ . بریـــارم دا کـــە گەرامـــەوە بنوومـــەوە نەچمـــە دەرەروە ئەمشـــەو ، هـــەر چـــەن ئەمشـــەو ئـــەبێ لەگـــەڵ برادەرانـــی دەوام بچـــین بـــۆ نـــادی  بـــەڵام بـــروا ناکـــەم بتـــوانم

مــن بچــم ئــەو چوونـــە دەرەوانـــە بەراســتی مێشــکێکی ســاف و جەســتەیەکی ســاخی دەوێــت ئەمــەش ئێســتا لــە منــدا نــی یــە هەرچەنــده مــن ناشــخۆمەوە بــەڵام زۆر جــار ئــەو دانیشــتنانە بەشـدار ئـەبم ، ئیتـر خـۆ مـرۆڤ خـۆی چـەنێك حـەز بـە تـەنیایش بکــات ســـەرنجام بونـــەوەرێ:ی کۆمەڵایەتیشـــە ئـــەبێت تێکـــەڵی خەڵك بێت تا تێبگات لە ژیان .

ئــەو رۆژەشــمان لـــە دایــرە بــەرێ کــرد وەك رۆژەکــانی تــر هەرچەنــە ئــەو رۆژگارانــە ســەرما بــوو بــەڵام بابەتــەکانی رۆژ گــەرم بــوون لــە هــەر لایــەك کێشــەیەك هــەبوو لــە وڵاتــی ئێمــە هــەموو یاســاکان شــکا بــوون ، هــەموو تاکــەکان روخــا بــوون ، تەنانــەت شــوێنێك نــەبوو بتــوانی تێــر تیایــدا بگریــت یــان قاقــا پێبکــەنی ، هــەر هــەنگاوێك برۆیشــتیتایە بەســەر شــەقامەکانەوە چیرۆکێکــی نوێــت ئەبیســت ئــازارێکی نــوێ ئەگەیشــتە دڵــت خــەمێکی تـر ئەهاتـە ناخـت ، لـە هـەر لایـەك تـابلۆیکی جیـا لـەوەی ئـەو لات ئـەبینی ،ئێسـتا شـارەکەم هـەمووی گـۆراوە هیچمـان وەك خـۆی نـەماوە هـیچ جـوانی یـەك لـە جـێ ی خـۆی نـەماوە جـاران ئێمـــە بەنـــانێکی تیـــری و داڵانێکـــی تـــۆزاوی و بەرچنەیـــەك خۆشەویســتی رازی بــووین . بــەڵام ئێســتا ماڵەکــان گەورە بــوون

و دڵەکــان بچـوك بــوون. جیــاوازی نێــوان جــاران و ئێســتا وەك جیـاوازی یــەکانی نێـوان عــەقڵ و دڵــی مـن بـوون ، جـاران نــەنکم پـارە لولــەکانی لــە نـاو فەقیانەکــەی هەڵــدەگرت ئــەو کـات هــەموو حــەزو ئـاواتی ئێمــە کرانــەوەی ئــەو گـرێ کوێرەیــەی ئـەو فەقیانەیــە بـوو ، ئێسـتاش تامــەزرۆی نــوقلێکی بایــەمی ئــەو کاتــەم کــە نــەك دەممـــان بـــەلکو دڵیشـــی شـــیرین ئـــەکردین روحیشـــی ئاســـوودە ئـــەکردین، جــاران شــە قامــەکان هێنــدە بێــدەنگ بــوون هەمیشــە گوێــت لــە ئـاوازی چۆلــە کــەکان بــوو ، بــاخی گشــتی لــە دووری شـــارەوە بـــۆنی ئـــەهات ، هەمیشـــە بـــۆنی ســـنەوبەر مەســـتی ئــەکردین ، جــاران نامــە لــە زەرفێکــی بۆنــدار دا بــوو ووشــەکان لەســەر پــەرەکان ئــەجوڵان و ســەمایان ئــەکرد ، جــاران ســپێتی بــەفر شــاری داپۆشــیبوو ریشــۆلە لــە ســەرما ئەخولایــەوە رەشــایی و بریسـکەی باڵــەکانی بــەفری هێنــدەی تـر جـوان ئــەکرد ، ئێسـتاش ئــەوەی نــەماوە مـرۆڤ و چۆلەکــەو ریشــۆڵەو سـنەوبەر و عەشـق و هــەنار و بـاران و دۆشـاو بــەفرە . ئێسـتا ووشــە نــە رەنگــی مـاوە نــە بــۆنی مــاوە هــەموو زەرفــی نامــەکانیش کــوژران ، ئــەوەی نــەماوە خــەوێکی وەنەوشــەی یــە پارچەیــەك میوزیـك کــە رۆحـت خـۆی سـەما بکــە بــێ ئــەوەی تـۆ پێـی بڵــێ ی تابلۆیــەك هــەموو رەنگـەکانی تێـدابێت بـێ ئـەوەی کەسـیان دڵـی لـەوی تـر زیـز ببێـت

، تەنانـــەت شـــێتەکانی شاریشـــمان خـــۆش ئەویســـت ، جـــاران هـــەمووومان مـــرۆڤ بـــووین مـــرۆڤ .ئـــای کـــە منـــداڵیم خۆشدەویســـت ڕۆژانێـــک کە لە جیـــاتی دڵـــم ، ئەنیشـــکم برینـــدار دەبـــوو ، تـــەنها ئەوەنـــدەم دەوێ منـــاڵیم بدەنـــەوە ئەمـــەوێ جـــارێکی تـر چاوشـارکێ بکـەم ...ئامـادەم هـەموو شـتێ بـدەم هـیچ لاریـم نـی یـە لـەوەی تـاکێ قۆنـەره بـم .. بەمـەرجێ ڕێگایـەك هـەبێ پێیـدا بـــڕۆم بـــۆ منـــاڵیم ، ڕێگـــا بێـــت ڕێگـــا ، ڕۆژ لـــە دوای ڕۆژ مانـــدووتر دەبـــین بریـــا هـــەر وەك ئـــەو کـــات ئـــەبووم و گـــەورە نـەبووم مـن بمزانیایـە گـەورەبوون هێنـدە سـەر ئێشـەی زۆرە چـۆن ئـاواتی گـەورەیم ئەخواسـت لـە مناڵیمـا . ئێمـە هـەموو کاتەکانمـان تـــێ پەڕانـــد بـــۆ ئەوەی بگەیـــن بە خۆشـــی، کاتێـــك گەیشـــتین هەسـتمان کـرد خۆشـی ئەوەبـوو کە بەجێمـان هێشـت ، مناڵیشـمان بـە هێواشـی لـێ جێمـاو گەورەیشـمان هێـدی هێـدی لـێ وون بـوو تـەنها تـۆزو خـۆڵێکی سـوتاو ماینـەوە وەك سـەراب خەونـەکانمان یـەك یـەك وون دەبـن وەك بـەفر هـەموو ئومێـدەکانمان دەتوێتـەوە تـەنها یادگـاری یـەکانیمان ئـەمێنێ خـۆ هەنـدێك یادگـاری هەیـە لـە ژیـانی هـەر تاکێکـدا ، بـۆ چەنـد سـاتێ خـوێن لە لاشـەو دەمارەکـانی سـەردا ڕادەگـرن و سـرت دەکـەن ، کەسـانی غەمگـین هەمیشـە یادەوریەکانیان باشتر بیر دێتەوە.

ئــــەژین ئــــەژین رۆژ بــــە رۆژ ئـــەژین گــــوزەر دەکــــەین گــــوزەر دەکـین و راکـەین تـا زیـاتر لـە مـردن نزیـك بینـەوە ئەمـە عومرێکـە مــــن هــــەر ئەگــــەرێم و ئەگــــەرێم و ئەگــــەرێم کــــەچی منــــاڵیم نادۆزمەوە .

کــە ســەیری وێنــەی خــۆم دەکــەم ئێســتاش خــۆم لــە خــۆم نــاچم منداڵیم زۆر لە ئێستا پەریزادە تر و جوانتر بوو .

نــازنم بــۆ لــە رێــدا لام داو بــەرەو گۆرســتانەکە بــەرێ کــەوتم ، لەگـەڵ ئـەوەی مـن بـروام بـەوە نـی یـە کـە مـردوو لـە دوای مردنـی لەســەر ئــەم دۆزەخــەی ئێــرە بمێنــێ وە هــەرگیز ناشــگەرێتەوە بــۆ ئــەم دۆزەخــە ، وامــدەزانی ئیتــر بیرلــە دایکــم نــاکەمەوە، بەڵام بەس بـوو بـۆ ئەوەی تەنیـا چـرکە سـاتێک لە شـوێنێکی تۆزێـک ئارامـدا، تەنیـا بـم تـاکو دیسـانەوە یـادی ئەو بەرۆکـم بگـرێتەوە چوومـە سـەر گۆرەکـەی و پێکـانم هـیلاك بـوون تـا پشـویەك بـدەم لــەم مانــدوێتی یــەی رۆح و جەســتەم لەســەر لێــواری کێلــی گۆرەکـەی دایکـم دانیشـتم وەك هـەموو جـار کـە وتمـە هەڵرشـتنی خەمــەکانی نــاخم کەوتمــە هۆنینــەوەی دەزولــە حــەزە وونبوەکــانم کەوتمــە رشــتنە خــوارەوەی تکــە فرمێســکەکانم . ئــاخر تــێ ناگــەم بـۆ ئـەبێ دایـك لـە مردنیشـدا هـەر سـەبەتەی خـە مـەکانی ئێمـە بـێ ،

خـۆ ئـەو تـەواو سـەفەری بـێ گەرانـەوەی کـردو رۆیشـت ، ئـەم مرۆڤـە پاکانـە چـەن زوو جێمـان دێلـن ئـەوەی مـن تێگەیشـتبێتم و بیـزانم لـەم دنیایـە کەسـە پاکـەکان بۆیـە زوو دەمـرن بـۆی پێمـان بڵـێن ئیمـە لـە نـاو ئێـوەدا جێمـان نابێتـەوە هـەر بۆیـە دایکـی منـیش زوو جێیهێشـتین . مـن ئەگـەر بمزانیایـە دایکـم وا زوو ئـەروا ، تـاکێ لـە پێڵاوەکـانیم لای خـۆم هەڵـدەگرت تـا لـە قیامـەتا بـە ئاسـانی بیدۆزمەوە ......

دایکــە ئەمــەوێ روی تــۆم تــەنها بــۆ چرکەیــەکیش بێــت بێتــە بـەرچاو تـا بـزانم مـن لـە کۆنـدا بەختـەوەر بـووم کـە تـۆ دایکـم بـووی ؟ تـا بـزانم پێکەنینـەکانی منـاڵیم چـەن کـۆلان رێیـان ئـەکرد ونـە ئەکوژانــەوە ؟ تــا بــزانم گــەرمی باوەشــی تــۆ چ جیــاوازی یــەکی هەیـە لەگـەڵ گـەرمی هاوینـدا ، تـا تـێ بگـەم بـۆ ئـەو سـەمفۆنیایە نــەماوە لــە گوێمــا کــە لای لایــەت پــێ ئــەکرد ، حــەزەکانی مــن ســەیرن دایکــە خۆزگــە ئەو کەســانەی کە خۆشــمان دەوێــن، کاتێــک دەڕۆن حەق وایە یادگارییەکانیشــیان لەگەڵ خۆیــان بــبەن...دایکــە مــن دەمــەوێیت و نامــەوێیت ، ئەمــەوێت بێیتــەوە لام لــە باوەشــتا بنـــووم بمـــرم ناشـــمەوێیت بێیتـــەوە ئێـــرە چونکـــە لەمنـــەوە بەدبـەختیت تـووش دەبێـت وەك مـن رۆژ دوای رۆژ بـۆنی کڵـۆڵی

و نەگبـەتی ئـەگری ئەگـەر لەگـەڵما بـی ، دەشـمەوێیت چونکـە ئـە مـەوێ بـە تـۆوە ئاسـودە بـم دایکـە دەرگاکـە بکـەرەوە .. تکایـە بیکـەرەوە چیرۆکێکـی زۆرم پـی یـە بـۆتی بگێرمـەوە ! دایکـە بـا بـۆت بگێرمـەوە مـن لـە دوای کـۆچی تـۆ هـەزاران کـەڕەت دڵـم شـکا هـەزاران جـۆر ورێنـەم بینـی هـەزاران خـەم هاتنـە سـەر ڕێـم هـەزاران فرمێسـکم رژان ، وای دایکـە ...چـەنێك غـەمگینم ....بۆنی بـاروت و شـەرو تـەنیای و ترسـم لـێ دێـت کـەتۆ بـە تـەنیا جێـت هێشـتم ژیـان پارچـە پارچـەی کـردم ئیتـر مـن لـە رۆمـانێکی خۆڵەمێشی دەچم.

دایکـە ...بزانـە مـن ئێسـتا بـۆنی چـیم لێـدێ ؟ بـۆنی عەشـق و ئـەوین ... یـان بـۆنی شـەر و دڵ تـەنگی ؟ دایکـە دەرگاکـە بکـەرەوە مـن دەزانـم تـەنها تـۆ دەتـوانی درەنـدەترین پیـاو بکـەی بـە ناسـکترین پەپولە.

دایکـە گیـان ببـورە سـەرم لـە خـۆم و لـە تـۆش لـەم گـۆرە کـەرو ڵاڵاش تێکـداوە دایـە کـە سـەیری ئـەم گۆرسـتانە ئەکـەم لام سـەیرە لەقەبرسـتانی خەڵکـانی ترنـاچێ ،لەنێـوان گۆرێـک و یەکێکـی تردا ، گولێکی بۆن خۆش نی یە تەنها گۆرهەیە گۆر .

دایــە ڕۆژێ دێ منــیش ئــەمرم ئــەو کــات خۆشنوسَــیك دێــت وئەیــە وێ نــاوم بنوســێ ، وێنەکێشــێك را ئــەکات تــا وێنەیــەکم بکێشــێ ئیتــر گــۆریش ئــەو ئەرکــە ئەگرێتــە ئەســتۆ کــە وێنەکــەم بسـڕێتەوە یــان ڕۆژێ دێ ئــەمرم مردووشــۆرەکە ئــەڵێ ڕاوەســتن مــن پێشــتر ئــەم کەســەم بینیــوە ئــەم پیــاوە میــوانی هەمیشــەی گۆرســتان بــوو ئــەم کەســە خۆشەویســتی کیــڵ و قــەبرو مــردو نێژەکــان بــوو ، گــۆر هەڵکــەن ئــەڵی ئــەم پیــاوە لــە مێــژە هــاورێ ی گۆرەکانــە ، هاوڕێکــانم ئــەو هاورێیانــەی تامــەزرۆی بینیــنم بــوون ئــەڵێن بــا ئــەم تەرمــە کۆنــە بنێــژین دەنــا بۆگــەن دەکــا خێــرا کــەن ئــەم پیــاوە خــەڵتانی فرمێســکە . رۆژێــك دێ منــیش ئــەمرم و یــەك ووشــەم پــێ نــامێنێ ، مــن دڵنیــام رۆژێــك دێ ئیتــر ووشــە هــیچ سودێکی نامێنێ .

مـن هەسـتەکەم دڵـم زۆر پـرە جـا مـرۆڤ دە لـێ لـە هـەمووان پـر بــوو لــەم ســەردەمەدا وا باشــتر بــێ دەنــگ بێــت چونکــە بــەخوا کەوتوینەتە رۆژێکەوە کەس لە دلێ کەس ناگات .

لـەناو ئـەم بیرکردنەوانەمـدا بـووم تـەواو لەگـەڵ گۆرەکانـدا تێکـەڵ بووبـوم و توابوومـەوە لـە رۆحیانـدا لـە ناکـاو زەنگـی تەلەفونەکـەم

لێیدا هۆنیا بوو بە دەنگێکی کزی پڕ بیرکردنەوە ووتی : ئەلو کاردۆ گیان باشی ؟

لە هەموو جیهانی گۆرستان هاتمە دەرێ بە بیستنی ووشەیەکی بوومە بونەوەرێکی تر  هەستم کرد باڵ ئەگرم و لێرە ئەفرم ئەچمە دەروە بەرز ئەفرم پێم ووت  : من باشم هێلین گیان ئەی تۆ باشی ؟

هێلین : ئەوە لە کوێیت کاردۆ؟  بۆ دەنگی هیچ نایەت ؟

کاردۆ : ئەگەر بمەوێ بزانم لە چ شوێنێکم ئەبێ سەرەتا بزانم تۆم لەگەڵی یان نا  .

هێلین : وای واتا من شوێنەکانم ، وێنایەکی جوانت کێشا بەراستی .

کاردۆ : بەڵێ ئەی بەبێ تۆ سوودی شوێن چی یە سوودی بوون چی یە ئەی کە تۆ لە شوێنێك نەبی پێم ناڵێیت چۆن شوێنەکە بزانێت چ وەرزێکە چ رەنگێکە گەردوون .

هێلین : بەراست لەکوێی توخوا کاردۆ دە پێم بڵێ ؟.

کـــاردۆ : لـــە مەمەلکـــەتی ئـــاوا بـــوونم لەگـــەڵ رۆحـــە ســـەفەر کردووەکانــدا یــاری ئەکــەم پێکــەوە ســەما ئەکــەین لەســەر مێــژوو لەسەر پەرەکانی داهاتوو .

هێلین : مەملەکەتی چی؟

کــاردۆ: ســادەیی و دڵپــاکی ، (هێلــین هیچــی لــە خۆلەمێشــی یەکــەو خەیاڵــە وونبوەکــانی مــن و غــەمگینی مــن نــە ئــەچوو لەگــەڵ ئەوەشــدا هــیچ گرنــگ نــەبوو لامــان کــە لــە دوو جیهــانی جیــادا ئــەژیاین و گوزەرمــان ئــەکرد تەنانــەت بیرکردنەوکانیشــمان جیــا بــوون لــە یــەك لەگــەڵ ئەوەشــدا گرنــگ جیاوازیــەکانمان نــەبوو ..گرنــگ پێکــەوە بوونمــان بــوو بــە جــوانی رێکردنمــان بــوو پێکــەوە وەك دوو نەورەس بە سەر دەریایەکدا ئەفرین ).

هێلــین : کــاردۆ گیــان لــە کــوێی ؟ چــی ئەکــەی ؟ دەی بــا تــورە نەبم خێرا پێم بڵێ دەی بزانم لە کوێیت بە قوربان ؟

کــاردۆ: گیانەکــەم مــن لەگــەڵ هاورێکــانی منــداڵیم کــە یــاریم لەگــەڵ ئــەکردن وەختــێ ئــەهاتم بــۆ ســەردانی دایکــم لەگــەڵ گــۆرە بــێ دەنگەکانم لە گۆرستانی تەنیاکان .

هێلــین : ئــۆی کــاردۆ نــەمووت ئیتــر مــەچۆ بــۆ گۆرســتان بەســە بـەس بـۆ وا لـە خـۆت ئەکـەی مـن نـازانم تـۆ بـۆ ئەمەنـدە گۆرسـتان خـــۆش ئـــەوێت وا بـــزانم رێگـــەیان بـــایتێ هـــەر لـــەوێ ماڵیـــك دروست ئەكرد ، پێم بڵێ ئەی کەی دێیت بۆ لای ماڵمان ؟

ئـای لـە هێلـین قـەت لـەم عەشـقە هەرزەکارانـەی ناکـەوێ منـیش قـەت ئـەو دڵـەیم پـێ ناشـکی ئـاخر شـکانی دڵ، لـە شـکانی ئێسـك ئـــەچێ، لـــە دەرەوە هـــەموو شـــتێك باشـــە، بـــەڵام لەگـــەڵ هـــەر جوڵەیەکــدا، ئـــازاری ئـــەبێ منـــیش نامـــەوێ قـــەت قـــەت ئـــەو ئازارەی هەبێ .

هێلـین : باشـە نـەمووت ئەوەنـە مـەچۆرە ئـەوێ ، مـن تێناگـەم تـۆ بـە رۆژ و بـە شـەویش ئـەچی ئـەی ئـەوە تـۆ لـە مـردن ناترسـی لـە و گۆرانـــە ناترســـی ، نـــازانم چـــۆن ســـڵ ناکەیتـــەوە لـــەو کێلـــی قەبرانـــە ناترســـی رۆژێ رۆحیانـــەتێك بـــۆت بێتـــە دەروە پەلـــەمار بدات .

کــاردۆ: نــا وەڵا بــە پێچەوانــە مــن ئەگــەر لــە مــردن بترســم لەبــەر ئـــەوە ئەترســـم مرۆڤـــەکانی ئێـــرە ببینمـــەوە دەنـــا مـــردن ســـادەیی بوونــە پاشــان لەوەتــەی مــن هــەم ئاواتــە خــوازم رۆژێـك رۆحێـك

بێتــە دەرەوە و باســی حیکایەتــەکانی ئــەولام بــۆ بکــا پــێم بڵــێ ئــەوێ چ جیهانێکــە تــێم بگەیــەنێ بــۆ کــە ســەفەر ئەکــەن بــۆ ئــەو لا ناگەرێنــەوە ئــەبێ نهێنــی خۆشــیەکانی ئــەوێ بــێ یــان ئــەم جەهەننەمــەی ئێــرە وای لێکــردوون کــە رۆیشــتن بــۆ هــەتایی سەفەریان کرد بۆ هەناسەیەکیش بیر لە هاتنەوە نەکەنەوە .

هێلـین: کـاردۆ گیـان ئیتـر بـە کـەیفی خـۆت گرنـگ دێیـت بـۆ لای ماڵمــان زۆرت بیرئەکــەم بەراســتی تامــەزرۆی بینینــتم زۆر زۆر ؟

کـاردۆ : دێـم هێلـین گیـان ژوانـێکم هەیـە کـاتژمێر سـێ بـە دڵنیـایی دوای ئــەوە دێمــە لات بــەڵام نــازانم بــە رێکــی کــەی ژوانەکــەم تەواو ئەبێت ، کاتێك تەواو بووم تەلەفونت بۆ دەکەم دڵنیا بە .

هێلین : لەگەڵ کێ ژوانت هەیە قوربان ؟

مێینــە هــەر مێینەیــە ئــەو حــەزی تاکپەرســتی یــە هــەر هــەمان ئــەوەی دایکمــان و نــەنکمان و ئــەوانی تریشــە ئیرەیــی مێینــەش پێناســەی ســەرەکی مێینــە بــونێتی ســەرەتا ویســتم هــەر بڵــێم کەسـێکی ئاسـایی بــەڵام پـێم خـۆش نــەبوو بیشــارمەوە چونکــە ژوانەکـە زۆر ئاسـایی یـە لای مـن راسـتە لەگـەڵ کچێکدایـە بـەڵام

هـیچ گرفتێـك نــی یـە بۆیــە بــە ئاســایی پـێم ووت : لەگــەڵ لــەنیا یــی هــاورێم لــە کافێکــەی لای مــاڵی خۆمــان ئــەو پەیوەنــدی پێــوەکردم و ووتـی ئەمەوێت بتبینم .

هێلــین : ئــۆی کــاردۆ لــەنیا نەبرایــەوە بەراســتی خــۆ مــن بــروای تــەواوم بــە تــۆ هەیــە و لــە تــۆ ناترسـم بـەس لـەو ئەترسم کـە رۆژێ بێــت و ئــەو خۆشــی بوێیــت و دوای نــەتوانێ دەســتبەردارت بێــت . هــەموو جــارێ کــە باســی ئــەوم بــۆ دەکــەی هەســتەکەم ئــەو خــۆش ئـــەوێی ئـــاخر دوای ئـــازارێکی زۆر ئـــەچێژێ و گیـــرۆدە ئـــەبێت بەدەســـت پەیوەســـت بـــوون پێتـــەوە بـــە بـــێ هـــوودە توشـــی خـــەم و خەفـەت ئـەبێت مـن کچـم باشـتر ئـەو شـتانە ئـەزانم بیرکردنــەوەو هەڵســـوکەوتی کچـــان چۆنـــە بەرامبـــەر بـــە کەســـێ کـــە ســـۆزێکی هــەبێت لــە ناخیانــدا ئەمــە کێشــەیە ، هــەروەها بـا دڵیشــی نەشــکێت چونکــە کــچ وەك کــور نــی یــە کــەدڵی بــۆ جارێــك شــکا ئیتــر چــاك نابێتەوە .

کــاردۆ :نــا هۆنیــا گیــان خــەمت نــەبێت مــن درك بــەو شــتە ئەکــەم و تێئەگــەم لــە شــیکردنەوەکەی تــۆ بۆیــە هەمیشــە هــەوڵم داوە کــە ئــەو بــەو شـێوەیە تێنــەگات بەراسـتی ئیتــر نــازانم ئــەویش بیرکردنــەوەی نــاخی چۆنــە ئــەوەیان مــن نــاتوانم بریــاری لەســەر بــدەم ( ئەشــێ

قسـەكانی هێلـین راسـت بێـت ئـەوان مێینـەن زیـاتر لـە یـەك تـێ ئەگـەن زیـاتر یـەك ئەناسـن هەڵبەتـە هڵسـو كـەوتی یـەكتر شـارەزان و بیركردنـــەوەو رەفتارەكانیـــان نـــزیكن لـــە یەكـــەوە لەبـــەر ئـــەوەی زۆرینـەی مێینـەكانی ئـەم وڵاتـە لـە یـەك جـۆر مەناخـدا و بـە نزیكـە جۆرێـك پـەروەردە گـەورە دەبـن بۆیـە هەمیشـە نزیكـی لـە بیـرو رەفتاریانـدا دەردەكـەوێت بـەس مـن لەگـەڵ هـاورێ ی بـاش هـیچم پـــێ نـــاكرێ وە لـــەنیاش یەكێكـــە لـــە هـــەرە هـــاورێ دێـــرین و باشـــەكانم مـــن و ئـــەو ژیانێـــك پێكـــەوە بـــووین ) . باشـــە دوای ژوانەكــەم تەلــەفون بــۆ دەكــەم دێــم بــۆ لای ماڵتــان وەك بــەڵێنم دا خەمی هیچیشت نەبێ .

هێلـین: باشـە ئـێ بـۆ وا بـە پەلـەی خێـرا ئەتـەوێ بـرۆی دە شـتێ بڵـێ ئـەو كـات بـرۆ چـی یـە ئـەڵی ئەتـەوێ بـە زووی لـە كۆڵـت ببمەوە یان بیزار بویت لێم .

كـاردۆ : ئـەوە تـۆ چـی دەڵێیـت شـتی وا هـەر نـابێ ، پاشـان مەگـەر ئەوەنـدە بڵـێم خەریكـە كارتەكـەم تـەواو ئـەبێ ( بـە پێكەنینـەوە )، دەنــا ئەمـــەوێ گوێــت لـــە دەنگـــی هەناسەكانیشـــم بـــێ گوێــت لـــە تەپەكانی پێم بێت وەختێ گوزەر دەكەم .

هێلـین : باشــه بـەقوربان ده بـرۆ ئاگـات لـه خـۆت بـێ جـوان خـۆت بپێچـەرەوه پۆشـاکی بـاش لەبـەر بکـه ووریـا بـه بـا سـەرمات نـەبێ به قوربان .

بــەرێ کــەوتم بــەرو کافێکــەی کــه بریــار بــوو لەگــەڵ لــەنیا چاوومــان بەیــەك بکــەوێ کەگەیشــتنم بــۆ کافێکــه لــەنیا لــەوێ بــوو چـاوەروانی ئـەکردم مـن وای بـۆ ئـەچووم هێشـتا لـەنیا لـەوێ نـەبێ روخســاری ســەیر دیــار بــوو هەســتم بــه بیتاقــەتی ئــەکرد لــه ناخیـدا تێکــەڵ بــه تەوســی بینینێکــی زۆر کــه لــه بیرکردنێکــی ناخــەوه دەرچووبێــت ، بــەڵام وا دیــار بــوو زەنگــی قســەکانی هێلــین دەمــێ بــوو لێــدرابوو ، کــه ســەیرم کــرد لــەنیا لــەوێ بــوو دانیشــتبوو چـاوەرێ ئـەکرد و هەسـتم بـه شـڵه ژاوی ئـەکرد لـه دەم وچاویـا و نینۆکەکانی ئەخوارد .

کــاردۆ : ســڵاو لــەنیا ببــوره دواکــەوتم بــروا بکــه مــن زۆر پــێش وادەکه هاتمه دەرەوه بەڵام پێ ئەچێت رێگاکه دوای خستبم .

لــەنیا : نــا نــا ببــوره تــۆ دوا نەکــەوتووی مــن زوو هــاتم ، کــاردۆ زۆر پێویســتم پێــت بــوو بۆیــه داوام کــرد بتبیــنم ، ئەشــێ لــه کاتیشــم

گرتبـی بـەڵام چـی بکـەم خـۆت ئـەزانی مـن چـەنێك بـروام بـە تـۆ هەیە بۆیە ئەو بابەتانە ناتوانم لەگەڵ کەسی تردا باس بکەم .

کــاردۆ : نــا ئاســایی یــە کــات نــەگرتووم بــە پێچەوانــەوە منــیش خۆشــحاڵ بــووم کــە ئــەمرۆ بینیمــی بــەڵام ئــەوە چــی یــە بــۆ وا پەشـۆکاوی هەسـتەکەم خـەمێکی گـەورە لـە ناختایـە فـەرموو لـەنیا گیــان چــی بــە مــن بکرێــت بــۆت ئەکــەم دڵنیابــە تــۆ کەســێکی گەورەی لەی من .

لـەنیا :راسـتی یەکـەی کەسـێك هاتۆتـە داخـوازیم ، کێشـەکە ئەوەیـە ئـەمجارە دایکـم ئـەڵێت تـەواو ئـەبێ شـوی پـێ بکـەیت ، ئـەڵێت تـۆ ئەمــە ســەرەی چەنــدەم کەســە بــەرێ ی ئەکــەی ئەمــە نــابێ مــن ئەمــەم پــێ هــەزم نــاکرێ تــۆ هــەر وا لــە خــۆرا ئــەم روو ئــەنێیت بــە م خەڵکانــەوەو بــەرێیان ئەکــەیت ، ئــاخر ئــەو وەك دایــك لــەوە ئەترســێ بمێنمــەوە و قــەیرە بــم ، دایکــم هەمیشــە ئــەڵێت کــە مــن بمــرم کــێ ئاگــای لێــت بێــت لەگــەڵ کــێ ئــەژیت بۆیــە بەراســتی بــەردەوام لــەو بیرکردنەوانــەدا ئــەژی وە ئــەم جــارە تــەواو تــورە بــووە کێشــەکە ئەوەیــە ئــەو کەســەی هاتۆتــە پێشــیش کەسێکی بــاش

دیـــارە ،بـــەڵام مـــن خۆشـــم نـــاوێ نامـــەوێت مـــن نامـــەوای هاوسەرگیری بکەم .

کـاردۆ : ئـێ باشـە بـۆ ناتـەوەێ ؟ کـێ یـە ئـەم کەسـە ؟ چـی یـە چ کارەیـە ؟ خـەڵکی کـوێ یـە ؟ تـۆ سـەرەتا بـۆ هـەوڵنادەی بیبینـی ؟ بـۆ یەکسـە بریـار ئـەدەیت ئـاخر واش نابێـت دایکـت راسـت ئـەکات ئەمـە سـەرەی چەنـدەمین جـارە تـۆ ئـاوا خـەڵك بـەرێ دەکـەی ئـاخر بـەم شـێوەیەش نـابێ هـیچ نـەبێ رێگـەی بـدە بـا قسـە بکـا بـەڵکو خۆشـت بـووێ هـەر هـیچ نـەبێت کـێ ئـەڵێت نـاگونجێن پێکـەوە ، ئەی ئەوە کەسە کەسێکی چۆنە چی ئەکات ؟

لـەنیا : ئـەو کەسـە دکتـۆرە ، کـورێکی بـاش دیـارە لـە خێزانێکـی ناســراوی شــارەکەیە بــە قســەی خۆشــیان توانــای دارای باشــە بـەس مـن نـاتوانم خـۆم بیهینمـە بـەر چـاوی هاوسـەرگیری لەگـەڵ بکەم .

راسـتی یەکـەی لـەنیا کچێکـی تـا بڵێـی جـوان واسـك و کەشـخە بـوو هەمیشــە کــە ئــەتبینی ئەدرەوشــایەوە لەگــەڵ ئــەوەی ژیــانی زۆر قـورس بـوو بـەڵام هەمیشـە گـوڵێکی کـراوە بـوو گـەش بـوو لەگـەڵ ئەوەشــدا کەســێکی عاقــڵ و جێگیــر بــوو بۆیــە هەمیشــە کەســانی

بـــاش ئەهاتنـــە داوای ، مـــن هەمیشـــە ئاواتـــە خـــواز بـــووم ژیـــانی داهـــاتووی پـــر بێـــت لـــە بەختـــەوەری بـــە تەوسـێکەوە سـەیرم کـردو ووتـم باشـە بـۆ نـاتوانی هاوسـەرگیری لەگـەڵ بکـەی خـۆ تـۆ جـارێ نایناسی چۆن وا بریار ئەدەیت ؟

لـەنیا : لەبـەر ئـەوەی مـن لـە ناخـەوە کەسـێکی تـرم خـۆش ئـەوێ مـن لـە نـاخی خۆمـدا پەیوەسـتم بـە مرۆڤێکـی تـرەوە هەسـت و سـۆزم لای کەسـێکی تـرە ، بۆیـە نـاتوانم بـەو ئاسـانی یـەش ئـەو کەسە لە بیر خۆم ببەمەوەو شوو بەو بکەم .

راسـتی یەکـەی کـەمێك ترسـام لـەوەی ئـەو پرسـیارەی لـێ بکـەم بـەڵام ئەشـبوایە لـە بابەتکـە تێبگـەم بۆیـە پـێم ووت : کەسـی تـر ؟ ئـەم کەسـە بـە بەختـە کـێ یـە لـەنیا خـان ئەمـەت بـۆ بـاس نـەکردووە لای مـن تـا ئێسـتا ، ئـەی بـۆ بـەم کەسـە ناڵێـت تـا ئـەویش بتـوانێ بێتـە پێشـەوە بـۆ خوازبێنیـت ئـەو کـات تـۆش رزگـارت دەبێـت بـێ لـەم وەزعـە و لـە بۆڵـە بـۆڵی دایکـت کـە هـەموو جـارێ بەسـەرتا ئـەیکات ئـەوە باشـتر نـی یـە هەڵبـەت ئەبێـت ئـەو مـەمنون بێـت کەسێکی وەك تۆ بچێتە ژیانی یەوە .

لـەنیا : ئـاخر خـۆ مـن نـازانم ئـاخۆ ئـەو کەسـە منـی خـۆش ئـەوێت یـان خۆشـی نـاوێم یـان لەوانەیـە ئـەو هەسـتەی لای مـن هەیـە لای ئـەو نـەبێ نـازانم خۆشـم نـازانم چـیم ئـەوێت لـەو کەسـە بریـا وا نەبوایە بەڵام لە توانای خۆمدا نی یە چی بکەم ؟!.

کـاردۆ: بـە واتـا ئەمـەی تـۆ ئـەیلێیت کەوتویتەتـە نـاوی یـەوە قـور بەسـەری یـە خۆشەویسـتی یـەك لایەنـە یـە بـە تـەنها لای تۆوەیـە ئـەو هەسـتە کوشـندەیە . ئەمـە ئـەزانی چ کارەسـاتێکە لـەنیا خۆشەویسـتی یـەك لایەنـە واتـە مردنێکـی بـە ئـازاری هێـواش واتـە هەناسـەیەکی قـوڵی بـێ سـوود ، واتـا درەختێکـی جـوانی بـێ بـەر قورسـترین شـتی دونیـا ئەوەیە کاتێـك بزانـی کەسـێك بیـر لە تـۆ ناکـاتەوە بەڵام، تـۆ هەر سـووربیت لەسـەر ئەوەی لە دڵتـدا بیهێڵیـتەوە خۆشەویسـتی بـە یـەك لایەنـە ئـازاری زۆرە وە بـێ ئەنجامە من تێناگەم تۆ بۆ خۆت خستۆتە ئەو دۆخەوە .

لـەنیا : ئـاخر بۆیـە منـیش بـە تـۆم ووت تـا لـێم تـێ بگـەیت ، مـن ئـەزانم تـۆ تێگەیشـتن هەیـە بـۆ ئـەو شـتانە وە هـەروەها بۆچـوونی تۆ لام زۆر زۆر گرنگ بوو .

کــاردۆ : راســتی مــن تێناگــەم یــان باشــتر وایــە تێنەگــەم (نــازانم بەراسـتی تـۆ ئەتـەوێت مـن لـە تـۆ تێبگـەم ... یـان تێنەگـەم . لـەم بابەتانـەدا خـۆ مـن لـە خـۆم تێناگـەم تالـە تـۆ تێبگـەم ناشـزانم ئـەبێ لـە تـۆ تێبگـەم یـان تێنەگـەم ، پـێم باشـترە لـەم کاتـەدا تێنەگـەم ، چوونکـە تێگەیشـتنی شـتێکی واش وا ئاسـان نـی یـە بگـرە مـن وای بـە بـاش ئـەزانم کـە هـەر تێنەگـەم لـەم شـتە زۆر باشـترە و خـۆم گێـل بکـەم دەنـا لـە پاشـان باجەکـەی لەسـەر هـەردوکمان قـورس دەبێت ) .

لـەنیا : ئێستا کـاتی ئـە وە یـە کـە تـێ بگـەی لـێم بـەڵام ئەشترسم لـە پـاش ووتنـی ئـەو راسـتی یـە قورسـە هـەموو شـتەکان بشـێوێنم ئەمـەی ئێسـتاش هەمـە ئـەوەش لـە دەسـت بـدەم کـاردۆ تـۆ لـە مـن تێناگـەی ، تـۆ لـە گمـە گمـی کۆنترەکـانی نـاخم تێناگـەی ، لـە فرمێسکە گەرمەکانم تێناگەی .

کــاردۆ : تــۆ چــی ئــەڵێیت ( ترســام بەراســتی هەســتم کــرد لــەنیا ئەیـەوێ بـەرەو چ ئاراسـتەیەك بـروات منـیش لـەو کاتـەدا قسـەکانی هێلیـنم بیرکەوتـەوە ، راسـتەکات خـەتای مـن بـوو ، ئـای چ قـور بەسـەریەکە خوایـە ئـاخر مـن بـۆ ئەمەنـدە گـەمژەو سـادەم بـۆ وام بەســەر دێ یــان لەوانەیــە مــن گــەمژە نــەبم بــەڵکو ئــەوە

چواردەورەکەتــە فێــری مامەڵـــەی تەندروســتی پەیوەنــدی یـــەکان نــەکراون فێـر نــەکراون چۆن بـە بیـرو هۆشـێکی ژیرانـەوە هەڵسـو کـــەوت بکـــەین و ئاگامـــان لـــە دەورو بەرەکـــەی خۆمـــان بێـــت ) بێدەنگ بووم نەمزانی چی بڵێم .

لــەنیا: بــۆ بێــدەنگ بــووی کــاردۆ ، تــۆ کەســێکی ژیــرو زیرەکــی پێویسـتە تـێ بگـەیت وە بزانــی ئـەو کەسـە کـێ یـە کـە مـن لـە نـاو خۆمدا خۆشم ئەوێت ؟

کــاردۆ : چــی بکــەم ئێسـتا پـێم ناڵێیـت ئەتــەوێ مـن بڵـێم چــی ؟ ( نەمــەزانی دانیشـم بـرۆم هەسـتم نـازانم خۆشـم سـەرم لـێ شـێوا بـوو بــە راسـتی کەوتوبوومــە دۆخێکــەوە زۆر بێــزار و ماندووکــەر بــوو دۆخێکـــی ئـــاڵۆزی مــن نەویســت بـــەڵام ئیتــر ئــەوەش ژیانــە ئــەبێت ئەم شتانە چارەسەر بێت ).

نــەم ئــەزانی چۆن خـۆم دەربازکـەم لـەم راسـتی یـە تاڵـەی لـەنیا کـە رەنگـە لاوازی و نــەزانینی منـیش تاوانبـار بێـت تێیـدا ئـێ خـۆ لـە کۆتــادا منــیش هــەر مــرۆڤم وەك ئــەو مرۆڤانـــەی ئێــرە ، بـــەڵاَم دوا جـــار هەرهەڵـەیـــە و منـــیش هاوکـــاری بـــووم بـــە ناشـــارەزایی مامەڵــەکردن یــان گرنگــی زیــاد لــە پێویســت یــان لەوانەشــە هەڵــە

نەبێـت بـەڵام ئـەو شـتە نـاگونجێ بـۆ ئـەم سـاتەی مـن کـە پەیوەنـدی یـەکی تـرم هەیـە و ئەبێـت پەیوەسـت بـم پێـوەی ، تـازە هـەرچۆنێك بێـت ئــەبێ ئــەم کەشــتی یــە بگەیەنمــە کــەنار دەریــا تــا لەنگــەر دەگـرێ و ئـەو بـارە گرانـە لەسـە ردڵـی لـەنیا لەبـەرم ،دەبـێ لـە گــەڵی بـم دەنــا تــا مــاوم خــۆم بــە ئــازاری ئــەم خەمــەوە هــەموو رۆژێ هەزار جار ئەمرم .

ئێســتا ئــەبێ چــی بڵــێم ؟ چــی بکــەم ، ئــای خوایــە لــەم هــەموو گێژاوانــەی منــی تێــدام بــۆ ئــەبێ پاداشــتی مرۆڤایــەتی ئــاوی جەهەننــەم بێـت بـۆ کەسـەکانی ئـەم وڵاتـە نـازانن چـۆن مامەڵــە بکـەن لـە هـاورێ یەتیـدا ئەمـە شـتێکە لـە شـتە قورسـەکانی مامەڵـە کردنــــی تاکــــەکان لــــە کۆمــــەڵگا دوا کــــەوتووەکان کــــە نــــازانن جیــاوازی چــــی یــــە لــــە نێــوان هــاورێی یــەتی و عەشـــق و خۆشەویستی و هاوسەرگیری .

کــاردۆ : لــەنیا ببــورە بــەس مــن هەســتەکەم هەڵــە تیگەیشــتنێك هەیــە یــان وەهمێکــە لــە مێشــکی منــدا ، مــن تێناگــەم ئــەزانی بەراســتی مــن ئەترسم لەم شتەی تۆ ئەیڵێیت ؟ .

لـەنیا : بـۆ تـێ ناگـەی کـاردۆ ؟ بـە کـورتی و بـە کـوردی مـن تـۆم خـۆش ئـەوێت تـۆ ئـەو کەسـەی کـە هەمیشـە لـە ناخمـا هـەڵمگرتووە ، ئـەوەی هەمیشـە لـە نـاو خـەون و خەیاڵـەکانما بـووە تۆیـت ، تـۆ هەسـتی بیرکردنـەوەمی تـامی ژیـانمی لـە شـیرینی یەکانیـدا کـاردۆ دە تێ بگە .

ئـەمزانی وا ئـەڵێت بـەس کێشـەکە ئـەوە بـوو نـەم ئـەزانی بـە چ شـێوەیەك وەڵامـی بدەمـەوە بـەبێ ئـەوەی دڵـی بشـکێت و ئـازار بچێـژێ بۆیـە پـێم ووت : ئـەزانی تـۆ چـی ئـەڵێیت لـەنیا گیـان، ئەمـەی تـۆ ئـەیڵێیت کارەسـاتە کارەسـات ئەمـە خـەوێکی ناخۆشـە بـۆ مـن چونکـە تـۆ تێناگـەی مـن تـا ئێسـتا چـۆن سـەیری تـۆم کـردووە نـازانی هەسـتەکانی مـن چـۆنن بەرامبـەر بـە تـۆ بەراسـتی ئەمـەی تـۆ ئـەیڵێیت کارەسـاتە ئەمـە خـەوە خـەو راسـت نـی یـە خەوێکی ناخۆشە .

لـەنیا : کـاردۆ زۆر جـار حـەز دەکـەین خەونـەکانمان ببنـە راسـتی و راسـتی یەکانیشـمان بـبن بـە خـەو ، مـن ئەمـەوێت ئەمـەی تـۆ پـێ ئـەڵێیت خـەونێکی ناخۆشـە ببێـت بـە راسـتی یـەکی پرشـنگداری جـوان ، خـۆ ئەگـەر خـەونیش بێـت مـن پـێم خۆشـە بـە خەبـەر نەیـەم تا بتوانم زیاتر لەو خەونەدا بە ئاسودەیی بژیم .

راسـتە ئـەوەی بـووە لەوانەیـە هەنـدێکی هەڵـە تێگەیشـتنی منـی تێـدابێ بـەڵام مـن چـی بکـەم پـەروەردەی کومەڵگاکـەی ئێمـە بـەم شـێوەیە ئـەبێ ئـەوەم بیـر نـەچێ منـیش هـەر تـاکێکم لـەم کۆمەڵگایـەی کـە بەسـتنەوەو کـەبت کـرد نـی هـەموو حـەزەکانمان لـە منـاڵی یـەوە و ئـەو پـەروەردە هەڵەیـەی لـە نـاو خێـزان و کومـەڵگاو خوێنـدنگاکانمان هەیـە ئـەم جـۆرە کارەسـاتانە دروسـت دەکـات ، کێشـەی مرۆڤـی رۆژهـەڵاتی ئەوەیـە جیـاوازی ناکـات لـە نێوان هاورێ ، هاوسەر و ، خۆشەویستی و ، عەشقدا .

مـن هەمیشـە ئـەڵێم خۆشەویسـتی هەسـتە بـە واتـا ئـەبێ ئـەو هەسـتەی تـۆ هەتـە بـۆ خۆشەویسـتەکەت خـۆی بـە ئاسـانی بـاڵ بگرێـت و بـروات بـۆ لای ئـەو ، هـەمان هەسـتەکانی ئـەویش بـە بـێ سـوار بـوونی شـەمەندەفەرێك بگەنـە وێسـتگەکانی دڵـی تـۆ ، مـن لـەوە تێناگـەم مـن هـەرگیز ئـەو هەسـتەم نـەبووە بـۆ لـەنیا بـۆ ئـەو بـەم شـێوەیە لـە مـن تێگەیشـتووە ؟ یـان راسـتی یەکـەی مـەرج نـی یـە لـەنیا ئـەو هەسـتە راسـتی یـەی هـەبێت بـۆ مـن ، بـەڵام ئەشـێت مـن ئـەو کاراکتـەرە بـم کـە لـەنیا ئەیـەوێت لـە نـاخی خۆیـدا و وێنـایی کێشـاوە بـۆ هاوسـەری داهـاتووی ژیـانی ، ئـەو هـەموو جـار بـۆ کێشـەو گرفتـەکانی ئەهاتـە لای مـن هـەموو بریـارێکی بـە

بــێ مــن دەرنــاکرد تەنانــەت هــەر هاوکــاری یەکیشــی بویسـتایە لــە منــی داواکـرد ، پـێ ئـەچێت ئێسـتا تێگەیشـتبێتم مـن بـۆ لـەنیا بـاوکێ بـووم تەنانـەت تەمـەنی مـن و لـەنیا دە سـاڵ فـەرقی هـەبوو ئـەوەی لـە نیـا لـە منـی ئەویسـت سـۆزێکی باوکانـە بـوو کـە بـێ بـەش بـوو لــێ ی لــە منــاڵی یــەوە بــەڵام خۆشــی هەســتی پــێ نــەکرد ، ئــەو پرکردنـەوەی بۆشـایی یـەکانی لـە مـن دا ئـەبینی بۆیـە تێگەیشـتم کـە ئەمە تەنها پێویست یە و عەشق نی یە .

کــاردۆ : لــەنیا تــۆ ئــەبێت باشــتر بروانیتــە شــتەکان مــن وای بــۆ ئــەچم کــە ئــەم هەســتانەی تــۆ تــەواو نــەبن چونکــە ئــەو هەســتە لای مـن نـی یـە تـۆ لای مـن وەك هـاورێ یـەکمی یـان نـازانم مەسـێکی نزیکمــی مــن پــێم خــۆش نــی یــە تــۆ ئــازار بچێــژی مــن ئــەزانم ئازار. یانی کەسێکت خۆش بوێت

کەئەو پێویســـتی بەوخۆشەویســـتیە نەبێـــت ! یـــان هەســـت بـــەو خۆشەویستی یە نەکات .

لـەنیا : نـا وا مـەڵێ تکایـە مـن تـۆم خـۆش دەوێ تـۆ بـۆ تێناگـەی لـە مـن ، بـۆ مـن و تـۆ لە باسـی عەشـقا ڕێـک ناکـەوین مـن ئەڵـێم عەشـــق ئاســـانە ، ئـــازایەتی نـــاوێ بیرکـــردنەوەی نـــاوێ خەمـــی

نــاوێ ، عەشــق بــاكی بە دوعــاكردنی دایكێــک نــیە بــۆ منــداڵەكەی، گــوێ بەهــاواری كەســێك نــادات بــۆ جەرگە ســوتاوەكەی ، بــاكی بە كــڕوزانەوەی جــەنگاوەرێك نــیە بــۆ خاكــەكەی ، عەشــق خــۆی پــاڵەوانێكە هــیچ ئــازایەتیەكی نــاوێ ئەوەی ئــازایەتی ئەوێ ژیــانە ....

كــاردۆ : قســەكانت تــەواونی یــە ، مــن لەگــەڵ بیــری عەشــقدا هــەمان بۆچــونم نــی یــە بــە پێچەوانــەوە مــن بــروام وایــە كــە مــرۆڤ تاوانبــار دەبێــت و شــوێنی جەهەنــەمە گــەر لەپێنــاو شــتێكدا بمرێــت كە لەخــۆی بچوكتربێــت ، بــروام وایــە ئــەبی مــرۆڤ لــە پێنــاوی زۆر لــە خــۆی گــەورەتردا بــژی ئــەو كــاتیش تــۆ كــە بتــەوێ بــەو جــۆرە گەورانــە بژیــت و بــەو جــۆرە بمریــت ئــەبێت ئــازا بیــت ئــەوەش عەشــقە كــە ئــەو ئازایــەتی و شــەرەی دەوێــت ، بــەڵام مــن وتــۆ تــەنها ئــەتوانین وەك هــاورێ پێكــەوە بــژین لەبــەر ئــەوەی ئێمــە هاورێین و بەس .

لــەنیا : ســەیركە كــاردۆ ...ئــاخر ئــەی بــۆ مــن هەســتەكەم مــن و تــۆ لــە هــاوڕێی یەتیــدا ڕەنــگە بەقەد تەمەنــی نێرگزیــک پــێكەوە هەڵكەیــن و زوو ووشــك بێــت هــاورێ یــەتی یەكــەمان مــن ئــەو هەستەم هــەبێت بۆ تــۆ چــۆن ئــەگۆرێت بــۆ هــاورێ یــەتی ئــاخر مــن

گومـانم لـەوە هەیـە بتـوانم هاورێـەتی بـەردەوام بکـەم لەگـەڵتا پـاش ئـەوەی ئـەو هەسـتانەی نـاخی خـۆم پـێ ووتـی ئەترسـم هـاورێ یـەتیمان هێنـدە نـەبات یەکێکمـان دڵـی ئاسـمان بشـکێنێ ! چـاك ئـەزانم ،مـن تـۆ تـەنها عەشـقمان لـێ دێ مـن ئـەو هەسـتە لـە ناخمایە .

کـاردۆ : نـا لـەنیا من تـۆ لـە عەشـقا هەڵناکـەین پێکـەوە دڵنیابـە ، ئـەو هەسـتە نـی یـە لای مـن بـروا بکـە وە مـن نـاتوانم ببـورە تکایـە پێویسـتە تـۆ لـەم خەیاڵانـەت بێیتـە دەرەوە سـەیری دوا رۆژی خـۆت بکـەی ، بـروا بکـە تـۆ بـاش بروانیتـە نـاخی خـۆت ئـەبینی ئێمـە تـەنها هـاورێین و بـەس راسـتە دوو هـاورێ ی زۆر نزیـك و خۆشەویسـتی یـەکتر بـەڵام عاشـق نـا ، مـن پـێم خـۆش نـی یە تـۆ ئـازاری خـۆت بـدەی پـێم خـۆش نـی یـە لـە وەهمێکـی بـێ کۆتـادا بژیـت لـە ئازارێکـدا گـوزەر بکـەیت کـە سـێبەرێك بێـت راسـتەقینەی نـەبێ ، مـن هەسـتەکەم ئـەم سـەرابەی تـۆ ئـەیبینی لـە خۆشەویسـتی دا سـوتێنەرە تـۆ لـە بییـانێکی ووشـکدا ئەخولێیتـەوە بـێ ئـەنجام ، تکـا یـە بـا دوا رۆژت نەفـەوتێ بـا بـە ئـازارەوە گـوزەر نەکـەیت لـەم ژینـە سـەختەدا تکایـە ئـەو وەهمـە لـە مێشـك دەر بکە بێ سوودە بروا بکە .

( دوا رۆژ .. ئــەوەی مرۆڤــی خــەفتبار کــردووە بیرکردنەوەیــە لــە دوا رۆژ تــا وای لــێ دێـت ئێستاشــی لــە کـیس دەچێـت ، ئەمــەش یەکێکـە لـە ووشـە وەهمـی یـەکانی مێشـکم مـن بـروام وایـە مـرۆڤ زۆرینــــەی ئــــەو ووشــــانەی دروســـتی کـــردووە لــــە ژیــــانی دا وەهمێکـی راسـتەقینەیە ئـەوەتا ئەگـەر بگەڕێیتـەوە بـۆ سـەرەتاکانی دروسـت بـوونی مـرۆڤ ئـەو کـات نـە خێـر و نـە شـەر بـوونی نــەبووە ، خۆشەویســتی وەفــا خیانــەت ئەمانــە هیچیــان نــەبوون ، ئەمانـــە هـــەمووی دروســـت کـــراوی مێشـــکی مـــرۆڤن . هـــە ر کومەڵگایـەکیش بـە پـێ ی پێویسـتی یـە کـانی خـۆی خێـرو شـەر و گونــاه و تــاوانی جیــا کردۆتــەوە ئــەوتا ئەگــەر لای ئێمــە ئافرەتیـك بـە جلێکـی رووتـەوە بچێتـە دەرەوە ئـەبیت رەجـم دەکرێـت بـەڵام لـە ئـەوروپا ئەگـەر ئافرتێـك شـوو بکـا بـە پێاوێـك ژنـی هـەبێت ئـەبێت رەجـم دەکرێـت دەنــا تــا ئێـوارە خـۆی رووت کاتــەوە ئاسـایی یــە لـەوێ ، کەواتـە هـەموو هـەم شـتانەی ئێمـە تێـدا دەژیـن وەهمێکـی دروسـت کـراوی خۆمانـە لـە راسـتی دا بـوونی خێـرو شـەر نـی یـە ). لــەم بیرکردەوانــەم هاتمــەوە دەرەوە زانـیم ئیتـر کـاتی ئەوەیـە کـە لــەنیا خەبــەر بێـنم لــەو وەهمــە ناخۆشــە پـێم ووت : ئــەزانی لــەنیا مـن بمزانیایـە گـەورەبوون هێنـدە سـەر ئێشـەی زۆرە قـەت ئـاواتی گــەورەیم نــە ئەخواسـت لــە منـداڵیما . تـۆ بـە بیـرت دێـت کـە ئێمـە

منـداڵ بـووین چـەنێك جوانیمـان ئـەبینی ؟ نـەمان ئـەزانی ئـەم شـتە گەورەیانـە چـی یـە تـۆ بزانـە مـن و تـۆ لـە منـاڵی یـەوە هـاورێین بگـرە مـن بـە بیـرم دێـت کـە تـۆ لـە دایـك بوویـت ئـەو کـات نێـوان مـاڵی ئێمـە و ئێـوە تـەنها دیوارێـك بـوو خۆزگـە هـەر گـەورە نەبوینایە .

لـەنیا : راسـتەکەی کـاردۆ گـەورەی ئـازاری زۆرە و ناشـرینە هەمیشـە منـاڵی جـوان بـووە راسـتەکەیت ، مـن لـە مناڵیـدا هەمیشـە حـەزم ئـەکرد لەگـەڵ تـۆ یـاری بکـەم تـۆش قـەت دڵـت نـە ئەشـکاندم ئـەو کـات مـن وەك ڕێنیشـاندەرێك و وەك گوێگرێـك بـۆ خەمـەکانم سـەیرم ئـەکردی تـۆ بـۆ مـن هەمیشـە لانەیـەکی هـێمن و شـادی بویت پێ ئەچێت تۆ بوچوونەکانت راست بێت .

کـاردۆ :تـۆش ئیتـر هـەوڵ بـدە کـە ئـەو شـتەت لـە بیـر بچێتـەوە ئاسـایی یـە لـەنیا هـەمووما‌ن توشـی هەڵـە تێگەیشـتن ئـەبین لـە ژیانمانـدا ، بـەڵام گرنـگ بـەو هەڵانـەدا نـەرۆین و بـەردەوام نـەبین لـە هەڵـە کـردن ، ئێسـتا کـاتی ئـەوە هـاتووە تـۆش رێـرەوی ژیـانی خـۆت بگـۆری وە سـەر لـە نـوێ ببینـەوە هـاورێ وە ژیـانی خـۆت رێـرەو بکـەیت بـە ئاراسـتەیەکی گونجـاو مـن پـێم وایـە ئەگـەر ئـەو دکتـورە کەسـێکی باشـە و ئـەتوانن لـە یـەك تـێ بگـەن رێگـەی

بـدەی بێتــە پێشــەوە تــا بــاش دەیناســی ئــەو کــات ئــەتوانی شـوی پــێ بکەی .

لـەنیا: هەرچەنـدە ئەمـەی تـۆ ئـەیڵیت شـتێکی گرانـە و وا بـە ئاسـانی لــە بیــر نــاکرێ بــەڵام نــازانم هــەوڵ ئــەدەم . بــەڵام ئەشــزانم کــە قورسیشــە زۆر راســتیش ئەکــەی گــەر ئــەو هەســتە وەهمێـك بێـت سـوودی نــی یــە بــە تایبــەت ئەگــەر لای تـۆش نــەبێ ئــەو هەسـتە ،راسـتەکەیت ئـەبێت خـەم نەدەمـە خـۆم بـە خەمـەوە نـەژیم ئـەزانی کــاردۆ ژمــارەی ئــەو ئافرەتانــەی خــەم دەیانکوژێــت، زۆرتــرن لەژمارەی ئەو پیاوانەی لەجەنگەکاندا دەکوژرێن .

هەسـتم کــرد چاوەکــانی تــەواو پــر بووبــون لــە فرمێســك بــەَلام هــەرچۆنێك بێـت لــەنیا بــە هــۆی ســەختی ژیــانی کچێکــە عاقڵــەو هێنـدە توشــی دابـران خــەم و ئــازار بـووە ئـەتوانێ بــە ئاسـانی بێتــە دەرەوە لـــەم کێشـــەیە ئەمویســـت لەگـــەڵی بمێنمـــەوە بـــەڵام نـــەم ئــەتوانی لـــەوە زیــاتر ئازارەکــانی ببیــنم رەنگــە نــەك مــن ئێســتا دنیاشــی لەگــەڵ بێـت سـوودی نـەبێ چونکـە مـرۆڤ کە دڵــی شــکا، هەرچەنـد دەوری قەرەبــالغ بێـت، زیــاتر هەسـت بە تەنهـایی خـۆی دەکــات ، ئــەویش ئێســتا دڵــی شـکاوە بــە ئاسـتەم دەورو بەرەکــەی ئەبینێ .......

كــاردۆ : لــەنیا مــن هەمیشــە هــاورێتم بــێ خــەم بــە هــەر كــات پێویسـت بـە مـن بێـت ئامـادەم ، بـا ئێسـتا بـرۆم باشـە ئیشـێكی زۆر گـرنگم هەیـە كـاتێكی كـە یـەك ئەبینینـەوە ، بـەڵام ئـەو دەرگایانـە داخـە لـە ژیانتـا كـە ترسـت لـە رێگاكـەی هەیـە نـەك لـە تـرس یـا لـە خـۆ بـایی بـوون بـەڵكو لەوانەیـە بتگەیەنێتـە شـوێنانێك كـە بـۆ تـۆ باش نەبێ .

لـەنیا : باشـە كـاردۆ گیـان مـن سوپاسـت ئەكـەم و بیـر لـە ووشـەكان دەكەمـەوە دڵنیـا بـە بـاش ئـەبم خـەم نـەبێ مـن راهـاتووم بـە خـەم ، مــن و خــەم دوو هــاورێ هەمیشــەی یــەكین ، وە مــن و تــۆش هەمیشــە هــاورێیین هــەتا مــردن لەگــەڵ ئــەوەش تكایــە لــەچاوێكتا دێــڕێ لــەدەنگم لەچاوەكــەی تریشــتا كتێبــێ لــەعومرم هــەڵگرە لەدەســتێكتا یادگاریــەكانی منــاڵیم لەدەســتەكەی تریشــتا خــەونی پیــرێتیم هــەڵگرە لــەناو دڵیشــتا ڕۆحــی بچكــۆ لــەم هــەڵگرە **!!** وەك هاورێ هەمیشە لەگەڵم بە .

پـێم نـاخۆش كـە وای بـەو شـێوەیە باسـی خەمـەكانی ئـەكات ، بـەڵام هـیچ دەسـەڵاتێكم نـەبوو بۆیـە ئەمویسـت بـە زوتـرین كـات لەبـەر چـاوی وون بـبم ووتـم خـۆات لەگـەڵ وهەسـتام رۆێشـتم ، چونكـە بەراستی قسەكانیشی سری كردبووم .

لەنیا : خوات لەگەڵ هاوریێ خۆشەویستەکەم .

ئیتر فرمێسکەکەی هاتە خواریێ و منیش رۆشتم نەمتوانی ئاور بدەمەوە هەستم بە خەجاڵەتی وو بێزاری دەکرد حەزمەکرد فرمێسکەکانی کۆ بکەمەوەو بیدەمەوە دەستی تا بە فلْچەکانی تابلۆیەکی پر ئەوین دروست بکات ،ویستم بمێنمەوە لای بەس ترسام لاواز بم و هەمووی تێك بدەمەوە لە سەرەتاوە . وام بە باش زانی زوو دوور بکەومەوە.

پێیەکانم بە خێرای بەرەو ماڵی هێلینیان ئەبردم ئەمویست پاك بمەوە لە تاوانەکانم ئەمویست خۆم بشۆم بە فرمێسکەکانم ، هەستم ئەکرد سەر گۆناکانی خۆشم تەر بوو بوون ، من ئەمە کێشەکەمە نامەوێ دڵی کەس بئێشێنم بەڵام هەموو جارێکیش دلێ خۆم لەت لەت دەبێ تا پێکی یەوە ئەنێم بەشیکم لێ ئەمرێ لەگەڵ ئەوەی خۆم کەمم پێوە ماوە تا لە ژیاندا گوزەری پێوە بکەم .

باشە تاوانی من چی یە من هیچم نەکردوە ، بەڵام من زیاتر لە دەرونی مرۆڤایەتی ئەزانم ئەبوایە زیاتر ئاگام لە نزیك بوونەوەم بوایە لە لەنیا تا بەو جۆرە ئەو هەستەی لا دروست

نــەبێ ئــەوەی بــاش بــوو خــۆی کەســێکی تێگەیشــتوەو لــەوە تــێ ئــەگات کــە ژیــان زۆر جــار بــە رەقــی مامەڵــەت لەگــەڵ دەکــاتو خەونــەکان دەکوژێــت . ئــەی ئەگــەر ئــەوە کەسێك بوایــە بیوتایــە ئــەو بیــرە نــاتوانم بکــوژم لــە ناخمــا ، ئــای ئەبوایــە تــا مــاوم بــە ئازاری خەمی ئەوەوە بژیامایە .

تەلەفونەکــەم گــرت بــە دەســتەمەوە هــەوڵی پەیوەنــدی کــردنم دا بــە هێلینــەوە راســتی یەکــەی منــیش پێویســتم بــەوە بــوو گــوێم لــە دەنگــی هێلین بێ پێویستم پێ بوو ببینم نیگایەکی بکەم .

کاردۆ : ئەلو هێلین گیان چۆنی ؟

هێلـین مـن باشـم بـەس بیـرت دەکـەم ئـەی تـۆ لـە کوێیـت ئێسـتا بـۆ وا زۆرت پێ چوو ؟

بـــە رۆیشـــتنێکی خیـــراوە کـــە هەناســـەکانم قـــورس ئـــەبوون لـــە گەروما پێم ووت : لە نزیك ماڵی ئێوەم .

هێلین : ئەی بۆ درەنگ هاتی ؟ ئەی لەنیا هات بۆ کافێکە ؟

کاردۆ : بەڵی لەوێ بووین پێکەوە بۆیە درەنگ کەوتم .

هێلین : ئەی چی بوو؟ چی ویست ؟

ئـەی هـاوار ئێسـتا ئەمـە چـۆن روون بکەمـەوە ، چـی بڵـێم ،ئێسـتا راسـتی یەکـەی پـێ بڵـێم تـورە ئـەبێت و دۆو دۆشـاو تێکـەڵ دەکـا ، ئـــەڵێ نـــەمووت ئەونـــدە نزیـــك مەکـــەوەرەوە ، نـــەموت دوای بـــە هەڵـە لێـت تـێ ئـەگات ، ئەمـە جگـە لـەوەی لەوانەیـە بەشـێوەیەکی تـر لـە شـتەکە تـێ بگـات ، ئـێ باشـە پێشـی نـەڵێم ئـەبێ درۆی لەگـەڵ بکـەم ، ئـەوەش ئـەو شـتەیە کـە نـاتوانم بیکـەم لەگـەڵ هێلـین . زۆر جــار پێمــان ئــەڵێن چەنــەباز مــەبن ئێمــە وا تــێ ئەگــەین مەبەســت تــەنها قســە کــردن و زۆر ووتنــە بــەڵام لــە راســتیدا چەنــەبازی واتــە نــەووتنی ئــەو شــتانەی کــە پێویســت ناکــات بـووترێ بـۆ نمونـە مـن ئەگـەر کـاتی خـۆی باسـی لـەنیام بـۆ هێلـین نەکردایـــە ئێســـتا زۆرێـــك لـــەم شـــتانەی کـــە روی داوە ئاســـایی دەبـــوون بـــاس بکرایـــە ، تەنانـــەت زۆر جـــار مـــرۆڤ پێویســـت ناکـات مێـژوی خـۆی بگێرێتـەوە بـۆ کەسـانی دەورە بـەری ئـەوەی رۆیشـت تـەنها بـۆ سـوود ئـەتوانی لـە بیـرەوەری یـەکانی خۆتـدا بیهێڵێتـەوە پێویسـت بـە گێرانـەوەو بـاس کـردن ناکـات ، تەنانـەت ئەمـە پـێ نـاڵێن بـێ بـاوەری بـە بەرامبەرکـەت یـان تـرس نـا ئەمـە تـەنها تـەرك کردنـی جەنـەبازی یـە ئـەو چەنـە بـازی یـەی منـی گەیانـدە ئـەم رۆژەی کـە ئێسـتا تێـی کـەوتووم نـازانم هـەڵبژێرم لـە نێـوان ووتنـی راسـتی یـەکان وو تیـك شـێوانی دۆخـی ئـەو کەسـەی

خۆشم ئـەوێت یـان شـاردنەوەو ژیـان بـە ئـازارەوە لـە درۆکردنێـك ، خــۆ ئەشــلێن درۆی ســپی و درۆی خۆڵەمێشــی  بــەڵام لای مــن جیــاوازی نــی یــە رەنگــەکانیان هــەرچۆن بێــت نــاوی درۆیــە هـەرچۆن بێـت پـێ ئـەچێت مـن لـە دۆران یـان سەرزەنشـت کردنـی خـۆم بترسـم دەنـا ئـەبێ هێلیـنش لـەوە تـێ بگـات مـن راسـتیم پـێ ووتـوە ، بـەڵام مێینـە  هـەر  مێینەیـە سنوری نـی یـە  لـە ئیرەیـی و خاوەنــدارێتی ، نــازانم خــۆم کــەم سەرلێشــێواوم ئێســتا ئەمەشــی چۆتە سەر .

کـاردۆ: لـەنیا گیـان مـن پێم باشـە ئـەم بابەتـە هـەڵگرین بـۆ کـاتێ کـە یــەك ئــەبینین چونکــە شــتەکە زۆرە بــە تەلــەفون نابێــت مــن تــەنها هــاتووم بــۆ چاوتروکــانێ تــۆ ببیــنم بیــرت ئەکــەم بیــری چاوەکانــت ئەکـەم پێویسـتم پێتـە ئەمـەوێ بـۆنی ئـەو هەوایـەش بکـەم کـە بـەلای ماڵتان تێپەڕێ .

ئەمــەم پــێ بــاش بــوو زۆر جــار بــاس کردنــی بابــەتێکی گرنــگ دەگۆرێــت ئەگــەر بــە نامەیــەك بێــت یــان بــە تەلــەفون بێــت یــان بـەرەو روو بێـت راسـتە بـۆ مـن بـە نامەیـەك باشـتر خـۆم ئەدزیـەوە یــان لــە تەلەفۆنەکــە ئــەمتوانی راکــەم لــە کۆمــەڵیك شــت بــەڵام کاردانــەوە نامــە زۆر قورســترە لــە تەلــەفۆن وە بینینەکــە باشــترە

چونکــه ئــەتوانی بارودۆخەکــه لــه ئاســتێکدا راگــری و شــتەکان چــاك بکەیتــەوە بۆیــه منــیش وام بــه بــاش زانــی درۆ نەکــەم بــەڵاَم بابەتەکە بە بینین باس بکەم باشترە .

هــەموو ئــەم قســانە ووشــەن ووشــە زۆر بابــەت ئــەگۆرێ ، ووشــە بونــەوەرێکی زینــدووە ، هەنــدێك جــار ئــەفرێت ، هەنــدێك جــار را ئەکات ، هەنێك جاریش بە ژێرە مەلە ، بۆ لای خۆت دێت .

ووشــە رەنگــاو رەنگــە ، بــۆنی دەریــای لــێ دێ ، تــامی وەك تێکــەڵ بوونی گێلاس و شلیکە .

ووشــە ، خــۆی شــیعرە ، رۆمانــە ، چیرۆکــە ، لــە گیرانــەوەی ســاتە ئەفسونابیەکان ئەچێ .

ووشــە لــە نــوقلی تــرش و شــیرین ئــەچێ ، وەك لــوقمی شــروبی و محەلەبی گەرم ئەچێ ، هەمیشە حەز ئەکەی بیخۆی .

ووشــە بــە هــەموو ماناکــانی یــەوە ، لــە بــوون ئــەچێ ، ئــەبێ مــرۆڤ ووریا بێت لە بە کار هێنانی ووشەکانیدا .

لـــەم بیرکردنەوانـــەدا بـــووم ووتـــم وەرە دەرێ بـــۆ ســـاتێ تـــا نیگاکانت بینم.

ئەو هات بەڵام ئای چ هاتنێ بوو ...

ئـای لـەو بیننـەی ... ئەمویسـت پـێ بڵـێم ، تـۆ لـە نـاو ئـەم خەونـە تەزیوانـەی منـدا چـی دەکـەی تـۆ چ پاڵـەوانێکی ئەفسـونابیت لـە نـاو ئـــەم رەشـــی و خۆڵـــە مێشـــیەدا وەك پەلکـــە زێرینـــە هـــەزار رەنـــگ دەنـوێنی پـێم بلـێ ... تـۆ ئـەم کـۆترە سـرکانەی مـن چـۆن دەسـتەمۆ کــرد ئــەم ئاســکە کێویانـــەی مـــن چـــۆن مـــاڵی کــرد ئــاخر لـــەم نیشـتیمانەی منـدا عەشـق دوکـەڵێکی رەشـەو بـۆنی بـاروتی لـێ دێ ، لـەم وڵاتـەی منـدا مـاچ کـەس ناناسـێ تـا میـوانی بـێ ، ئـاخر خـۆ لـــەم زەمەنـــەدا بـــاوەش ســـەفەری کـــردووەو ناگەرێتـــەوە حـــەزیش تـەنها تابوتێکـەو لـە مزگەوتەکانـدا ئـەبینرێ تـۆ چـۆن لـەم زەمەنـدا منـت قـووت دا ،پـێم بڵـی ..تـۆ چ شـیرینێکی وا ئەتـەوێ بـە زەمیلـە سـۆزمان بـەیتێ تـۆ چ لەیلایـەکی تـا وانـەی خۆشەویسـتیمان پـێ بلێـی پـێم بلـێ ..تـۆ چ پەریزادەیـەکی لـەم خاکـە پـر ئەهریمەنـەی منـدا ئـەی فریشـتە پـەریا . نـەمتوانی هـیچ بڵـیم تـەنها مەسـت بـووم بـە تـەواوی کـە بەلایـدا تێپـەریم بـە دەنگێکـی کـزی پـر دزی یـەوە ووتی: چۆنی هەناسەی پاکم ؟

ئـای لـەو چـۆنی یـە بـە دەنگێـك ووتـی .. دەنگێـك .. هەسـت بکـەی بـە دیـار شـەپۆلی دەریـاوەی یـان .. سـاتێ گمـە گمـەی کۆترێکـت

گــوێ لــێ بێــت یــان .. ســاتی نیشــتنەوە ی چۆلەکەیــەك لەســەر چڵــێ نێرگــز، یــان .. ســاتی خواردنــەوەی پــەرداخێك ئــاو لــە تەنیایـدا .. سـاتێ هەسـت بکـەی ئیـدی تـۆ لەگـەڵ ئـەو دەنگـەدا بـە شــەپۆلەکانی ئــەرۆی ئــەرۆی تــا هــەرچی ویســتگەی جــوانی و ویسـتگەی باخچـەو ویسـتگەی شـەمەندەفەری بـەری بـەیان دێـت و هـەڵت دەگـرێ ئیـدی ئـەو دەنگـە ئـەوبات ئـەرۆی ، بۆیـە منـیش بـە خـەیاڵی ئـەو چـۆنی یـەوە رۆیشـتم و هـیچم نـەوت تـەنها ئەمویسـت وێنەکەی لە ناخما بتاشم و بیکەمە پەیکەری رۆحم .

ئـای هێلـین گیـان مـن بـە نیگایـەك ئـەتوانم سـالێك بـژیم بـە بزەیـەکت دە ســاڵ بــەری ئەکــەم بــە ســلاوێك ... عومرێــك تــازەم بــۆ ئەنوسـرێ ...سـاتیك بـۆ عەشـق سـاتیکیش بـۆ خۆشەویسـتی سـاتێك بـۆ بـاران سـاتێکیش بـۆ بەفرسـاتێك بـۆ گـول سـاتیك بـۆ عـەترنیگات هــــەزار هــــەزرا جــــار دڵ رادەچڵــــەکێنێ بــــزەت جــــەنگێك هەڵدەگیرسێنێ سلاوت .. ئیتر هیچ لە گەردوندا نامێنێ .

حـەزم کـرد بچـم بـۆ مـاڵی نـەنکم بـەرەو ئـەوێ بـەرێ کـەوتم زۆر زۆر بێتاقــەت بــووم ئەمویســت کــەمێ هــێمن ببمــەوە ئەمویســت ســەرکەمە ســەر قاچــە چلــە مێوەکــانی نــەنکم ئەمویســت کــەمێ لــە بۆنی ئەودا بنووم .

دوو ســێ جــار لــە دەرگــام دا هــەر وەك جــاران تــەقول بابــە کۆنەکـەی هـەر پێـوە مـابوو هـەر لێمـدا و لێمـدا ... پاشـان کردیـەوە هەســتت ئــەکرد جوبرائیــل بــەرەو روی هــاتووە و پــەیامی بەهەشـتی بـۆ هێنـاوە هێنـدەی پێخـۆش بـوو ووتـی : ئەمـە تـۆی جەرگەکەی نەنە رۆح و دڵی نەنە .

کــاردۆ : نەنــە گیــان چـۆنی باشـیت ؟ بـروا بکـە زۆرم بیـر ئـە کـردی ، دەمێکـە حەزەئەکـەم بێم بـۆ لات بـەس بـەخوا کـاتم نـەبوو بیــری خــۆتم ئــەکرد بیــری برنجــە خۆشــەکەت بیــری گۆشــتە قاورەمەکـەت بیـری چـا بەتامـەکان کـورە وەڵا بیـری بـۆنی لیفـە پەرۆکەش ئەکەم .

نـەنکم : ئـای بـەخێر بێـت بەسـاقە ، وەرە ژۆرێ نەنـە لـە دەوری سـەرت گـەرێ وەرە بـە قوربـان ئـەوە بـۆ دیـار نیت رۆڵـە گیـان بـۆ نایـەی ، مـن بـۆنی دایکیشـت لـە تـۆوە ئەکـەم بـە قوربـان مـن بـە تـۆ سـەبوریم دێ دەوەر وەڵا ئـەها ئێسـتا بـرنجم خسـتۆتە سـەر ئـاگر گۆشتەکەی نیوەرۆشم ماوە شانسی خۆت .

کـــە چوومـــە ژورەوە وەك جـــاران بـــوۆنی برنجەکـــەی بـــۆنی عەلادینەکــەی بــۆنی گۆشــتە ســورە کراوەکــەی هــەموی هاتــەوە

نــاخم ئــای لــەو بۆنــە خۆشــانەی پــڕن لــە شــادی پــڕن لــە بیــرەوەری جــوان ئــەو بۆنــەپڕ یادگــاری یانــەی وەك بــۆنی نیرگــز و شــەوبۆ و لــەعلی بــەهاران بــوو دنیــایی ئێمــە هــەمووی گــۆڕا بــوو بــەڵام لــە مــاڵی نــەنکم جــوانی یــە کۆنــەکانی و شــتە کۆنــەکانی وەك خــۆی ئــەو ئــەیوت مــن تــامی بــرنج ناکــەم ئەگــەر لــە مەنجــەڵی مــس دا نــەبێ ئــەیوت بــە خــوا جێگــەم نــی یــە ئــەگینا هــەر لــە ســەر دار چێشتم لێ ئەنا .

کــاردۆ: نەنــە گیــان دەنــگ و باســت سیحەتت چۆنــە تەندروســتیت پێم بڵێ چۆنی لەگەڵ نوێژەکانتا چۆنی ؟

بــەدەم تێــك هەڵــدانی برنجــە بــۆن خۆشــەکەیەوە ووتــی : خــراپ نــیم بـــــەقوربان بـــــە ناشـــــکوری نـــــەبێ هـــــەر ڕۆژەی نەخۆشـــــیەك ســەردانمان ئــەکا ، ئیتــر ئەمکــە پیــری یــە ڕۆڵــە گیــان ، چــی بکــەین میــوانی هەمووانــە ، بــە خــۆا ئــەم هەفتەیــە دوو دەیــم یــاوە بــە دەرمــان باشــیش نــەبووم ، پەراســوم ئــازارم زۆر ئــەدات خــۆ هــەر زوو زوو قیــرو زفتیشــی لــێ ئەیــەم ، بــەخوا ڕۆڵــە دوینــێ ئــازاری لــە پشــتمەوە هــات بــە شــان و ملمــا لــە باڵمــەوە چــووە دەســتم و لــەوێوە دەرچــو خــەریبوو گیــانم دەرچــێ ، بــە خــاڵتم ووت بمباتــەوە بــۆ لای دکتۆرەکــە ووتــی بابــە تــۆ دکتۆرەکــەت شــێت کــردووە

هەفتـــەی ســێ رۆژ لای دکتــۆری ، چـــی بکـــەم بـــە قوربـــان خــۆ منـیش حـەزەکم لەشـم سـاغ بێـت بـەس بـە ناشـکوری نـەبێت کـە دایـم نـــەخۆش بـــم چـــی بکـــەم ، بـــەس لـــە خـــوا بـــەزیاد بـــێ ئـــەتوانم نوێژەکانم بکەم ئەوە بۆ من بای هەموو دنیایە بەساقە .

نـەنکم زۆری حـەز بـە خـوا پەرسـتی بـوو هیچیشـی لـە دینـداری نـە ئـــەزانی هەرچەنـــە لای ئـــەوان دینـــداری هێشـــتا جـــوانی یـــە کۆنـــەکانی مـــابوو مـــن زۆر جـــار ئـــەمووت ئەمـــە کلتـــوری خۆمانـــە ئـەم جـوانی یـە ئـەو کـات دیـن پـاك بـوو یـەك خـواو یـەك پیغەمبـەر و یـــەك قورئـــان و یـــەك رێگـــە هـــەبوو بـــۆ خـــوا پەرســـتی ئێســـتا هـــەزارەها رێگـــە هەیـــە لـــە هەموودینەکانـــدا ، هـــەموو جـــارێ کـــە نـــەنکم قـــل و الله ی ئەخوێنـــد ئـــەیوت فـــول هـــو الله ، منـــیش ئـــەمووت نەنــە گیــان بڵــێ قــل هــو الله احــد ، ئەمەنــدە جــوان بــوو ئــەیووت رۆڵـە بـێ ئیمـانم مەکـە بـەم ئـاخری عـومرە ئـەوە فـول هـو الله احـد بـەقوربان ئەمـە مـلا حەسـەن بەرەحمـەت بـێ فێـری کـردووم ئـەوە قورئـــان خوێنەکـــەی بـــاپیر بـــوو بەســـاقە تـــۆ چـــی لـــە نـــوێژ ئـــەزانیت رۆڵـــە خـــۆ تـــۆ بـــە ناشـــکوری نـــەبێت نوێژەکـــان ناکـــەی بـــەم ئـــاخری عومرە بێ ئیمانم مەکە بەساقە .

ئـای لــە جـوانی نـاخی نــەنکم روخساریشــی جـوان بـوو بــە دەسـت ئــەو بوایــە ئێســتاش جگــەری خــۆی بــۆ دەربهێنامەیــە و بــۆی ببرژاندمایـە ، جـاری وا هەیـە لـێم تێـك دەچێـت ئـاخۆ خۆشەویسـتی هێلــین زۆرتــره یــان ئــەوەی نــەنکم خۆشــم پێكــەنینم بــەم بیرکردنەوەیەم دێت .

نەنکم : رۆلەَ کاردۆ گیان ئەوە کەی ژن ئەهێنی بە ساقە ؟

جـار نـی یـە ئـەم پرسـیارەم لـێ نـەکا هـەموو جـارێکیش ئـەڵێت رۆلـە گیـان بـا تـا نـەمردوم منـاَلـەکان بگرمـە بـاوەش منـیش ئـەبێ هـەموو جـارێ بـە هـەمان تـۆن و هـەمان رسـتە وەڵامـی بەمـەوە بڵـێم : نەنـە گیان ئیشەڵا ئەیهێنم .

مـن ئــەزانم ئــەو چ حــەزو ئــارەزوی یــەکی هەیــە لــە ژن هێنــانی منـدا بۆیـە هـەموو جارێـك ئـەیوت : دە رۆڵـە گیـان بـا پـێش مـردنم منالـەکان بکەمـە بـاوەش بـە سـاقە دە خـۆ مـن چـەنێکم مـاوە بەسـەر دنیاوە ها کا رۆشتم .

پێکـەنیم ووتـم ، نانـا نەنـە گیـان تەمـەن درێـژ بیـت خـەم نـەبێ نەنـە گیــان ئیشــەڵا ئــەیهینم ئەمــەوی کەســێ بێــنم خۆشــم بــوێ بتــوانم لەگەڵی بژیم عاشقی بم ئەویش عاشقم بێت .

نەنکم : ڕۆڵە گیان خۆشەیستی وعەشقی چی ؟

کاردۆ : نەنە گیان واتا بە ڕۆح و دڵ عاشقی بم لە خۆم زیاترم خۆش بوێ.

ویستم عەشقی بە زمانی ئێستامان پێ بڵێم ویستم وێنەی عەشقی لای خۆمی بۆ بکێشم پێم ووت نەن گیان عەشق لە پەشمەك نەرمترە ، ڕەنگاوڕەنگە ، تامی شیرین شیرینە ، لە برسێتی و تینوێتی دەمان پارێزێ .

لەوە ئەچو نەنکم بیەوێ زیاتر بمخاتە قسەو قسەی زلی بۆ بکەم بۆیە پێ ی ووتم : کوڕم، ئەم عەشقە کیلۆی بە چەندە ؟

هەرچەندە هەستم کرد نەنکم کەمێ گاڵتەی بە قسەکانم دێ ووتم : نەنە گیان عەشق هەنگاو لە دوای هەنگاو وات لی دەکات زیاتر پێکەنین بە ژیان بیت ئەزانی نەنە وەختی عاشق مەعشوقەکەی لەوێ نەبێ ئیتر چاوەکانی باشبن یاخراپ هیچ فەرقی نیە چونکە ئەو ئیتر نایەوێ هیچی تر ببینێ. وەختێ عاشق دەبین هەمیشە لە دڵەوە پێئەکەنین نەنە ئەگەر بەشوێن عەشقدا بڕۆیت ئەگەیتە ئەو پەڕی دونیا بە سەر قولەی قافا

سـەر ئەكـەوویت دەگەیـتە شـارێك هەمـوو خەڵـكەكەی خۆشـبەختن پێكەنین ئاڵایانە !.

نـەنكم لـە هیچ تـێ نەگەیشـت یـان نـەی ئەویسـت وای دەربخـات كـە تێنەگەیشـتووە لەوانـەش تێگەیشـتبێ بـەڵام نەیویسـتبێ خەونـە جوانـەكانی مـن تێـك بـدات ، ئـەو بـە سـادەیی و جـوانی یەكـەی خـۆی سـەیری شـتەكانی ئـەكرد بـێ ئـەوەی دڵـم بئێشـێنێ سـەیرێكی كـردم و ووتـی : رۆڵـە گیـان جـا ئەمـە شـێتی یـە بەسـاقە ، بـا بـۆت روون بكەمـەوە كـاردۆ گیـان ئـەوەی مـن لـە ژیانمـا لـە پیـاو تێگەیشـتبم ئەگـەر هـەموو ئافرەتـانی دونیـا بدەنـە پیاوێـك تـەنها یـەكێكیان نـەبێ ئـەوا پیاوەكـە حـەزی بـۆ ئـەو تـەنها دانەیـەش دەچێت ئەوە سروشتی پیاوانە .

كاردۆ : وەڵا وایە نەنە گیان بەس چی بكەم چی ئیتـر دنیـا وای لێهاتووە .

لـە مـاڵی نـەنكم تێـرم لـە برنجـە بـۆن خۆشـەكەی وگۆشـتە بەلەزەتەكـەی خـوارد و لـە تەنیشـت سـەماوەرەكەی دانیشـتم و هێنـدەم چـا خـوارد ترسـی ئـەوەم هـەبوو تـا حـەوت شـەو خـەوم لـێ نەكـەوێت بیـری منـاڵیم كەوتـەوە كـە چـام زۆر ئـەخوارد نـەنكم

ئـەیووت بـەس چـا بخـۆرەوە شـەو میـز ئەکـەیت بـە خۆتـا رۆڵـە ، بـە دیـار بیسـتنی یادگـاری یـەکانی و گێرانـەوەی رۆژە خۆشـەکانی تەمەنیـــەوە ، لـــە گـــوێ عەلادینەكـــەی دانیشـــتبوین بـــە دەم گوڵـــە بـەرۆژە خـواردن و چـا خواردنـەوە وێنـە کۆنـەکانی دایکـم و خـۆی و بـــاپیرەمی نیشـــان ئـــەدام لـــە هـــەموو گێرانەوەیەکیـــدا هەســـتت ئـەکرد ئێَسـتا لـەوێ هاتۆتـەوە ،ئەونـدە بـە جـوانی باسـی دیمـەن و قســەکانیانی دەکــرد لات وا بــوو هێشــتا زەمــەن لای ئــەو وەســتاوە ئـەو شـەوە لای نـەنكم مامـەوە هـەر وەك جـاران لـە ژێـر لێفەکـەی خـۆی بـە پـەرۆی دراو و رەنگـاو رەنـگ دروسـتی كردبـوو کـە ئـەتووت تابلۆیـەکی چەنـد رەنگەیـە خـەوتم تـا بـەیانی بـە خەبـەر نـەهاتم لەگـەڵ ئـەو هـەموو چایـەی خواردبـووم ، بـەیانی کـە چـووم بـۆ دەوامەکـەم لـە رۆژانـی رابـردوو زیـاتر بێزارتـر بـووم هـەمان دووبـــارە بوونـــەوە بـــوو بگـــرە دۆخەکـــە ئـــاڵۆزتر ئـــەبوو وە دەوامەکـە بـەرەو کـزی ئـەچوو هـەر کـە هاتمـە دەروەو لـە دەوام نـانێکم خـوارد لـە چێشـتخانەکەی تەنیشـت دائیـرە و پاشـان بـەرەو چایخانەکـەی لای مـاڵێ خۆمـان بـەرێ کـەوتم تـا لـەوێ چایـەك بخۆمەوە .

لـە چایخانەکـە رامیـارم بینـی بـەرەو کورسـی یەکـەی تەنیشـت ئـەو چـووم لـە تەنیشـتی یـەوە دانیشـتم و پـێم ووت : چۆنی کاکـە رامیـار دەنگ و باست ؟

رامیــار : بــەخێربێیت یــاخوا ، مــن باشــم ســوپاس بــۆ خــوا ئــەی تۆچــونی کــاردۆ ، ئــەو بــۆ وات لیهــاتووە نــەخۆش دیــاری یــا بیتاقــەتی چیتــە هەســتەکەم زۆر تێکچــووی هەســتەکەم رەنگــی دەم و چاووت زەرد بووە هیچ هەیە وا وات لێهاتووە ؟

منــیش مانــدوێتی جەســتەم و هیلاکــی رۆحــم شــەکەتیان کردبــووم پـێم ووت مـن ئـەڵێت رامیـار گیـان مـن .. ئـای لـە مـن ، منێـك کـە نـازانم بـۆ کـام خەمـەم بگـریم ،منێـك لـە ئـازارو گریـان و پێکـەنین منێـك تێکـەڵ لــە ســاڵی کــوژراو لــە مــانگی نــەخۆش و لــە رۆژی پــەك کەوتــە ، تکەیــەك بــارانی حــوزن ببــارێ ئــەبێ بــەر چەترەکـەی مـن بکـەوێ مـن لـە ووشـکی ئـەو دارە دەچـم کـە بـە فویـەك دەشکێ لـە من گـەرێ .. منێـك پـر لـە ئـارەزوی منـاڵی پرلـە ئــازاری داهــاتو پــر لــە خــەم وتــەنهایی و مانــدوێتی منێــك وەك هەموو منەکانی تر .

سەرســـــام و چـــاوەرێ منێـــك وەك تــۆ وەك ئـــەو وەك هـــەموو هەمیشــە لــە ئــازار و بەختــەوری و و گریــان و فرمێسـك رۆژ بــە دەسـتی رۆژ ئـەدەین هـیچ هیچـیش تـێ ناگـەین هـەرگیز بـە هیچـیش ناگـــەین ، رامیـــار گیـــان لـــە مـــن گـــەرێ پێكـــەنین تـــازە ئـــەم زەرەرەی روخسـار و نـاخی منـی پـێ نـاژمێرێ هـا كـا گریـانێكی قـوڵ هـات ئـەو كـات ئـەم تـۆزە پێكەنینەشـم ئـەمرێ ، لێمگـەرێ بـا زەمـــەن كـــەمێكی تریشـــم لـــێ بـــەرێ ئێمـــە خەمـــەكانمان پیـــری كردین نەك تەمەن .

بـروا بكـە رامیـار مـن گومـانم لـە مـرۆڤ بـونی خـۆم هەیـە بـەس ئەونـدە ئـەزانم كـەس نـی یـە ئەونـدە بەرگـەی ئـازار بگـرێ مـن لەگــەڵ تــەنهایی و ئازارەكــانی خۆمــدا رەنگـم گرتــووە سـیمام لــە تـــاریكی و چاوەكـــانم لـــە مـــۆمیكی ســـور دەچـــێ لێمگـــەرێ .. بازەمــەن كــەمێكی تــریش لــە رۆح و جەســتەم بــەرێ بزانــە رامیــار بــروا بكــە تەنانــەت خەوەكانیشــمان ئیكســپایەر دەبێــت ئەگــەر زۆر لە ناخما بمێنێتەوە نەیەتە دەرەوە .

رامیــار : ئــەك مــاڵ ئــاوا بــێ ئــەم هــەموو خەمــە لــە كـوێ هەڵئــە گـری ، كــاردۆ تاكــە كەســێ كــە هەمیشــە لــە ژیانتــا لەگــەڵ ئــەبێت خـۆتی لەبــەر ئــەوە لــە رادە بــەدەری خـۆی زیــاتری مەخــە ســەر

شــان بــا تــا دوا ئارامگــەت بەرگــە بگــرێ ، بابــە تــۆ بــۆ ئەمەنــە رەش بینــی بــۆ ئەمەنــە مــەراق و خەفــەت ئــەخۆی ، بــرام گــوێ لــە قورئــان بگــرە بزانــە چــەن هــێمن ئەبیتــەوە ، کــاردۆ گیــان ئــەی ئــەوەت نەخوێندۆتــەوە لــە قورئانــا کــە خــۆای گــەورە دەفــەرموێ ( تــەنها بــە یادکردنــەوەی خــودا دڵــەکان هــێمن ئەبنــەوە ) دە بــرام بــۆ وا لــە خــۆت ئەکــەی وەڵا گوناحــت ئــەگات تــۆ بگــەرێرەوە ســەر رێگــای راســتەقینەو ئیمــان ئــەو کــات هــەموو شــتەکان بــاش ئــەبێت .

کــاردۆ : کاکــە رامیــار تــۆ خــەمی مــن نــەبێ مــن لەگــەڵ خــەم هــاورێین هــاورێ تــۆ پــێم بڵــێ تــۆ چــۆنی .( تــەنها بــۆی بــو مــن بســەلمێنێ کــە دیــن و بــاوەر رێگــەی راســتەو ئــەوەی لەســەر ئــەو رێگەیــە بێــت هەمیشــە ســەرکەووتوە بــۆ ئــەوەی بتــوانێ قەناعــەت بــە مــن بکــا بچمــەوە نــاو دیــن و دینــداری ، ووشــەکانی بەشــێوەیەك بــوون کــە وەك ئــەوەی پێــت بڵێــت ئــاین رزگــار کــەری دەرونــی مرۆڤــە لــە تــرس و دڵــە راوکــێ و گومانــەکان ، کێشــەکە ئەوەیــە ئــەو تێناگــات مــن تــازە زەحمەتــە بچمــەوە ئــەو گێــژاوە ، بگــرە ســاڵانێکی زۆری ویســت تــا تــوانیم بگەمــە حەقیقــەتی ئاینــەکان ئەمــە خوێندنــەوەو گــەران و مانــدووبوونی زۆری ویســت

شـــەونوخونی و چەنـــدەها شـــەری نـــاو نـــاخی خـــۆم و دەرەوەی ویســـت چەنـــدەها پەرینـــەوەی ویســـت بەســـەر تـــرس و دڵـــە راوكێكانی مێژومدا ).

رامیـــار : پشـــتیوان بـــە خـــوا مـــن زۆر باشـــم مـــن نـــاخم ئارامـــە ئاراسـتەی رێگـام دیـارە لـە ژیانـدا ئـەوەی لای مـن گرنـگ نـی یـە ئـــەم ژیانەیـــە مـــن ئامـــانجی گـــەورەترم هەیـــە رێگـــای مـــن زۆر پیرۆزتـــر و بـــەهرەدارترە لـــەم ژیانـــە پـــرو پوچـــەی ئێـــرە هـــەر ئەوەنەیـە شـتەكانم كاتیـان مـاوە دەنـا پشـتیوان بـە خـوا رۆیشـتنم بـۆ بەدەســـت هێنـــانی رەزامەنـــدی خـــواو پێغەمبـــەر و گەیشـــتن بـــە ئەولیاو پیاو باشان لە بەهەشت زۆری نەماوە .

كاردۆ : ئامانجەكەت چی یە ؟

رامیـــار : گەیشـــتن بـــە خـــوای گـــەوەر بـــە ســـەربەرزی رازی بوونی پێغەمبەر لەسەرمان تا شفاعەتمان بۆ بكا لە قیامەتدا .

كاردۆ : بە چی ئەگەی بەمە ؟ .

رامیـار : ئـەم رێگەیـەی ئێسـتا گرتوومـە و بـەردەوامم لـە سـەری ئاراستەكەی بەرەو ئەوێ یە .

کــاردۆ : ئــەتوانم پرســیارێکی زۆر تایبــەتت لــێ بکــەم وا بــزانم جــارێکی تــریش ئــەم پرســیارەم لێکردوویــت و وەڵام نەدامــەوە . باشــە رامیــار تــۆ قــەت خۆشەویســتیت کــردووە ؟ قــەت هەســت بــە ســۆزی ئــافرەت کــردووە ؟ قــەت بــووە دەســت بخەیتــە دەســتی کچێکــەوە موچرکــە بــە لەشــتا بێــت ، تاقیتکردۆتــەوە وەختــێ لێــو ئەخەیتــە ســەر لێــوی کچــێ چــی گــەڵا هەیــە لــە خۆشــیانا ســەما ئەکەن .

رامیــار بــە چــاوێکی تێکــەڵ لــە تــورەی و لــە فرمێســك کــەمێ بێــدەنگ بــوو هەناســەی قــوڵی هــەڵ ئەکێشــا ، هەســتم بــە پەشــیمانی یــەك یــان ئازارێــك ئــەکرد لــە ناخیــدا ، مــن وا تێگەیشــتم ئــەو خۆشەیســتی یــەکی هــەبووبێ ئێســتا لــە وادەی لــە بیرکردنــی بێــت یــان تامــەزرۆی مــاچێکی نــاخی هەژانــدووە ، ئــاخر خــۆی کــە مــرۆڤ خۆشەویســتی هــەبێت هەســتەکانی پێناســە نــاکرێن بــە ئاسانی .

رامیــار : بــەڵی کردوومــە وە تــا ســەر ئێســقان پەشــیمانم و چەنــدەها جــار داوای لێخۆشــبوونم کــردووە لــە خــوا چەنــدەها شــەو گریــاوم تــا بــەیانی و پاراومەتــەوە تــا خــودا لــێم خــۆش بێــت ، چــەنێك خێــرو

سەدەقەو چاکەم کردووە لە پێناو لێخوش بوونی خودا لەو کارە قێزەونە گوناحانەی کە لە رابردودا کردوومە .

راستی رامیار جاران وا نەبوو ئەو کورێکی ساختەچی و زۆرزان و هار بوو تەنانەت زۆر جار هەر شەرێك بکرایە بە دڵنیایی ئەمانزانی رامیاری تێدایە چەقۆکیشێکی سەیر بوو شارەزای لە هەموو جۆرە یاریی یەکاندا هەبوو ئەوە پەیوەندی یەکانیشی لەو لاوە بوەستێ .

کاردۆ : باشە بۆ هەست بە تاوان ئەکەیت هیچت کردووە لەگەڵی و پاشان وازت لێهێنابێت .

رامیار : ئەوە تۆ ئەڵێیت چی بە تورەی یەوە من چۆن دەست ئەدەم لە ئافرت نەخێر تەنها ئەوەندەیە ئێمە بەرێگەیەکی نا شەرعی یەکمان ئەبینی کە لە دەستوری ئێمە موسڵمان قەدەغە کراوە، وە من لە خواد بە زیاد بێت لە پاش تۆبە کردنم هەرگیز نەچوومەتەوە سەر ئەو کارە بەد رەوشتی یانە ، ئەی ئا پێم بڵێ بزانم تۆ خۆت لە خوا ناترسی ئەم شتانە ئەکەیت ، پێم بڵی ئەترسی یان نا ؟ بەس راست وەڵام بدەرەوە .

هەستم کرد ئێستاش لە وەڵامەکانیا درۆ ئەکات ، چوونکە من گومانم زۆر بوو لەسەر وەڵامەکانی ، من لە منالی یەوە رامیار ئەناسم ، سەیرێکم کردو پێم ووت : راستیت پێ بڵێم نەخێر من لە هیچ ناترسم ، ئینجا ئەوە بزانە رامیار ئەزانی بۆ من لە هیچ ناترسم ئێستا بۆت شی ئەکەمەوە زۆر ئاسانە سەیرکە هەر کات مرۆڤ وازی لە بیرکردنەوە هێنا لە داهاتوو ئیتر ترسی نامێنێ لە هیچ شتێ ، منیش بیر لە داهاتوو ناکەمەوە ئیتر بۆ بترسم پاشان لە چی بترسم ؟.

رامیار : چۆن بیر لە داهاتوو ناکەیتەیەوە ؟ ئەمە سەر لێشواوی یە ئەی تۆ چۆن ئەژیت بۆ چی ئەژیت ئامانج و ئاواتی تۆ چی یە لە ژیاندا .

کاردۆ : نا ، من بۆ بیر لە شتێك بکەمەوە کە هیچی لە دەسەڵاتی مندا نی یەو توانای هیچم نی یە بەسەریدا وە ناشزانم لە داهاتوودا چی دەگوزەرێ ، هەر بۆیە من ئاسودەم بەوەی بیر لە داهاتوو ناکەمەوە .

راستی یەکەی نەم ئەویست بچمە باسی قوڵتری بابەتکە زانیم رامیار تەنانەت لەو دینەی کە خۆشی تێیدایە تێ نەگەیشتووە

بۆیــه بــاس کردنــی بابــەتێك لەگــەڵ کەسـێکدا کــه شــارەزای نــەبێت لــەو بابەتــه بــێ مێشـکی یــه، دەنــا خــۆ خــوا ئــەڵێت یــەکتان خــۆش بوێـت بـەس ئـازاری کـەس مـەدەن ، پاشـان ئـەویش بـۆی بابەتەکـه بگۆرێ ووتی .

رامیــار : باشــه کــاردۆ تــۆ چــۆن ئــاوا ئــەژیت ؟ ئــەی مــرۆڤ چـۆن ئـەبێت بـروای نـەبێت چـۆن ئـەبێت بـەم شـێوەیه بـژی ئـەی کـوا دەسـتورو یاسـایی تـۆ لـه ژیانـا چـی دوور ئەکاتـەوه لـه تـاوان لـه گونـاح تـۆ تەنانـەت لـه مـردنیش ناترسـی لـه عـەزابی قـەبریش ناترسـی تـۆ پێناسـەیەکت نـی یـه بـۆ ئـەو ژیانـەی کـه تێیـدایت پێناسـەیەکت نـی بـۆ مردنـی خۆشـت ، خۆشـت نـازانی بـۆ ئـەژیت و بۆ ئەمریت؟ .

کـاردۆ : رامیـار گیـان مـن نکـۆڵی لـەوه ناکـەم کـه مـن پێناسـەم نـی یــه بــۆ ژیــان وه نیشــمه بــۆ مــردن وه راســته مــن نــازانم بــۆ هاتومەتـه ئـەم دنیایـه بـەڵام ئـەوه بـاش بزانـه تـۆش نـایزانی تـۆش پێناســەت نــی یــه بــۆ ژیــان و بــۆ مــردن ، کاکــه گیــان بیــر کردنــەوەو لــه ژیانــدا گرانتــرین ئیشــه ، لەبــەر ئەوەیــه کــه کــەم کــەس بــەکاری دەهێنــێ ، تــۆ وەرەو بیــر لــەوه بکــەرەوه بزانــه ئـەوەی ئاینـەکان ئـەیڵین لەسـەر مـردن و ژیـان هـەمووی دروسـت

کـراوی مێشـکی مرۆڤـە ، ئـەوە بـە تێپـەربوونی کـات لـە میـژەوە بەشـەرییەت گیـرۆدەن بەدەسـت ئـەم پرسـیارانەوە تـۆ بـرۆ مێـژوو بخوێنــەوە بــەڵام هــەموو مێژووەکــان نــەك تــەنها مێـژووی دینــی ئــەبینی هــەر کۆمەڵگایــەو بــەجۆرێك وەڵامیداوەتــەوە ، تــەنها بــۆ ئــەوەی خــۆی لــە ترســی داهــاتوو و تێنەگەیشـتنی ژیــان رزگــار بکـات شـتێکی دۆزیوەتـەوە تـا هـەموو پرسـیارە نادیارەکـانی خـۆی پێـدا هەڵبواسـێ هـەر بۆیـە نادیـارێکی دۆزیوەتـەوە بـۆ هەڵواسـینی ئـەو پرسـیارانە تـا بـروا بـە خـۆی بێنـێ بڵـێ بۆیـە وەڵامـم نـی یـە چونکـە ئـەو نادیـارە ، لـە هـەمان کاتـدا  هیوایـەکی داوە بـە خـۆی کـە لـە دوای مـردن وەڵامــی هــەموو ئــەم پرسـیارانە بزانــێ کــە ئەمــە هیوایــەکی وەهمــی یــە . بــەس مــن پێــت ئــەڵێم ، هــەرگیز منــیش و تــۆش ناگەینــە ئــەو وەڵامانــە کــارێکی بێهودەیــە گــەران بـــەدوای ئـــەو وەهمانـــە .لەگـــەڵ ئەوەشـــدا هـــەموو تـــاکێ یـــان کۆمەڵگایـەك پێویسـتی بـە یـەکێك لـە سـێ شـت هەیـە  جـا یـا ئـاین بێـت یـا رەوشـت بێـت یـا یاسـا بێـت تـا ریـرەوی ژیـانی رۆژانـەی بـە ئاراســتەیەکی پاکــدا ببــات دەنــا ناســینی خــودا کــارێکی قورســە و پێویســـت ناکـــات بیبەســـتیتەوە بـــە ژیـــانی رۆژانـــەو تێگەیشـــتنی هەنـدێ شـتی کەسـی کـە ،هـەر یەکـەمان بـە بیـرو فکـری خـۆی تێـی ئەگات .

رامیـار : نـەخێر قـورس نـی یـە ، ئـەوەتا قورئـان هـەموو شـتێکی تێدایـە هـەمووی روون کردۆتـەوە مـن ئـەتوانم هـەزارەها بەڵگـەت بـۆ بێنمـەوە لـە قورئـان دا کـە باسـی هـەموو خـاڵێکی ئـەم گەردوونـە بکات.

کـاردۆ : مـن رێـز لـە قورئـان و هـەموو کتێبـە ئاسـمانی یـەکان ئـەگرم وە رێـز لـە هـەموو بۆچونێـك ئـەگرم بـە مـەرجێ تونـدو تیـژی و ئـازاری تێـدا نـەبێ بـەڵام مـن پـێم ووتـی سـەرچاوەی تـریش بخوێنـەوە نـەك بـە تـەنها کتێبـە ئـاینی یـەکان ، بـا مـن بـە شـێوەیەکی تـر بـۆت شـی بکەمـەوە ئـەم پێاڵەیـەی بـەردەممان مرۆڤ دروستی کردووە وا نی یە.

رامیار : بەڵێ .

کـاردۆ : ئەگـەر کاتێـك ئـەم پیاڵەیـە تـوانی بزانـێ مـرۆڤ کـێ یـەو چـی یـە ؟ ئـەو کـات ئـەویش واتـە پێاڵەکـە ئـەتوانی پێاڵەیـەکی تـر دروسـت بکـا واتـە ئـەویش ئـەبێ بـە خواوەنـدی پێاڵـە وایـە ؟ بـە هێمنی وەڵامی دامەوە : وایە .

ئـێ ئێمـەش هـەمان بابـەتین ئەگـەر بڵێـین خـودا ئێمـەی دروسـت کـردووە ، ئـەوا ئێمـە نـاتوانین بگەینـە ئاسـتی ناسـینی خـودا

هـەرگیز ، دەنـا ئەگـەر بگەینـە ئـەو ئاسـتە ئـەو کـات ئێمـەش ئـەبین بە خودا و دروست کەر وە جیاوازی نامێنێ لە نێوانماندا .

رامیــار : ئـــەوە تـــۆ ئـــەڵێت چـــی کـــاردۆ تـــۆ توشـــی گوناحـــەمان ئەکـەیت بـە خـوا ئـەم بابەتـە وا لێبکـەی ئـەو کـات مـن بـرۆم باشـترە تۆ ئەتەوێت بەهەر شێوەیەك بێت بروا نەهێنی و تەواو .

ئەمویســت تـــێ بگەیـــەنم مـــن تاوانبـــار نـــیم ، ئەمویســت بـــۆی شـــی بکەمـــەوە بیرکردنـــەوەی مـــن چۆنـــە ، مـــن نەمەویســـت ئـــەو بـــە شـــێوەیەکی هەڵـــە لـــە بۆچـــوون و بیرکردنـــەوەکانم تێبگـــات بـــەڵام زانـیم سـوودی نـی یـە ، ووتـم باشـە مـەرۆ بابەتەکـە ئـەگۆڕین ئـەوە باشترە .

بـــەس بـــروا بکـــە رامیـــار گیـــان مـــن قـــەت حـــەز بـــە موناقەشـــەی بابـــەتی دینـــی ناکـــەم چونکـــە هـــیچ ئـــەنجامێکی نـــی یـــە زۆر جـــار جـــار ئـــاوا کەوتومەتـــە گفتـــو گـــۆ و کێشـــمە کێشـــی ئـــاینی یـــەوە ســـەرەنجامەکەی بـــە دڵ رەنجانـــدنی لایـــەك کۆتـــایێ دێـــت چونکـــە تاکـەکانی ئێمـە بـە زەحمـەت بیـر و رایـان دەگـۆڕن و رێگـە ئـەدەن بـە بیرکردنـــەوەیان فـــراوان بێـــت ، بـــەس تـــۆ خـــۆت بابەتەکـــەت کـــردەوە . لەگـــەڵ ئەوەشـــدا رامیـــار گیـــان بـــاش ئـــەوە بزانـــە ئەگـــەر

دووکـــەس لەبـــەر خـــاتری هاوڕێیـــەتی ، ناچـــار بـــن تـــا کۆتـــایی تەمـــەن درۆ لەگـــەڵ یـــەك بکـــەن؛ ئـــەوا باشـــترە بـــە تـــەنیا دابنیشـــن و بیـــر لـــەو شـــتانە بکەنـــەوە کـــە خۆشـــیاندەوێ ،بۆیـــە تـــەنها ئەوەندەیـــە مـــن نامـــەوی درۆت لەگـــەڵ بکـــەم  دەمـــەوێت ئـــەو راســـتیانەت پـــێ بڵێم کە من خۆم بڕوام پێیانە  .

راستی یەکـەی مـن ئەمویسـت پـێ بڵـێم جیهـان پـڕە لـە مرۆڤـی بـاش بـە بـێ ئـەوەی پەیوەنـدیان هـەبێت بـە بیـرو بـاوەڕو ئاینـەوە ، بـەڵام تـۆ گـەر نـەت تـوانی تەنانـەت یـەک مرۆڤـی باشـیش بدۆزیتـەوە ، هـیچ نـەبێت خـۆت بـاش بـە بـەدەر لـە بیـر و بـاوەڕ و دینەکـەت ، ئەمویسـت تێـی بگەیـەنم کـە مـن و ئـەو دوو گەسـی باشـی ژیـانین ئـەم باشـی یـەمان پەیوەنـدی نـی یـە بـە بیـر و بڕواکەمانـەوە ئـەوەتا چەنێك بیرو باوەڕمان جیاوازە دە هێندە پێکەوە جوانین .

رامیـار : ئـاخر باشـە ئـەی تـۆ چ یاسـایەکت هەیـە لـە ژیانتـا ئـەی تـۆ چـــۆن ئـــاوا ئـــەژیت ؟ ئـــەی تـــۆ کـــە ئـــەمریت ؟ ئەتـــەوێ بـــەم بیرانەتـــەوە بگـــەی بـــە کـــوێ ئـــەی لـــە کـــوێ وە هـــاتووی ، ئـــاخر ئەمـــە کێشـــەکەیە هـــەرچی هەڵئەســـێت فەلســـەفە لـــێ ئـــەدات لەســـە رژیـــان و خۆشـــی هیچـــی زانیـــاری یـــەکی نـــی یـــە لـــە بـــوون و نەبووندا .

کـاردۆ : مـن نـازانم لـە کـوێ وە هـاتووم وە ناشـزانم بـەرەو کـوێ ئـەچم ئەمانـە شـت گـەلێکن لـە سـەرەتایی بوونـەوە بـە نهێنـی ماوتنەتـەوە لەوانەیـە هـەر بـۆ خـۆی جـوانی گرنگـی بابەتەکـەش لـەوەدا بـێ ت کـە تـا ئێستاش نهێنـی یـە بـەڵام خۆ مـن پێویستیم بـەم نهێنـی یـە نـی یـە لـە ژیانـدا بیـزانم تـا بتـوانم گـوزەر بکـەم ، مـن سـەرەتا ووتـم هـەموو تـاکێ پێویسـتی بـە یەکێکـە لـەم سـێ شـتە هەیـە لـە ژیانـدا تـا گـوزەر بکـات ، یەکـەم رەوشـت ، ئـەو رەوشـتەی کـە مـرۆڤ لـە نـاخی منالیـدا هـەڵگرێتی ئـەوکات کـە مـرۆڤ نـاخی خـۆی و رەوشـتی خـۆی رێنیشـاندەری بێـت تـا دور کەوێتـەوە لـە تـاوان ئـەو تاوانانـەی کـە لـە سـەرتای دروسـت بـوونی مرۆڤـەوە زیـانی بـە بەرامبـەر گەیانـدووە ، بـە واتـا مـن ئـەو تاوانـە بـە تـاوان ئـەزانم کـە تـۆ ببیتـە هـۆی گەیانـدنی زەرەرو ئـازار بـۆ بەرامبەرەکـەت بـە واتـا رەوشـتێك بێـت ریگـەی تـاوان و هەڵـەکان لێبگرێـت ، مـن پـێم وایـە ئەمـە تاوانـە کـەی تـۆ دزیـت کرد ئەوە تاوانە ئیتر دزی بە هەموو جۆرەکانی یەوە.

دووهـەم یاسـا ، هـەر تـاکێ یـا کومەڵگایـەك رەوشـت تێیـدا بـاڵا دەسـت نـەبوو دەبـێ یاسـا جێگـەی ئـەو بگرێتـەوە واتـە خەڵکەکـە بـە یاسـا دەبـرێن بـە رێـوە بـە دڵنیـایی وەك یاسـای ئـەوروپا نـەك ئـەو

یاســـایەی لای خۆمـــان ، کـــە خـــۆی ســـەرچاوەی خراپـــەکان و کێشـــەو گەنـــدەڵی یەکانـــە ، ئـــەوکات تـــۆ ئاســـان بـــە یاســـا مامەڵـــە لەگەڵ خەڵکەکان دەکەیت و پێویست بە شتی تر نی یە .

هەرچەنـــدە یاســـاش هەمیشـــە وەک لاســـتیک وابـــووەو بە کەیفـــی دەسەڵاتداران ڕاکێشراوەو کورت کراوەتەوە.

سێهەم ، کـە ئەمـە لـە کۆمـەڵگا شـەرقی یەکانـدا هەیـە ئـەویش ئاینـە ، هـــەر کۆمەڵگایـــەك یـــان تاکێـــك نـــەیتوانی ئاســـتەکانی رەوشـــت بپێکـــێ و یاســـایەکی راســـتەقینەی نـــەبوو ئـــەوا بـــە دڵنیـــای ئـــاین جێگـــەی ئەگرێتـــەوە بـــۆ ئـــەوەی رێنمـــوینی خەڵکەکـــەی بکـــات ببێتـــە شێوە دەستورێك بۆ کاری رۆژانەی کومەڵگاکە .

رامیار : کەواتە خۆشت بروات بە وە هەیە کە ئاین باشە ؟

منـــیش زەردەخەنەیـــەکم کـــرد و ووتـــم ئـــاخر کێشـــەکە ئەوەیـــە ئـــاین ئەوەیـە کـێ ئـەیکات و چـۆن ئـەیکات ، بـە واتـا ئەگـەر بـە کـەلتورە جوانـــەکانی خۆمـــان بێـــت ئـــاین باشـــە وەك وەســـیلە بـــەکار بێـــت بـــۆ رێنمـــوێنی خـــەڵك تـــا کـــرداری چاکـــە بکـــات و دوور کەوێتـــەوە لـــە هەڵـــە کوشـــندەکان ، بـــەڵام ئەگەربـــە کـــەلتوری عـــەرەبی و کلتـــورە خـوێن ریژەکـانی پێشـوو بێـت ئـەوا ئـەوەی ئێسـتا ئـەیبنی لـە کوشـتن

و رفانـــدن و تۆقانـــدن و ســـەربرین و دەســـت بـــرین ، ئەوانـــە بنـــەماكانی ئـــاینن لـــە كۆمـــەڵگای عەرەبیـــدا یـــان لـــە كۆمـــەڵگا دواكەوتووەكانـــدا لـــە هـــەر شـــوێنێك كـــە ئـــاین بـــووە مایـــەی دڵـــەراوكێ و تۆقانـــدن ئـــەوە نـــەبوونی باشـــترە ، ســـەیركە رامیـــار گیـــان ئـــاین پەیوەنـــدی نێـــوان تـــاك و خودایـــە لەمـــە زیـــاتر نـــی یـــە وە بـــە واتـــا ئـــاین كارگـــەلێكی زۆر تایبـــەتی كەســـی یـــە ، هـــەرچی رەوشتیشـــە لـــە كۆمەڵگایـــەك بـــۆ كۆمەڵگایـــەكی تـــر ئـــەگۆرێت بۆیـــە باشـــتر وایـــە مێگـــەل بـــە یاســـا ببـــرێن بـــە رێـــوە هەرچەنـــە ئـــەویش بەشـــی خـــۆی بـــاش و خراپـــی هەیـــە بـــەڵام ئیتـــر ئەمـــە ژیانـــە ئـــەبێت بـــەم شـــێوەیەش دابـــەش بێـــت وەك ئـــەوەی یـــەكی دكتـــۆرە یـــەكێ ماموســـتایە یـــەكێ تەماتـــە فرۆشـــە و یـــەكێ كـــەناس ئەگـــەر بـــە ووردی ســـەیری كـــەی گرنگـــی هـــیچ كامیـــان لـــەوی تـــر زیـــاتر و كـــەمتر نـــی یـــە بـــە واتـــا ئەگـــەر تەماتـــە فـــرۆش و كەناســـەكەش نـــەبن وەك نـــەبو١ونـــی دكتـــۆرو مامۆســـتاكەیە ژیـــان تێـــك دەچێـــت هـــەر یەكەیان پێگەیەكی گرنگی خۆی هەیە لە ژیاندا .

بۆیـــە كومەڵـــەگاو تاكـــەكانیش بـــە جیـــاوازی یەكانیانـــەوە ئـــەتوانن بـــەردەوامی بـــدەن بـــە ژیـــان رامیـــار گیـــان ، مـــن تـــۆش راســـتە جیـــاوازین لـــە بیـــرو بۆچونـــەكانما بـــەڵام لەگـــەڵ جیـــاوازی

یەکانیشـــمانا تەنانـــەت لەگـــەڵ جیـــاوازی برواکانمانـــدا ، گرنـــگ ئەوەیە هەمیشە بە جوانی پێکەوە ڕێ بکەین .

رامیـار گیـان پزیشـکی، یاسـا، بازرگـانی، ئەنـدازیاری، هەمـووان گەڕان و بەدوا چـوونی زۆر باشــن و پێویســتن بــۆ درێــژە دان بە ژیـان، بەڵام شـیعر، جـوانی، ڕۆمانسـیەت، عەشـق، خۆشەویسـتی نیشـــتیمان ، هـــاورێی یـــەتی ئەو شـــتانەن کە ئـــێمە لە پێناویانـــدا دەژیـن و پێویسـتمانە لــە ژیانــدا تــا بتــوانین وەك مــرۆڤ گــوزەر بکەین .

رامیـــار : مـــن هیـــوا خـــوازم رۆژێـــك بێـــت و تۆبـــە بکـــەیت و بگەرەێیتـــەوە ســـەر دینـــی باوبـــاپیران ئـــەو کـــات نـــاخیش ئـــارام ئەبێتـەوە ( قسـەی هـاوێ یـەکم بـە بیـر کەوتـەوە کـە ئـەیوت هەنـدێ جـــار ناچـــاری لەگەڵ هەنـــدێك لە مرۆڤەکـــان هـــاوڕا بیـــت، تەنهـــا بـۆئەوەی لە کۆڵـت ببـنەوەو ڕزگـارت بێـت لێیـان.لـەوە ئـەچێ بـۆ ئـەم دۆخـە بـاش بێـت بـەڵام کێشـەکە ئەوەیـە مـن بـروام بـە وتنـی راســـتی هەیـــە هەمیشـــە هەرچەنـــدە زۆر جـــار راســـتی ســـەر ئەپەرێنێ .!ئەگەر نەشیپەرێنێ ئەیئێشێنێ .

کــاردۆ : بــروا بکــە رامیــار مــن نــاخم ئارامــە ، بــەڵام دروســتی ژیــانی مــرۆڤ لەوەدایــە بــە هــەموو دۆخەکانــدا بــروات ، مــن بـروام بـە جێگیـری مـرۆڤ نـی یـە ، مـن پـێم وایـە مـرۆڤ ئـەبێ بگۆرێــت لــە بیــر کردنــەوەو بریارەکــانی تەنانــەت لــە هەڵســو کـەوتیا نـازانم بـە دڵنیـایی کامـە باشـترە یـا خراپتـرە بـەس ئـەبێت هــەوڵی باشــترەکە بــدات ، ئیتــر جیهــانیش وەک شــەوێکی تاریــک وایە، هەموو کەسێک ئەبێ چرای خۆی داگیرسێنێ .

ئەمــەش کــە بــۆ خــۆی کێشــەیە زۆر جــار ئــەوەی لای تــۆ باشــترە لای کەســانی دی خراپتــرە ، بــە پێچەوانەشــەوە . بــە هــەر حــاڵ ئێمـە هـاورێی منـاڵی یـەکین رامیـار مـن دەسـت بـەرداری هـاورێ یەتیـەکی جـوان نـابم کـە خـۆی بـۆ خـۆی مێژوویـەکی هەیـە لـە یادگــاری و پێکــەوە ژیــان ، لــە بــەرخاتری جیــاوازی بیــر و بۆچونــەکانمان ، تــۆ هەمیشــە هــاورێ ی خۆشەویســتمی . ( بــەس پـێ ئـەچوو ئـەو زۆر بـە دڵـی نـەبێ ئـەو دینەکـەی لا لـە مـن خۆشـە ویستر بوو ).

جـا وەرە خـۆم لـەم حاڵـە جوانـەی کـە تییایـدام ئـاخر چـیم داوە لـەم بابەتانە تا بچمە ناو ئەم موناقەشە بێ سوودانەوە .

کـاردۆ : رامیـار گیـان بـا بـەرەو مـاڵ بەرێکـەوین کـات درەنگـی کرد .

لـــە رێگـــادا بـــە رامیـــارم ووت ئـــەزانی رامیـــار ئێـــوە هەمیشـــە بانگهێشـــتی خـــەڵك دەکـــەن بـــۆ بەهەشـــت کـــەچی بانگهێشـــتی فـــەقیرێك ناکـــەن بـــۆ ســـەر خوانـــەکانتان ، ســـەیرکە هـــاورێم ئێـــوە هـــەمووتان ئەمـــەی ئەیکـــەن بـــۆ ئەوەیـــە کـــە برۆنـــە بەهەشـــتەوە بـــەڵام کەسیشـــتان ناتانـــەوێ بمـــرن ئـــەی پـــێم نـــاڵێی ئـــەم نەهامـــەتی یـــە بـــۆ؟ بـــەخوا بـــاش بزانـــە مـــرۆڤ تـــەنها دوو شـــێوەن شـــێوەیەکیان بروایـــان بـــە خـــوا هەیـــە شـــێوەکەی تریشـــیان بروایـــان بەخۆیانـــە . گرنـــگ مـــن و تـــۆ ئـــەم رێگایـــە بەختـــەوەر بـــین پێکـــەوە دڵـــی یـــەك ئـــازار نـــەدەین کـــە مردیشـــین ئیتـــر کـــەس نـــازانێ هـــەر کەسێکمان بـــۆ کـــوێ دەچێت ؟

ئـــەو قســـانەی ئـــەو رۆژە کـــردم لەگـــەڵ رامیـــاردا ئـــەوە یـــان بـــۆ ســـەلماندم کـــە هەمیشـــە لەگەڵ خەڵکـــی بە ئەنـــدازەیەک دەبێـــ میهرەبـــان بە کە دوای عومرێـــك ناچـــار نەبیـــت بۆیـــان بســـەلمێنی کە تۆ گێل نیت.!

گەیشــتمەوە ماڵــەوە دیســانەوە شــەوە واتــە بیرکردنــەوەو تــەنیایی . بــرادەریکم هــەبوو دکتــۆر بــوو ئــەیوت مــرۆڤ بــە شــەو هەنــدێك مــادە هەیــە دەری نــادات بۆیــە زیــاتر هەســت بــە ئــازار دەکــات لــە جەســتەیا کــە شــەوی بەســەردا دێــت ، بــەڵام مــن زیــاتر هەســت بــە ئــــازاری رۆحیشــــم ئەکــــەم بــــە شــــەودا نــــازانم دووری مــــن و ئەســتێرەکانە یــان درێــژی شــەو خۆیــەتی یــان ئــاخۆ چــی بــێ لەگــەڵ ئــەوەی جــوانی گــەردوون لــە شــەویدایە ، لەولەشــەوە بــێ دەنگــی هێلــین هێنــدەی تــر شــەوی درێــژ کــردووە ئــەمرۆ هــیچ گــوێم لــە دەنگی نەبووە ئاگام لێ نەبووە چی ئەکات و چی ناکات .

ئەمــەوێ ئەمشــەو بخوێنمــەوە بــەڵام وا هەســت دەکــەم پــەرەکانی رۆحــم نوســینی نــەماوە هەســتەکەم توانــای خوێندنــەوەم نــەماوە تەنانــەت شــتێکی باشــیش نــەماوە بیخوێنمــەوە ئــەوەم بــە بیــر هاتــەوە بــۆ لەنــاو بردنــی کلتــوری نەتەوەیەک هــیچ پێویســت ناکــات کتێبەکانیــان بســوتێنیت یــان لەنــاو بەریــت، بەڵکــو تەنهــا وا لە خەڵــکەکەی بــکە نەخــوێننەوە بــەخوا وا بــزانم ئــەم دەســەڵات و ژیانە وای لە من کردووە توانای خوێندنەوەم نەماوە .

لــە کتێبــەکانی منــا ووشــە نــەماوە ... رســتە نــەما وە تەنانــەت وام لێهــاتووە رێزمــان نــازانم ، ئێســتا مــن بەئەندازەیــەك لــە عــەقڵ و

تێگەیشــتنی خــۆم بێــزارم کــە بــێ ســنورە، تــەواوی بەدبەختیــەکانم دەخەمــە ئەســتۆی کتێــب ، بەراســتی زۆر جــار حــەزی ئــەوەم هــەبوە کــە نەمخوێندایەتــەوەو لــە هــیچ تێنەگەیشــتمایە ، ژیــان بــە کەرێتنش خۆشە .

بـەس بـە خـوا خۆشـم نـازانم ئەمـەوێ چـی بخوێنمـەوە بـە بیـری مـن بــێ پێناســەکەم و رەگەزنامەکەشــم نوســینی تیــا نــەما وە تەنانــەت پارەکــانی باخەڵیشــم وەرەقــەی ئــاو کارەباکەشــم لەبــەر چاومــا ووشــەی تیــا نــەماوە یــەك ســوچ و بنمــیچ نــەماوە لــە ماڵەکــەم نوسینی لەسـەر بـێ لـە نـاو منـا نوسـین نـەما ، هەستەکەم هـەمووی وێنــەی ئــەو حەقیقەتانەیــە کــە پێــی گەیشــتوم کــە ئیتــر وات لــێ ئـەکات نەخوێنیتـەوە تـا خـۆت کـۆ نەکەیتـەوە ئـاخر خـۆ بـەم پـەرش و بڵاوی یە چۆن بزانم چی بخوێنمەوە .

ئێمــەی مــرۆڤ .. بیرکردنــەوەمان لــە ســبەینێ دەمانترسـێنێ بۆیــە هەڵدانــەوەی پــەرەی ئەلبومــەکانی دوێنێمــان پــی گونجــاوترە .. هەرچەنـدە ئـەویش جۆرێـك لـە بـێ ئومێـدیمان دەداتـێ تـا وامـان لـێ دێـت زۆر جـار هەسـت بـە وون بـوون دەکـەین لـە نێـوان دوێنـێ و ئــەمرۆ ســبەینێ ،، قەڵــەم و کاغــەزێکم بــە دەســتەوەیە و هــیچم بــۆ نانوســرێت .. بیرکردنــەوە ئیفلیجــی کــردووم .. ئــەم ئێوارەیــە بــە

تـەنیایی بیـرم لـەوە دەكـردەوە چـی بكـەم .بـۆ ئـەوەی ئیتـر بتـوانم بیــر نەكەمــەوە ... نامیلكــەو كتێــب و نوســینی زۆرم خوێنــدەوە لەســەر ئــەوەی كــە چــۆن ئیتــر بتــوانم بیــر نەكەمــەوە بــەڵام كارەســاتەكە لــەوەدا بــوو لــە كۆتاییــدا بریــارم دا ئیتــر خوێندنــەوە تـەرك كـەم .. ئـەوەی ئەینوسم سـودی بـۆ خـۆم بـۆ تـۆ نـازانم بـۆ كـێ هەیـە .. بـەڵام هـەر سـودێكی ئـەبێت ،، بـەس نـازانم چـۆن ،، بـەڵام نوسـین تەقینەوەیـە ئـەوەی باشـە ووشـە خـوێنی بـە دوایـا نایـە ئەگـەر عاقڵەنـە بنوسـرێتەوە .. سـەیرە لـە ژیانـا ئەوانـەی لـە بیـرت دەكــەن هەمیشــە ئەوانــەن كــە تــۆ دایــم بیریــان لــێ دەكەیتــەوە .. ئەوانــەی ئیهمــاڵ دەكــەن ئەوانــەن كــە تــۆ گرنگیــان پــی دەدەیــت ..زۆر جــار پــێم ئــەڵێن تەمــەن درێــژ بیــت بــەس ئــەوان نــازانن مـردن تـەنها یـەك جـار نیـە مـردن هـەموو ئـەو كاتانـە دێتـە لامـان كـە ئاواتێـك ماڵئاوایمـان لـێ دەكـات یـان كـە خـەونێكمان وون دەبـێ یــان كــاتێ حــەزێك لــە ناخمانــدا ئــەخنكێ .. تــێ ناگــەم كامــە نیشـتیمانی مرۆڤـە كـە هەسـت بـە غـەریبی نـەكات تییـدا ئـاخر تـۆ لـە خاكێكـدا كـەس لێـت تـێ نـەگات بـە دڵنیـایی تـۆ غـەریبی لـەو وولاتـە .. بــا وولاتــی خۆشــت بێــت ..مــن رقــم لــە نوســینەوەی عەشــقە .. عەشــق بــۆ ئــەوە كــراوە وەك مــەی بخورێتــەوە وەك هەناســە هـەلمژرێ وەك خـواردن حـەزمان لـێ بێـت پێویسـتیمان پـێ بێـت

.. عەشق بۆ ئەو دروست بووە تا لە مردنەکان زیندوت کاتەوە .. بۆیە عەشق نانوسریتەوە ..عەشق بە تەنها بۆ کچێك نی یە نانانا بۆ دایکە بۆ باوکە بۆ نیشتیمانە بۆ خوایە تەنانەت بۆ پشیلەیەکی کولکنی چاو شینیشە زۆر جار بۆ خۆشتە ... زۆر جار هەست ئەکەین تورەین .. لە زەوی تورەین لە خەلك تورەین لە خۆمان تورەین .. تەنانەت لە نوسین و لە بینینیش تورەین جاری وا هەیە لە ژورەکەی خۆشمان تورەین .. ئەزانی ئێمە مەخلوقێکی سەیرین .. خۆشمان خۆمان ناناسین ئەسڵەن نازانین بۆ تورەین .. بەڵام ئەوە باشە هەموومان یەکسانین ئەوەتا هەمووومان وا ئەزانین زۆر عاقڵین .. هەمووشمان بە باران تەر ئەبین .. بەلام نازانین هەر تنۆکە بارنێ چەند چیرۆکی خۆش و غەمگین و سەیری پێ یە باران لای هەمووومان ئاوێکی تەرەو ئەبارێ و تەواو ئەبێ .. پیکانمان خۆیان رامان دەکێشن بۆ کوێ ... کەس نازانێ گرنگ هەموو ئەزانین کە زۆر زۆر زۆر عاقلین ....هەر بۆیە بە خۆشی و شادی ئەژین ... تێبینی بە خۆشی و شادی ...ئەوش نازانین .

ئـای لـە شـەو مـن لـەوە ئەترسم لـە شەویشـدا بمـرم تـەنیایی یـەکانی شـــەو ئـــازار بەخشـــە لەگـــەڵ ئـــەوەی جـــوانی یەکانیشـــی هێمنیـــت ئـــەداتێ و خۆشەویســتی خـــۆت پـــێ ئەبەخشـــێ، ئـــای مـــرۆڤ چەنـــد بەخـــتەوەر دەبـــوو گەر بیتوانیبـــایە ئازارەکـــانی وەکـــو جێهێشـــتنی شـــارێک بەجـــێ بهێڵێـــت ، مـــن هەمیشـــە حـــەزم کـــردووە بـــە شـــەو بـــرۆم و هـــەموو خەمـــەکانم بـــە جـــێ بهـێڵم ژیـان بـێ مانایـە بـەڵام خۆکوشـتن چارەسـەر نیـە، بـەڵکو دەبێـت لـە دژی ئـەم بـێ ماناییـە رابێین .

بەراستی بیـری ئـەوەم ئـەکرد کـە تەلـەفونێك بـۆ هێلـین بکـەم بـەڵام خـەمی ئـەوەم بـوو لـە کـاری بکـەم یـا کاتەکـەی درەنـگ بـێ پـاش ئـەوە خۆشـم حەوسـەڵەی ئـەوەم نـی یـە قسـە بکـەم واباشـە گـوێ لـە کـەمێ لـە گـۆرانی بگـرم کـەمێ گـۆرانی هـێمن ، وەك شـەو هـێمن بن گۆرانی یەکان .

کـــە تـــەنیا ئـــەبم زۆر جـــار حـــەز بـــە مـــردن دەکـــەم ئەمـــە لـــە رەشـــبینیمەوە نـــی یـــە لـــە خەمـــە رۆحیانەکانـــەوە نـــی یـــە لـــە تێگەیشـتنمە بـۆ ژیـان لـە پـر بوونمـە ، بـوون و نـەبوونی مـن لـە ژیـان چـی ئـەگۆرێ تەمـەن بـەرێکردن بـۆ مـن یـا بـۆ کەسـێکی دی چ مانایـەکی هەیـە ، ئـەوەی کـە بیـری لـە دنیایـەکی دوای مـردن

نــەبێ ئاســووده ئــەژی ؟ ئــەی ئــەوەی بــە تــەمایی بەهەشــت و حــۆری و شــەراب بــێ . ئـاخر ئـەكرێ هەمیشــە لــە دڵــە راوكــێ و ترســی ئــەوه بێــت ئــاخۆ بگاتــە بەهەشــت ، زۆر جــار وا بیــر ئەكەمــەوه ئێمــە لــە كەناڵــە تەلەفیزێۆنــەكانی كــۆن دەچــین لــە دوای مردنمــان تــەنها خشــە خشــێكەو هیچــی تــر ، جــوانرۆ هەمیشــە ئــەڵێت وەڵای مــن بــروا ناكــەم كــە مــردین خــوا لــەم جەهەنەمــە دەرمــان بێنــێ و بمانخاتــە جەهەنــەمێكی تــر ، هێلیــنش ئــەڵێت تــۆ بڵــێ ی لــەو دنیــاش پێكــەوه بــین ، بڵــێ ئــاخر نەگبــەت تــۆ بــا لێــره بگــەین بــە یــەك ئــەو كــات بــرۆ ئــەو خــەوه نەزۆكانــەوه ، رامیــاریش هــەموو ئیشــێكی بــۆ ئەوەیــە رێــك بــە بــێ پەســاپۆرت بچێتــە ئــەو بەهشــتەو ئیتــر ئــەویش هــەموو حــەزه بەســتراوەكانی لــەوێ بــەتاڵ كاتەوه ، ئەی ئەبێ ئەمە چی بێ ؟

بەراســتی ئەمشــەو ئەمــەوێت زیكــری تــۆ بكــەم خوایــە ئەمــەوێ ئەوەی لە ناخمایە پێت بڵێم :

خودایــە لــێم ببــوره مــن ئیمــڕۆ عــەقڵم تەســەوری مســتەقبەلی بــۆ نــاكرێ بــۆ یــە قاییلــە بــەوەزعی كــاملی ئێســتا....لــەم عەســری جــائزو ناجــائزەدا چ ئایــاتێ شــیفای دەردی مــن دەدا ....پــڕ بــە تــۆ ســاكنم ،جــائیتر چــی بــێ مەتلــەبم تــا داوا لــە تــۆ كــەم نهایــەتم بــۆ

بـەیان کـا .....ئیـدراکی ڕۆ حـی مـن لەجـەمالی نـوو ری تـۆ وەیـە بـۆ یـە شــەرحی حــاڵم پێویسـت بەتەفسـیر ناکــا.......عەشـقی تـۆ دائو دەوائە . بۆ عیلاجێ لیقائی تۆ نەبێ ،

هـیچ حــەکیمێ چـارەی ئــەم دڵــە شـێتە ناکـا .....مەسـرورم ئێسـتا کەمالیکی کلیلی دڵتم

هەموو جەیشی عالەم مەزهبی رێگەی خۆمم پێ تەرك ناکا .

دووبـــارە هـــەر بـــە هـــاورێی یـــەتی بیرکردنـــەوەو خـــەوە مشـکیەکانمەوە شـەوم بـەرێ کـرد و دەرگــا ئــاڵتونی یـەکانی رۆژم کردەوە .

ئـەم بەیانییـە کـە هەسـتام لـە خـەو کـەمی دڵـە راوکـێم هـەبوو ، نـانم خـوارد دەرگـای ماڵەکـەم کـردەوە بـڕۆم بـەرەو دەرێ ، دەچـوم بـۆ دەوام ، راسـتی کـەمێکیش شـڵەژا بـووم نـەم ئـەزانی بچـم یـا نـەچم ، لـە نـاو خۆمـا بیـرم ئـەکردەوە تـۆ بڵـێ ی ئـەمرۆ دەوام هـەبێ ، تـۆ بڵـــێ ی شـــەقامەکانیان نەپێچابێتـــەوەو رێگەیـــەك بـــۆ هـــاتوو چـــۆ نـەبێ ، تـۆ بڵـێ ی خـەڵك ئیتـر لـە مالـە کانیـان نەیەنـە دەرێ ، بیـرم دەکـردەوە ئـەبێ ئێسـتا شـار چـی لـێ هـاتبێ ، ئـاخۆ نیشـتیمانەکەم هـەر وەك دوێنـی یـە یـا ئێسـتا نـەماوەو لەسـەر نەخشـە سـراوەتەوە

، هێنده مێشکم جەنجاڵ ئەبوو ئەترسام پێکانم رێگاکان نەگرێ ، لێم مەگره ئەترسم ئاخر ئەمشەو زۆرتر چووبومە ناو بیرکردنەوەو خەمەکانمەوە ، هەمیشە شەو وام لێ دەکات رۆژ بە باشی نەبینم پێم خۆش نی یە وا بم بەڵام ئەوەش جۆرێکە لە بریردانی مێشکی مرۆڤ بە دڵنیای من هێنده ماندووی بکەم ئەویش سەرەنجام ماندووم دەکات ، هەرچۆنێك بێت بەرێ کەوتم ، بۆ سەر هەڵنەبرین ژمارەی شتایگەرەکانم ئەژمارد و هەستم بە بۆنی تەری شەقامەکە دەکرد هەستم ئەکرد دەلنگی پانتۆڵەکەم ترر بوو بوو ئەوەشم لە خۆ خافڵ کردنەوە بووتا زۆر دەورو بەرکەم نەبینم ، پاشان بە بیرمدا هاتەوە کە نابێت ئازاری خۆم بدەم شەو تەواو بوو تەنیایم لەگەڵ نی یە ئێستا .

لە پاش هاتنە دەرەوە لەو جیهانە ونە و گەرانەوە بۆ ناو ژیانی راستەقینە بابەتێکی سەیر مێشکی داگیر کردم و ووتم ئەبێت ئەمرۆ پرسیار لە کاك محمودی دائیره بکەم کە گەیشتم . ئەمە بیره هەمیشەیی یەکانی رۆژگارم بوو کە ناتوانم بیتۆرێنم و نەجاتم بێ لە ئازار چەشتن بە بیرکردنەوەوە ، من پێم وایە هەموو بیرکردنە وەیەك ئازارێکی دەوێت ، بەڵام ئەمرۆ ئەو پرسیاره دەکەم هەر بۆیە پێکانم زوو هەڵیانگرتم بەروه

دائیرەیان بردم وەك ئەوەی خۆم لەوێ لێ بە جێما بێ باش بوو کە گەیشتم کاك محمود تەنها خۆی هاتبوو ئیتر ئەوە تەبیعەتی بوو تەنها حەزی ئەوە بوو زوو لە ماڵ رابکا و بێتە دەرێ ئەتووت لە زیندان رزگاری دەبێ بۆیە بەیانیان یەکەم کەس لە ژورەکە ئەو ئەبینرا و بۆنەکەشی ژورەکەی ئەرازاندەوە ئەتووت لە نێو باخچەیەکی پر لە گوڵی .

چوومە لایەوە دانیشتم و پێم ووت : کاك محمود باشیت دەنگ و باست چۆنە ؟ ئەمەوێ ئەمرۆ پرسیاریکی گرنگت لێ بکەم ئەگەر پێت ناخۆش نەبێ نازانم ئەم بەیانی یە بەو خەیاڵەوە خەبەرم بۆتەوە تەواو مێشکی مەشغول کردووم جا مەمنونم ئەگەر وەڵام بەیتەوە ئەگەر وەڵامی پرسیارەکەشم نەدەیتەوە هەر مەمنونم قوربان ئەوەی من ئەمەوێت تەنها بۆ پێگەیشتنی مێشکی خۆمەو درك کردنمە بە دەوربەرەکەمەوە ؟

کاك محمود : بەسەر چاو بەس تکایە وەك ئەو جارە مەچۆ بابەتی تایبەتی منەوە لەبەرە خۆم نا ، بروا بکە خۆم وام لێهاتووە گوێ بە مردنیش نادەم بەڵام خۆت تێ دەگەیت لە مەبەستەکەم.

کـاردۆ :نـا ببـوره ئەگــەر جـاری پێشـوش بێـزارم کردبــی بــە خـوا هــیچ نەبەســتێکم نــەبووه ئەمــەی ئــەمرۆ ئەمــەوێت بــە تــەواوی پەیوەنـدی بــە خۆمــەوه هەیــە ، ئــەرێ مـن ژنـم نــەهێناوه ئەمــەوێ ژن بێـــنم ئـــەکرێ کـــەمێ رێنمـــوێنی و ئامۆژگـــاریم بکـــەیت رێنمـوێنیم بکـەیت بـزانم چـی بکـەم چـۆن بیهێـنم کـێ بێـنم ئێسـتا ئەو هاوسەرگیریە بکەم یان نەیکم .

لـەم وڵاتـەی ئێمـە ئـەبێ ئـاوا پرسـیار بکـەی ئـەگینا قـەپۆز بـۆ جـوان ئەکــەن ئەگــەر راســتەوخۆ بچیتــە بابــەتێکی هەســتیارەوه منــیش راســتی یەکــەی زیــاتر ئەمویســت لــە بیــرو بۆچونــەکانی کــاك محمود تێبگەم لەسەر ئافرەت و ژیان و هاوسەرگیری.

کـاك محمـود : ئـەی بـۆ نـا ، سـەیرکه بـرام ژن هێنـان دوو جـۆره ، یــەکیان بــۆ خەڵکــە ، ئــەوی تریــان بــۆ خۆتــە ، هــەر یەکەشــیان تایبەتمەنـدی خـۆی هەیـە ئـەوەی بـۆ خـۆت ئـەیهێنی ئەوەیـە کـە خـۆت خۆشـت ئـەوێت ، واتـە لەوانەیـە ئـافرەتێکی ئاسـایی تەنانـەت ناشـیرین بێـت و کـەس بنەماڵـەی نەناسـێ و توانـای دارایـی نـەبێت و شـــەهادەی نـــەبێت واتـــە بـــە شـــێوەیەك لای کومـــەڵگا زۆر خۆشەویسـت نـەبێت ، ئـەوه بـە بیـرم دێ ئێمـە چـوار کـەس بـووین خەریکــە هــاتو چــۆی بەغــداد و کــاری قاچاخیمــان ئــەکرد وشــتو

مـەكمان ئـەهێننا جـا یـەكێكمان لـەو چـوار كەسـە نـاوی رێبـوار بـوو ئـەو كـات كـە پێكـەوە ئـەچووین بـۆ بەغـداد ئافرەتێـك هـەبوو ئەچوینـە مـاڵی ئـەو ئافرەتەكـە نـاوی سـامیە بـوو شـەوانە ئەماینـەوە لـە مـاڵی ئـەو ئافرەتـە جـا خۆشـیەكەی لـەوەدا بـوو ئافرەتەكـە خزمـەتی زۆری ئـەكردین لـە خـواردن و خواردنـەوە نـەت ئـەزانی چ جـۆرە خواردنێـك بخۆیـت یـان ئـەو هـەموو مەشـروبە جوانـە دای ئـەنا هـەر لـە كـاتی خواردنەوەكەشـدا و شـەوانە بەسـەرە ئەمایـەوە لامـان هـەر كەسـەو بـە تـەنیا لـە ژورێكـدا ئەماینـەوە ئـەوانی تـریش خەریكـە خواردنـەوەو یـاری پۆكـەر بـووین . ئێمـە چـوار كـەس بـووین ئـەو ئـەیتوانی هـەر چوارمـان تێـر بكـات و لـە یـەك كاتـدا لەگـەڵ هـەر چوارمـان بێـت بۆیـە سـەرەمان دانـا بـوو تـا لەوەشـدا تێرمـان بكـات ئـارەزوە بەسـتراوەكانمان بـەتاڵ بكاتـەوە ، جـوانی یەكـەی سـامیە لـەوەدا بـوو بـە تـەنها سیكسـی لەگـەڵ نـاكردین بـە ساردی و سـری یـەوە تـەنها بـۆ وەرگرتنـی برێـك پـارە بێـت نـا بـەڵكو لـە هـەمان كاتـدا سۆزیشـی ئـەداینێ و تێـر سكسیشـی ئـەكردین تەنانـەت گـوێ ی بـۆ ئـازارو پێداویسـتی یـەكانمان ئـەگرت ، بـروا بكـە ئەگـەر ماوەیـەكی زۆر نەچوینایـە لـە دڵـەوە بیرمـان ئـەكرد ،جـا ئێمـە لـەو چـوارە پیاوێكمـان لەگـەڵ بـوو خێزانـی هـەبوو واتـە ژنـی هینـابوو

جـا سـەیرەکە لەمـەدا بـوو ژنەکەشـی بنەماڵـەو خـاوەن پۆسـت و پایـە بووئـەو پیـاوە نـاوی کـاك احمـد بـوو ، هەمیشـە ئـەو لـە هـەمووان زیـاتر ئـەیوت بـا بچـین بـۆ بەغـداد لـە هـەمووان زیـاتر هـۆگری ئـەو ئافرەتـە بـوو بـوو لـە پـاش ماوەیـەك ئـەو کـاك احمـدە لای خۆمـان دیـار نـەما لـە شـاردا جێگـەی نـەما تەنانـەت وامـان بیسـت کـە وازی لـە خێزانەکەشـی هێنـاوە پـاش ماوەیـەکی زۆر بیسـتمان کـە کـاك احمـد ئـەو ئافرەتـەی بەغـدادی هێنـا بـوو کـە هـەمووومان ئەچوینـە لای، وە مناڵێکیشـی هـەبوو لـەو ئافرەتـە بـەڵام کـە هاتـەوە لای خۆمـان ئیتـر کـەس هـاموو شـۆی نەئـەکرد وەك جـاران و کـەس قسـەی لەگـەڵ نـە ئـەکرد لەگـەڵ ئـەوەی جـاران بـە هـۆی پلـە و پایـەی خێزانەکـەی خـەڵك زۆر ڕێزیـان لـێ ئـەگرت و هەمیشـە سـەردانیان ئـەکردن چونکـە ئیشـیان پـێ ی بـوو خۆشەویسـتی عالـەم بـوو ، بـەڵام لـەدوای ئـەو ژن هێنانـەی و واز هێنـانی لـە خێزانـە کۆنەکـەی ئیتـر خەڵکـەك مەرحـەباییان نەئـەکرد ، جـا مـن ڕۆژێ بینـیم ووتـم ئـەوە تـۆ مورتاحیـت کـاك احمـد لەگـەڵ ئـەم خێزانـە تازەیـەت ؟ بـە بـڕوای تـەواوە ئـەم ئیشـەت کـردووە ئـاخر مـن تێناگـەم چۆن ئـاوات کـرد . ووتـی بـەڵی کـاك مـەحمود مـن ئێسـتا هەسـتەکەم ئـەژیم مـن ئێسـتا تـامی خێزانـی ڕاسـتەقینەو هەسـت بـە بـوونی خـۆم ئەکـەم تـۆ لـە مـن تێناگـەی

دڵنیـام بـەڵام رۆژێـك دێـت هەرتێدەگـەیت . وا بـزانم دوای لەگـەڵ ئەو ئافرەتە رۆیشتن بۆ ئەوروپا .

کـاردۆ : جـا کـاك محمـود تـۆ ئەتـەوێ منـیش بچـم سـۆزانی یـەك بێـنم قوربـان تـا هەسـت بـە بـوونی خـۆم و بەختـەوەری خێزانـی بکـەم ؟ خـۆ ئـەم نمونـەی تـۆ بـاس کـرد بـۆ گەیشـتن بـە ناسـین خـود و ژیــان لــە بەختــەوەری دا نمونەیــەکی خراپــە لــە کۆمــەڵگای ئێمەدا .

محمـود : نـا بـرام مـن وام نـەوتووە تـەنها ئەمـەم بـاس کـرد تـا خراپتــرین حاڵــەتی ژن هێنــان بزانیــت بــۆ خــۆت تێبگــەیت ئــەو پیـاوە ژنـی یەکـەمی بـۆ خـەڵك هێنـا بووئـەو هـەموو جێگـەو پایـەو پــارەو و رێــزە هــی خــەڵك بــۆ ژنەکــەی بــوو، ژنــی یەکــەمی کەسـێکی خانــەدان و بنەماڵــەو پلــەو پایــەو پــارەو جـوانی یــەکی زۆر تەنانــەت وای لێهــاتبوولای خــەڵك بــە نــاوی ژنەکــەی و بنەماڵــەی ژنەکەیــەوە ئــەم پیــاوە ناســرابوو ، هــەموو ئەمانــەی هــەبوو بــەڵام هەسـت و سـۆزی نـەبوو ئـەوکاتی نـەبوو میردەکـی بڵاوێنێتـەوە تاقـەتی ئـەوەی نـەبوو گـوێ بـۆ ئـازارو تەنیایـەکانی مێردەکــەی بگـرێ تەنانــەت بــە مــانگی جــارێکیش ســەرجێگاییان نەئــەکرد پێکــەوە ، بۆیــە مێردەکــەی بۆشــایی زۆر زۆربــو

سەرەنجام هەڵهات لەو دۆخە ناخۆشەی تێیدا بوو رۆیشت ئەوەی هەڵبژارد کە خودی خۆی ئەیویست .

جاران وام ئەزانی ئەم کاك محمودە لە پیاوێکی خیانەتکار سپڵە ی داوێن پیس زیاتر هیچی تر نی یە بەڵام راستی قسەکانی کەمێ وستانمی و بیرم لە شتەکانی کردەوە تێرامام ووتم .

کاردۆ : کاك محمود تۆ ژنت بۆ خۆت هێناوە یا بۆ خەڵك ، کاك مەحمود پێکەنی و ووتی : وەڵا کاکە نە بۆ خۆم هێناومە نە بۆ خەڵك بروا ئەکەی کاردۆ من تەمەنێکم لەگەڵ ئەو ژنەم بردۆتە سەر تا ئێستاش نەمتوانیوە لێ ی تێبگەم نازانم ئەو چۆن بیر ئەکاتەوە نازانم چی ئەوێت هەمیشە هەست ئەکەم نایناسم .

منیش سەیرم لێ هات ووتم ئەی بۆ کێت هێناوە بۆ مناڵەکان ؟ ئەی باشە چۆن توانیوتە ئەوندە لەگەڵی بژیت و ئاوا بێت نێوانتان .

محمـود :سـەرەتا بـۆ خـۆیم هێنـاوە بـرام بـۆ خـۆی ، بـۆ ئـەوەی چـون ژیـاوین ئیتـر ئـەوە ژیـاوین و تـەواو کەرانـە داوانەتـە بـەری .

کاردۆ : تێناگەم کاك مەحمود چۆن بۆ خۆی ؟

محمـود : بـۆ تیناگـەی قوربـان ، ژنەکـەی مـن پاشـای ماڵەوەیـە ئیشـی ئـەمر کردنـە ئیشـی جێبـەجێکردن حـەزەکانی خۆیـەتی بـێ بیرکردنـەوە لـە مـن ، سـەیرکە کـەی حـەز بکـات بچینـە دەرەوە ئـەبێ بچـین بـەس مـن کـەی حـەز بکـەم یـەك ملێـون بـرو بیـانوو دێنێتـەوە گـوی تـێ ئـەکات حـەز لـە چـی بکـا ئـەو ئێمـەی قـور بەسـەریش ئـەبێ بیخـۆین ، خـۆی چـی بـوێ بـۆ خـۆی ئـەیکات ئێمـەش شـتێك بکـەین لێمـان نابرێتـەوە ئـێ ئەوەپێداویسـتی یـەکانی سـەر جێگـای شـەویش ئـەوە هـەر بـە مەتڵـەب و ئیقـراری ئـەوە ، خۆ ئەگـەر تاقـەتی نـەبێ چ قورەتـە بچـی بـە لایـا خۆیـت لـێ دێنێتـە حـاڵی جـاو ، کـە لەتەنیشـتی یـەوە ئـەنویت لـە نیـوەی شـەودا تەوقـەی لـە فـەکانی ئـەچێت بـە چـاو تـدا خەریکـە کـوێر ئـەکات ، یـان بـۆنی خەنـەو بۆیەکـەی سـەری بـۆ ناڵێـت بـروا ئەکـەی جـاری وا هەیـە هەسـتەکەم لـە گـەوردا نووسـتووم ، تاکـە ئیشـی رەخنـە گرتنـە لـە هـەموومان ، بـۆ گلۆپەکـەت نەکوژاندۆتـەوە بـۆ

دەرگاکـەت دا نەخسـت بـۆ نانەکـەت بـە هێواشـی نـاخۆی بـۆ نـانوی بۆ هەڵناستیت بۆ و بۆ و بۆ بەس رەخنە گرتن و هیچی تر نا.

کـاردۆ : باشـە تـۆ هەسـت ناکـەیت خـەتای تـۆ بێـت ئـەو وای لێهاتووە ؟

هەستم ئـەکرد لـە ناخـەوە ئەیـەوێ پێم بڵـی ئـەی بـۆ نـاڵێ ی خـەتای ئەوە من وام لێهاتووە .

راسـتی وام هەسـتەکرد ئەمـە ژن و مێردایـەتی نـی یـە ئەمـە شـەرە شـەر ئـاخر ژن و مێـرد چـۆن ئـەتوانن ئـاوا پێکـەوە بـژین ئـەی هاوار .

محمـود : نـاوەڵا ئـەو تەبیعـەتی خـۆی هـەر وا بـووە ، ئیتـر ئـەوەش نسـیبی منـە تەبیعـەتی گـواوی پیسـە ، بـروا بکـە بـەس مـن ئیـدارە ئەکەم لەگەڵیدا ئینجا ئیدارەی چیش ئەوە مردنە مردن .

کـاردۆ : ئـەی بـۆ جیـا نەبویتەتـەوە لـێ ی وکەسـێکی تـر هـەڵبژێری ، یـان پـێش ئـەوەی بیهێنـی نـەت ئەناسـی شـارەزای تەبیعـەت و هەڵسـو کـەوتی نـەبووی بـەخوا بـرام ، بـە بۆچـوونی مـن خـەتای

خۆشـتی تیـا بـووە جیـا بـەرەوە نـەك سـێ بـەرد سـی بـەردی بكـە دەستەوە با بروا لە كۆڵ بێتەوە .

محمـود : رۆڵــە ئـەوە تـۆ بـۆ وا بـێ مێشـكی ئـەی ئـەو منداڵەنـە سـەرگەردان بـن بیانخەمـە ژێـر دەسـتی باوەژنـەوە دوای ئـەوە كـێ ئـەڵی ئـەوەی ئـەیهێنم لەمـە باشـتر ئـەبێت ، ئینجـا بـا شـتێكت پـێ بڵـێم مـن پێشـتر ئـەم ژنـەی خـۆم ئەناسـی تەنانـەت مـاوەی سـالێك یـەكترمان خـۆش دەویسـت ، بـەڵام ئـەوە بـاش بزانـە ئـەو كاتانـەی دوو كـــەس یـــەكیان خـــۆش دەوێ یـــان هـــاورێن تـــەنها شـــتە جوانـــەكانیان نیشـــانی یـــەك ئـــەدەن هـــەرچی پۆخڵەواتـــەكانی ژیانیانــە هەیــە دەیشــارنەوە تــا لای یــەك جــوان بــن ، دوای ئــەوە ئـەو دوو كەسـە ماوەیـەكی كـەم پێكـەوە ئـەبن نـاتوانن شـارەزای بیـرو بۆچونـەكانی یـەك بـن ، ئـەوان ئەگـەر بتـوانن لـە رۆژێكـدا سـە عاتێـك پێكـەوە بـن كـە ئـەوە ئەستەمیشـە لـە وڵاتـی ئێمـە دوو خۆشەویسـت بتـوانن لـە هەفتەیەكیشـدا دوو سـەعات پێكـەوە بـن بۆیـە نـاتوانن یـەك بناسـن پاشـان خـۆ ئەگـەر ئـەوەش بڵـێ ی ئـەوە نی یە پێكەوە قسە ئەكەن بە تەلەفون .

ئـاخر بـە قوربـان ئەوانـە بـە تەلـەفون هەقایـەت بـۆ یـەك ئەكـەن و باسـی خـەڵك دەكـەن وەك ووتیشـم ئـەوان باسـی جوانیـە یـەكانی

خۆیـــان دەكـــەن ، هـــەر كـــات كـــەمێ بێـــزاریش بـــوون لێـــك تەلەفونەكـە داخاتـەوەو ئـەلێت ببـورە وەحـدەم نـەما یـا شـەحنم نـەما كاكـە گیـان ئێسـتا خـۆ نـاكرێ مـن دەرگـای ماڵەكـە داخـەم و بڵـێم تـەواو شـەحنم نـەما تێگەیشـتی بـرام ئـەزانی ئێسـتا مەبەسـتم چـی یـە ؟.

كـاردۆ : ئـەی كەواتـە كـەی دوو كـەس ئـەتوانن تـەواو یـەك بناسـن ؟

محمـود: خـۆی لـە راسـتیدا ئـەوان نـاتوانن قـەت تـەواو یـەك بناسـن بـــەڵام دوای هاوســـەرگیری و پێكـــەوە ژیانیـــان لـــە ماڵێكـــدا كاتێـــك دەمامكـــــە كـــــان دەكـــــەوێت ، كاتێـــــك روخســـــاری راســـــتەقینە دەردەكـــەوێت كاتێـــك پێویســـتی نیشـــاندانی تـــەنها جـــوانی یـــەكان تـــەواو دەبێـــت ، كاتێـــك دوو كەســـەكە لـــەژێر ســـەقفێكدا دەژیـــن و نـاتوانن تەلەفونـەكانیان داخەنـەوە كـاتێ ئەگەنـە سـەر دەركـەوتن و باسـە راسـتی یـەكان ئـەو كـات كـەمێك زیـاتر لـە یـەك حـاڵی ئـەبن . هـەر ئـەو كاتـەش نـاتوانن تـەواو یـەك بناسـن چونكـە ناسـینی ژن ئەسـتەمە كـەس تـا ئێسـتا نـەیتوانی وە ئەمـە بكـا ، رۆڵـە تـۆ ئـەزانی ژن بونـەوەرێكی خەتـەرە وریـایی نـەبیت وون دەكـات، بـروا بكـە ژن دەتوانێـت بەپیسـترین شـێوە ئەشـكەنجەی پیاوبـدات وەبیكـاتە

قەشـــمەرێک ولەناوخەڵکیشـــدا گـــاڵتەی پـــێ بکرێـــت ئەشـــتوانێ بیکاتە پاشا تێ ئەگەیت ئەتوانێ بیکاتە پاشا.

کـاردۆ : مـن نـازانم ئەمـە چ پێناسـەیەکی هەیـە ئـەم هاوسـەرگیری یـەی ئـەم وڵاتـە ؟ هەسـتەکەم وەك شـتەکانی تـری تێـك ترنجـاو تێـك شکاوە و هیچی بەسرە هیچەوە نی یە .

محمـود : ئەمـە پێـی ئـەڵێن کوپـە هەنگوینەکـە یـان ئـەوەتا کـە هـەڵت پچـــری ســـەرەکەی هەنگوینـــەو بنەکـــەی گـــووە یـــان ســـەرەکەی گـووەو بنەکـەی هەنگوینـە یـان هـەمووی هەنگوینـە یـان خـۆت و شانســی خـۆت هـەمووی هەنگوینـە لـەم رۆژەشـدا هـەنگوین سـاغ هـەر نـەماوە ئیتـر خـۆت تـێ بگـە دوای ئـەوە ئێمـە زەواج ئەکـەین بـۆی منـداڵ بخەینـەوە نـەك بـۆ ئـەوەی لـە زەواجەکـەدا بـژین ئیتـر ئـــەوەش حـــاڵی منداڵـــە لـــە ناومانـــدا کاتیـــك دایـــك وباوکێـــك جیـــا دەبنـــەوە منداڵـــەکان ئـــەبن بـــە پـــەن بـــە دوو تـــەربێت بـــە کۆمـــەڵێك لـــە رقــە شــاراوەکانی دایــك و نەگبــەتی و نەهامــەتی پیاوەکــە یــان بــە پێچەوانـــەوە ، ســـەیرکە کـــاردۆ ژن بەخـــتەوەری لەدەســـت ئەدات ئەگەر نەی تـــوانی مێـــردەکەی بکـــاتە باشـــترین هـــاوڕێی خـــۆی براکــەم ژن قــە د مــافی بــو گرنــگ نیــە...بونــە وە ریکــی تــە مــە ڵـە..رقـی لـە بـونی خۆیـە تـی..ژن لـە پیـاو زیـاتر لـە گـە ل خـودی

خۆیا لـه جـه نگدایـه....لـه پیـاویش زیـاتر پیـاو قـه بـه ئـه کـات...تـۆ لە دایکە وە بیگرە.....

کـاردۆ : وەڵا راسـتەکەی کـاك محمـود ، سـەیرکە مـرۆڤ چۆنــە ، ئـەبێ ئەگـەر ژیانیشـی دۆزەخ بـێ پێـی رازی بێـت لـە بـەر خـاتری منـداڵ ، باشـە ئـەی بـۆ ئـەو خەڵکـە پـێش خسـتنەوەی ئـەو منداڵـە ئـەم بیرانــە ناکەنــەوە بـۆ پـێش دروسـت کردنــی مرۆڤیکــی تـر بـۆ نــاو ئـەم ژیانــە خۆیـان هـەوڵ نـادەن لـە چیـان تێبگـەن ؟ بـەس بیـر لـە چـیش بکەنــەوە مـەرج نــی یـە ئـەوەی بیـری کـردەوە سـەرکەوتوو بێـت بـە خـوا بیرکردنـەوەش ئـازاری ئـەوێ کـاتی ئـەوێ مێشـکی ئــەوێت ، خــۆ ئــەویش راســتەکات ئــەوەی لــە و نێوەنــدە تیــا ئــەچێت منداڵــە لــە جیـا بوونــەوەی دایـك و باوکـا ، بــەڵام ئــەی ئەشـکرێ بــەم شـێوەیەش ژیــان بــەرێ کــەن ،دیــارە لــە وانەشــە بکـرێ ئەگـەر نەیانتوانیایـە پێمـەوە بـژین بـۆ ژیانەکـەیان ئێسـتا ئـاوا ئاسـایی ئـەروا، ئیتـر وەك خۆشـی ووتـی ئـەویش تـازە ئـەبێ بـۆ خـەڵك بـۆ مناڵـەکانی بـژی نـاتوانێ بـۆ خـۆی بـژی ئـێ ژنـیش وەڵا کـەس نـازانێ چـی ئـەوێ ، بـەم بۆچونـەی تـۆ بـێ ئـەی ئـەویش مافی خۆی و پێداویستی خۆی نی یە ؟

محمـــود : گەورەتـــرین درۆ و پـــووچترین قســـە لـــە کۆمەڵگایـــەی ئێمـــەدا داواکردنـــی مـــافی ئافرەتـــە لەلایەن خـــودی ئافرەتـــان خۆیانـــــەوە ، وەرگرتنـــــی مـــــافی ئـــــافرەت و حەســـــانەوەیان و دووربـــوون لەمەزڵـــومییەتی ئێســـتەیان تەنهـــا بەدەســـت کردارەکـــانی خۆیـــانە نەوەک قســـەکانیان ئـــەوەتا لـــە نـــەزانی و دەبـــەنگیان ئیشـــی ماڵـــەوەش دەکـــەن و ئیشـــی دەرەوەش دەکـــەن تـــەنها بـــۆ ســـەلماندنی خۆیـــان قوریـــان کـــردووە بەســـەر خۆشـــیان و منـــاڵیش و ئێمەشـــدا ، ئـــێ بـــە خـــوا خـــۆ مـــن نـــاڵێم ئێمـــەش زۆر لـــەوان باشـــترین ئیتـــر ئەمـــە ژیـــانی هاوســـەرێتی یـــە رێـــك ئـــەتوانی پێناســـەی ژیـــانی کـــەرێتی بـــەیتێ ئـــەزانی چـــی تـــۆ ئەگـــەر ئەتـــەوێت مـــن پێناســـەی ئـــافرەت بـــەمێ ئـــەوامن ســـوێند دەخـــۆم، ئـــافرەت تەنهـــا بـــۆ ئـــازاردانی پیـــاو دروست بووە.

لـــەویادا بیـــری ئـــەو ئافرەتـــەم کەوتـــەوە کـــە ئـــەم لەگەڵیـــدا بـــوو لـــە ژوورەکـــەدا ، ئـــەویش مێردەکـــەیم ئەناســـی خـــۆم پێـــاوێکی تـــا بڵێـــی ووشـــك و خـــۆ بـــە زل زان و تـــەنیا ، بـــروا ناکـــەم کەرامەتـــە دروســـت کـــراوە فشـــەڵەکەی رێگـــەی بـــدات داوای ئـــەوە بکـــا لـــە ژنەکەشـــی ســـەر جێگایـــە ك پێکـــەوە بکـــەن چونکـــە بـــە تـــەنازولی ئـــەزانێ ئامادەیـــە بـــە دیـــار فلیمـــە قۆرەکانـــەوە دانێشـــێ تـــا بـــەیانی و

خـۆی بــەتاڵ کاتــەوە بــەس لــەو کبریایــەی خـۆی نەروشـێنێ بــەس نـــازانێ لـــە فـــرەی ســـەتەلایتەکەی شـــەوان هـــەموو دراوســـێکان بەخەبــەر دێـن و ئــەزانن بــە دوای چــی دا ئەگــەرێ بــەس خـۆ ئــەو لــە تــاو عەقڵــە پوتەکــەی درك بــەم کــەرێتی یــەی ناکــات ، ئــاخر ئەمـــە قـــور بەســـەری تاکەکانـــە بۆیـــە ئـــەنجامی کومەڵگاکـــەمان ئەمەیە کە ئێستا تێیداین .

کــاردۆ : کــاك محمــود ئێســتا مــن تێنەگەیشــتم ئــەی کەواتــە مــن کامیــان بێـنم ؟ یــان هــەر نــەیهێنم باشـترە بــەخوا وا نــی یــە بابــە تــۆ ژن لێکــردم بــە ملـۆزم بــە هــەژدیها بــە تــاعون و دەردو سـیل هــەر ئەوەنـــدەی تـــر دور خســـتمەوە لـــە ژن هێنـــان بـــرام خـــۆم حـــاڵی بیرکردنەوەم زۆر جوان نەبوو ئەمەندەی تر تێکدا .

محمـود :تـۆ .. تـۆ بـۆ خـۆت ژن بێنــە و تــەواو یــان کــورە دە هــەر مەیهێنە و تەواو ، سەر نائێشێ بۆ پەرۆی تێوە ئەپێچی برام .

ئــەمزانی وا ئــەڵێت چونکــە خـۆی بــێ بەشــە لــەو جـۆرە ، مـن دڵنیـام کەسـێکیش بـۆ خـۆی ژنــی هێنــا بێـت هەسـت بــە تــەنهایی کۆمــەڵگا دەکــات هەمیشــە حــەزی ئــەوەی هەیــە بگەرێتــەوە نــاو خــەڵك بــەڵام نـــاتوانێ بۆیـــە ئـــەویش ئـــەبێت بـــە بەشـــێك لـــە دابرانـــی کۆمـــەڵگای

ئەوەشــم بیــر نــەچێ مــرۆڤ خــۆی ئــاژەڵێکی عاقڵــەو کــائینێکی کۆمەڵایــەتی یــە ، تەنانــەت ئــەوەتا کــاك محمــود و ژنەکــەی لــە هیچــدا رێــك نــین پێکــەوەو ســێ منالیشــیان هەیــە ، واتــا ســەر جێگــای ئەمانــە تــەنها تێرکردنــی حــەزێکی ئاژەڵانەیــە بــۆ هــەردوو لا دەنــا مــن ســەیرم لــێ دێــت ئــاخر ژن و مێردێــك رێــك نــەبن پێکــەوە و تەنانــەت زۆر جــار نــەك قســە ناکــەن پێکــەوە بگــرە جنێــو شەریشــیان پێکــەوە هەیــە کــەچی کــە شــەویان لــێ دێــت وەك ئــاژەڵ سواری یەك ئەبن وەك ئەوەی ئەمانە مرۆڤ نەبن .

بەختــەوەری مــرۆڤ لــەوەدا نــی یــە ئارەزووەکــانی بینێتــە دی هــەر بۆیــە ئــەبینی زۆری ئەوانــەی ئارەزووەکانیشــیان بــەدی هێنــاوە بەختــەوەر نــین ، هەمیشــە هەســتەکەی بــە دوای بەختــەوەری راســتەقینەدا وێلــن ئــەوەتا دوو خۆشەویســت ئــارەزوی بەیــەك گەیشــتن دەکــەن وا دەزانــن ئــەوە کۆتــایی نەهامــەتی و گەیشــتنە بــە بەختــەوەری ، کــەچی لــە دواییــدا بــەدوای ئــازاردانی یــەکتردا دەگــەڕێن بەختــەوەری یــەکانیان بــە بیــر نامێنیــت و ئەکەونــە نەهامــەتی یــەکانی یــەکترەوە ، زۆرینــەی خۆشەویســتەکان لــە دوای هاوســەرگیری یــەکتر توشــە نەهامــەتی ئەکــەن لەگــەڵ

ئـــەوەی ئـــەوان پێیـــان وابـــوە کـــە بـــە یـــەك گەیشـــتن ئەگەنـــە بەختەوەری .

لـەدوای بیسـتنی ئـەم قسـانە کاتێـك سـەیری مرۆڤـەکان دەکـەم بـۆم دەر ئەکـەوێ کـە ئـەوان وەك ئـەوە نـین کـە خۆیـان نیشـان ئـەدەن بۆیـە زیـاتر حـەز بـە تـەنیایی دەکـەم و تـەنیایم لا خۆشەویسـتر دەبـێ . تەنانـەت لـەم کۆمەڵگایـە مـن وام لێهـاتووە هـەر کەسـێك بڵێـت دڵـم خۆشـە وێنەیـەکی لەگـەڵ بگـرم ، هەسـتەکەم بەختـەوەری راسـتەقینە لای ئەمانـە نـەماوە لەگـەڵ ئـەوەش ژیـان بەردەوامـە هەرچەنـدە تێگەیشـتنی ئـەم بابەتانـە کـاتی زۆر ئـەوەی لەگـەڵ بیرکردنـەوەی زۆر چونکـە مـرۆڤ نیـوە ژیـانی لـە نـاو خێـزان و لەگـەڵ ژنـدا بەسـەر ئـەبات بۆیـە پێویسـتە لـە و ژیانـە تـێ بگـەیت بـەڵام پـێم وابـێ ئەمـە ئەسـتەمە لەوانەیـە زۆریـك بـە رەشـبینی سـەیر مـن بکـەن بـەڵام گـەر بـە باشـی وورد بیتـەوە لـە ژیـانی خـۆی ئـەبینی هیچـی کـەمتر نـی یـە لـەم پێناسـانەی مـن کـردووم ئەگـەر هەمووشـی وا نـەبێت ئەشـێت هەنـدێکی وا بێـت یان لە رێرەوی ژیاندا بە هەندێکیاندا گوزەری کردبێت .

خـۆی ئەگـەر مـرۆڤ بـە ووردی سـەیر بکـات و بیـری لـێ بکاتـەوە تـێ ئـەگات هـیچ پیاوێـک دێـوەزمەی نێـو فـیلمە ترسـناکەکان نـی یە

تــا هــەموو تاوانــەکان بخرێتــە ملــی پیاوەکــان بــەڵام هەمووشــیان فریشـــتە نـــین ئیتـــر بەرائـــەتیان لـــێ ببـــارێ ، هـــیچ ژنێکـــیش پـەریزادەی نێـو کتێبەکـان نـی یە تـا ئـەو هەمیشـە بکرێـە نێچیـر و بـێ تـاوان و مـەزڵوم دەرچـێ بـەڵام هەشـیانە ئـەتوانێ دو ووڵات بـدا بەیەکـدا نـەك تـەنها دوو کـەس ، ئـەتوانێ وێرانەیـەك دروسـت بکـات تەنانـەت لـە بەهەشتیشـا بێـت، ئەوەی خـراپە دەکـا و جـوانی لەبــوونی نــاخولْقێ ڕەگەزی نێــر و مێیــیە بەبــێ جیــاوازی، پــێم وایە هەر مرۆڤێــک نــاوێکی ناشــرین یــان قــاڵبێکی پــیس لەژێــر ناوی ژن بە تەنها یان پیاوبە تەنها دابنێ تەنها گەمژایەتییە.

محمــود : بــەس بزانــە کــاردۆ ئەگــەر ئەتــەوێ بگەیتــە هــەموو ئارەزوەکانــت و ژیــانێکی ســەرکەوتووت هــەبێ ئــەبێت پــارەی چاك هەبێ بروا بکە پارە بەختەوەری ئەکرێت .

کـاردۆ : بـەڵام بـروا ناکـەم پـارە خۆشەویستی بکرێـت وا ئـەڵێن جـا ئیتـر نـازانم ،بـروا بکـە کـاك محمـود لە هەر سـەردەمێک پـارە بـوو بە حــاکم ، یەکســانی وخۆسەویســتی بــوونی نــامێنێ ، مــن بــروام بە کاریگەری پارە نی یە .

محمـود : ( بـە پێکەنینــەوە ) دە وەڵا فـر بەسـەر دنیـاوە نــی یـەو هــیچ تێنەگەیشــتوی لــەم چژیانــە کــورە بــاوکی خۆشەویســتیش ئـەکرێت کـوری بـاوکم سـەیرکە کـێ لـەم دائیرەیـەی ئێمـە لای تـۆ لـە هـەمووی منـاڵتر و جـوانترە بـە پـارە ئێسـتا ئـەتوانم هـەموویان پێکـەوە بێـنم هـەموو جوانـەکان تـۆ تێنەگیشـتوی نـازانی پـارە چـی ئەکا پارە دنیا ئەکرێت .

راسـتی یەکـەی کچێکمـان هـەبوو زۆر ناسـك بـوو بـەڵام زۆر بـە فیـز بـوو بێـزی نـەدەهات قسـە لەگـەڵ ئێمـە بکـات گروپێکـی بـۆ خـۆی جیـاکردبووەوە بـە پـێ ی ویسـتی خـۆی تـەنها قسـەی لەگـەڵ ئەوانـە دەکـرد کـە خـۆی ئەیویسـت ، ئـەو کچـە جـوان بـوو یـان باشــتر وایــە بڵێــین سیکســی بــوو هەرچەنــە لــوتی عەمــەلیات کردبــوو لێــویش ئەیانــەوت شــتێکی تێکــردووە بــەخوا وا بــزانم برژانەکانیشــی ئـەتوت گسـکی کەناسـەکەی لای مـاڵی خۆمـان بـوو ئەمـەن درێـژ بـوو نـازانم جـا ئەمـە راسـتی بـوو یـان نـا ، هیوایـەتی ئـەم کچـە رێجیم و جـل و بـەرگ و مکیـاج بـوو نـازانم بێـزار نـابوو ، لـەروی رۆشنبیریشـەوە یـەك سـەرە واو لـە گیرفانیـا نـەبوو تـەنها رووکەشـێکی رازێنـدراوە و هیچــی ترهەرچەنــدە دایـم ئــەڵێن کــە ژنــت هێنـا قـەت نەکـەی ژنــی رۆشـنبیر بهێنــی ژیـان ئـەبێت بـە

کتێبخانـەی ئـەو گیـر ئـەخۆی بـە دەسـتەیی یـەوە بـە هـیچ قەناعـەت بـۆ پـێ نـاکرێ ،خـۆ مـن ئەشـزانم پیـاوی لای خۆمـان ئـافرەتێکی بـێ دەمـاغی مێشـك پـووتی جوانکیلـەی ناسـکی زۆر لا پـێ باشـترە لـە ناشـرینێکی رۆشـنبیری تێگەیشـتوو ، ئـەو ئافرەتـە جوانـە مێشـك پووتەکـەی لای ئێمـەش نـاوی لـەیلا خـانم بـوو ، بۆیـە منـیش بـە کـاك محمـود م ووت ئـەی ئـەتوانی لـەیلا خـان بهێنی.

محمود : دە بەسەری باوکم پارەم هەبێ بەیانی ئەیهێنم .

کاردۆ : کورە بابە ئەو چۆن شوو بە تۆ ئەکات .

محمـود: جـا بڵـێم چـی خـۆ نیمـە تـا بـۆت بسـەلمێنم .( بـەخوا راستیشـی کـرد لـە پاشـانا ئـەو لەیلایـە شـوی کـرد بـە پیاوێـك رێـك بەقـەدەر بـاوکی خـۆی بـوو بـەس زۆر دەوڵەمەنـد بـوو ئیتـر ئەوەش ئافرەتە )

کـاردۆ : نـا کـاك محمـود مـرۆڤ پـارە دروسـت ئـەکات پـارە مـرۆڤ دروسـت نـا کـات مـن هەمیشـە ئەمـەم حوێندۆتـەوە لـە پەندەکان و ئامۆژگاری یەکانی خەڵکدا .

محمــود : بــەخوا بــرام پــارە بەهەشــتیش دروســت ئــەکات نــەك مــرۆڤ ، ئەمــە پەندانــەی تــۆ ئــەیڵێیت بــەس قســەی پروپوچــەو هیچــی تــر ئەمانــە دەوڵەمەنــدەکان ئــەو قســەیە دەکــەن بــۆ ئــەوەی فەقیرەکانی پێ هەڵخەڵتێنن .

کــاردۆ : ئــەزانی کــاك محمــود مــن هــاورێ یــەکم هەیــە پــارەی زۆرە ، هــەموو شــتەکانی کــە حــەزی لێیــەتی هێنانەویەتــە دی ســـەفەری زۆر ئـــافرەتی زۆر ســـەیارەی زۆر بـــەڵام هەمیشـــە ئـەڵێت مـن چـەنێك دەوڵەنـدم ئەوەنـدە تـەنیام ئـەڵێم بـۆ ، ئـەڵێ لەبـەر ئــەوەی کــاتێ پێویســتم بــە هــاورێ یــەك هــەبوو لــە تەنگانــەدا هـەموو ئـەهاتن بـەڵام هێنـدەی هاتنیـان هەسـتم بـە نـا ئـارامی ئـەکرد لەگـەڵیان هەسـتم ئـەکرد کـە منیـان بـە پارەکانـەوە دەوێـت بۆیـە دێنـە هانـام دەنـا چـەن جـار کەسـانی فـەقیر پێویسـتیان بـە هانـاوە چـوون بـووە کەسـیان نـەچوون مەبەسـتم ئەوەیـە ئـەوەی بـاش بێـت لـە مـن نزیــك نابێنــەوە هەمیشــە مەبەســتێك هەیــە لــە پشــت هاورێیــەتی ئــەوەوە، دوای ئــەوە کــاك محمــود پــارە لــە تــەنیایی نــاو خــۆت رزگـارت ناکـات ببینـە ئەوانـەی پارەیـان هەیـە لـەم وڵاتـە چـی لـێ دەکــەن بــەرەو کــوێ دەبــەن تەنانــەت وایــان لێهــاتووە نەخۆشــی پەیـدا کردنــی پــارەی زیاتریــان تــوش بــووە تــا کاتێـك نامێنێتــەوە

پارەکـەی تیـا سـەرف بکـات کاتێـك نـامێنی بزانـی ئـەو ئەمـەی بـۆ چـی کـرد کـاك محمـود پـارە ئەونـە خۆشـە کـە خۆت قەناعـەت پێـی هـەبێ مـن هـەموو پـارەی دنیـام هـەبێ نـاتوانێ کـەمی لـە هەڵـەکانی ژیـانم بسـڕێتەوە نـاتوانێ بمگێڕێتـەوە منـاڵی ، ئـادەی بـزانم پـارە ئـەو منـداڵی یـەم ئەداتـەوە کـە لـێم ڕۆیشـت بـێ ئـەوەی درك بـە خۆشـی یـەکانی بکـەم ئـەو منـداڵی یـەی خـەوەکانم تـەنها تـۆپێکی خربـوو حـەزی پاسـکیلێکی دوو تـایی لـە ناخمـا ڕەگـی کـرد و نەهاتـە دی ئێسـتا گـەر پـارەش بتـوانێ تـۆپ و پاسـکیلەکە بکـرێ ئـەو ڕۆحـەی جـارانی پـێ نـاکرێ یـاری کردنەکـەی پـێ نـاکرێ و ئـەو توانایـەی پـێ نـاکرێ بـە پاسـکیلەکە بفـرم تـا ئـەودیو ئـەو هەورە تۆپەڵانەوە .

کـاك محمـود گیـان مرۆڤـەکانی ئێمـە ڕاسـتە پێکـەوەن و خێزانیـان هەیـە بـەڵام بـڕوا بکـە لـە ناخـەوە هـەموویان تـەنهان ئـەوەش بزانـە تــەنهایی مرۆڤــەکان گەورەیــە زۆر گەورەیــە .. ڕەنگــە بــە فراوانــی دەریایــەک بێــت. بــۆ پڕکردنــەوەی ئــەو تــەنهایی یــەی هـەموومان تـەنها پـەرداخێ خۆشەویسـتی مـان دەوێ تـا لـە یـەك تێ بگەین و پێکەوە تەنیا نەبین .

محمـــود : منـــیش هـــەر ئـــەوە ئـــەڵێم ئـــەوەی لـــە ئێمـــەدا وونـــە خۆشەویسـتی یـە یـان ئەوەیـە کـە هـەر نـی یـەوە ئـەبێ ئێمـە تـا مردن بە دواییدا بگەڕێین .

کـــاردۆ : پـــارەش ، پـــارە ژمارەیـــە و ژمارەکـــانیش هـــەرگیز کۆتاییـان پـێ نایـەت ئەگـەر دەتـەوێت پـارە هـەڵبگریت بـۆ ئـەوەی دڵ خـۆش بیـت ئـەوا تـۆ بـۆ دڵ خۆشـیەک دەگـەڕێیت کـە هـەرگیز نایگـەیتێ ، وە ئـەوەش بزانـە هـەنێك هـەر لەبـەر بەرژەوەنـدی لەگـەڵتن وە کاتێـك بەرژەوەنـدی کۆتـایی دێـت ئـەوانیش وون دەبـن ئـەوو وونبوونـە زۆر ناخۆشـە کـاك محمـود کـە لـە گـەڵ وبنـونی پارەکەدایـە ئـەو کـات تـۆ خۆشەویسـتەکان پێکـەوە لـە یـەك کاتـدا لـە دەست ئەدەیت .

کـاك محمـود گیـان لـێم ببـورە بەراسـتی ئـەمرۆ بیـزارم کـردی ئـەزانی .بـا بـڕۆین کـات درەنگـە وا بـزانم ئـەمڕۆش قەڵـەممان نەخسسـتە سـەر وەرقـە ، ئـەزانی کـاك محمـود ئـەم حکومەتـە لـەم بێ پلانی و بێ بەرنامەیەیدا تەنها گەندەڵ بەرهەم دێنێ .

محمـود : نـا بـرام ئاسـایی یـە مانـدوو نـەبووم بـە پێچەوانـەوە منـیش کـەمێ دەردە دڵـی خـۆم بـە بـا دا ئیتـر حکومـەتی گەنـدەڵیش هـەر

وەچـەی گەنـدەڵ بەرهـەم دێنـێ بـا باسـی حکومـەت نـەکین باشـترە بـە خـوا باسـی شێلم بـە تـرش بکـەی زۆر لـەوە باشـترە ،  بـا بـرۆێن برام.

کـە رۆیشـتین لـە دواوە سـەیری کـاك محمـودم ئـەکرد وەك سـتەم لێکـراو وەك سـتەمکار ئـەمبینی ، سـەیرە دوو کەسێتی لـە یـەك  لـە کەسێکدا کۆ دەبنەوە  بێ ئەوەی دەورو بەرەکە هەستی پێبکەن.

لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم شـتانە ئـەوەمان نیشـان ئـەدات ژیـان بەو هەمـوو ناشـیرینیەی خـۆیەوە هێشـتا باشـیەکی هەیە، ئەویـش بەتێپەڕبـوونی کـات کەسـایەتی دووەمـی مرۆڤەکـانی دەوروبەرت پیشان دەدات.

.

ئـەمرۆ تـەواو بریارمـدا رێـك برۆمـەوەماڵـەوە بنـووم مانـدوو بـووم زۆر، بـەڵام  پێویسـتیم بـە کۆمـەڵی شـت بـوو لـە بـازار بۆیـە ناچـار چووم بۆ بازار .

لـەوێ ئـەوەی گـوێم لـێ بـوو  هـەر باسـکردنی دۆخـی گرانـی و ئـەو بارودۆخـەی وڵاتەکـەی تێکـەوتووە ، ئـاخر خـۆ ئێمـە لەوەشـدا

نەگبـــەتین هـــەرچی نەگبەتیەکانـــە هـــەموویان بـــۆ هێنـــاین بـــەڵام ڕۆژێــك نەمــدی خۆشــبەختیمان لەســـەر ســینی یــەکی ڕازاوە بــۆ بینن ، جـا ئەمـە خۆشـی یەکەیـە لێـرەدا سیاسـی یـەکانمان خـەریکی بازرگـــانی و دزیـــن و ســـەروەت پێکـــەوە نـــانن خەڵکـــە ئاســـایی یەکـــەش خۆیـــان ســـەرقاڵ کـــردووە بـــە سیاســـەتەوە ، ڕۆژ ڕۆژی ڕۆشـــنبیرەکانمانە ســـەر تەلـــەفزیون و ڕادیۆکـــان بەرناکـــەون بـــرۆ هـــەر شـــوێنێ ڕۆشـــنبیرێك ئـــەبینی خـــۆی کـــردووە بـــە چـــاودێری سیاســـی و خەریکـــە لێکۆڵینـــەوەی دۆخەکەیـــە ، مـــن مەســـەلێکی ئینگلیـزیم بیـر کەوتـەوە ئـەڵی زاناکـانی سیاسـەت ئەوانـەن ئـەتوانن پێشـــبینی ڕووداوەکـــان بکـــەن پـــێش ڕوودانـــی ، ڕۆشـــنبیرەکانیش دوای ڕوودانــی شــتەکان ئەکەونــە چەنــە بــازی لــە ســەری ئەمانــەی ئێمـەش ڕێـك وان جـا زۆریشـیان لـە ژێـرەو لەگـەڵ ئـەم لاو ئـەو لا ڕێکەوتوون بەس خۆڵ ئەکەنە چاوی خەڵکە نەگبەتەکە.

مــن بــڕوام وایــە هــەر کــات مــرۆڤ بــە قســەی سیاســی یــەکان هەڵخەڵـەتا ئـەوە ئیتـر فاتیحەیـەك بـۆ عـەقڵی داخـات کـە لـە دەسـتی داوە ، ئـــاخر مـــن شـــتێکم خوێنـــدبووەوە کـــە گوایـــە ژنێـــك کـــە مێردەکـــەی مـــرد پێیـــان ووت بـــەخوا مێردەکـــەت کەسـێکی ڕاسـتگۆ بــوو ، ئـــەویش ووتبـــووی میردەکـــەی مـــن سیاســـی یـــە بـــوو ئیتـــر

راستگۆی چی ، ئەوەش رێك ئەوە ئەسەلمێنێ کە سیاسەت هەڵخەڵەتاندنی عەقڵە لاوازەکانە .

سیاسەت ووشەیەکی ناشرینە لێرە ، دەنا خۆی زانستە لە شوێنانی دی ، لێرە تەنها دزین و کوشتن و جەنگ وو ترسە و دزی یە ،من دەسەڵاتم هەبوایە ئەوانەی جەنگیان هەڵدەگیرسان بە لووت هەڵم ئەواسین ئەوانە نازانن چ کارەساتیك دەکەن لەم گەردوونە جوانەیا.

ئەوەتا زەمینێکی دی پر ئەکەین لە خوێن و کۆمەڵێ سەربازی دی بە کوشت ئەدەین بەم رۆژگارە خەریکی شەرو تێکدانی ئەوی ترین ، بەر لەوەی زەرنەقوتەکانمان فێر بن بڵێن بابە فێریان ئەکەین چۆن بێ ناز باڵە فرە بکەن ، تارمایی یەکی دی ئەخەینە سەر تارماییەکانمان تا ووردە ووردە ژیان رەشتر ئەکەین ، هەموو چۆلە کەکان تەرە ئەکەین ، چیتر پێویت ناکا گوڵ بروێنین ، تازە ئیتر باران بباریٚ یان نەباریٚ جیاوازیەك نی یە تەنانەت لە گەڵ سێبەرەکەی خۆشمان هاوریٚ نین ، کوا هەموو تابلۆکانمان سوتان هەموو هۆنراوەکانمان سرەیەوە ، یەك وێنەمان نەما بۆ یادگاری گەشتینە ئێرە کەس کەس ناناسێ ، ئەوە ئێمەین پێکەنینمان کۆکردەوە تەلاقمان دا ئەوە ئێمەین

گریانمـــان کردۆتـــە مۆمێـــك و دامانگیرســـان ، هاورێیـــان لۆمـــەی کـــەس مەکـــەن ئـــەوە هـــەمووی خۆمـــان بـــووین پەنجـــەکانی یـــەکترمان بـــری و چـــاوی یـــەکمان کـــوێر کـــرد ئیتـــر لۆمـــەی کەســـی دە مەکەن .

زمـــانی کـــۆترم نەدەزانـــی تـــا پـــێ بَـــێم ریگـــەم دە کـــەمێ لـــە خـــەونی نیشـــتیمانا بنـــووم هـــاژەی زەریـــاخەوی زڕاندمنیشـــتیمانێکم دەوێ لە نێو هـــاژە و ئاســـــوودەییزەریا لـــــەنێو گـــــەمی گمـــــەی بـــــەیانیان و...پرتـــــەقاڵ بـــــوونی ئێوارانیـــــدا کـــــەمێ بنـــــووم بـــــەڵام ئێســـــتا نیشـــتیمانێ بۆتـــە دایکـــم هـــەموو جەســـتەی برینـــدارەو وهـــەر رۆژەی ئازار لە شوێنێکی دێ .

لەم بیرکردنەوانەدا بووم هێلین تەلە فونی بۆ کردم .

هێلین : کاردۆ گیان ئەوە لە کوێیت رۆحەکەم؟ .

کاردۆ : بۆ هێلین چی بووە خێر ؟

هێلـــین : هـــیچ رۆحەکـــەم تـــەنها زۆر بیـــرم کـــردی زۆر زۆر ، ئـــەزانی کـــاردۆ کـــە بیـــرت لـــێ دەکەمـــەوە فیردەوســـێ لـــەناو چاوەکانمـــا دەبیـــنم . ئەشـــکی منـــاڵیم لـــەناوما ئەســـوتێ هـــەموو ســـۆزی

ئــەم دنیایــە بــە ســەرمدا دە بــارێ ، هــەموو ناســکیەکان ختووکــەم دەدەن، بـروا بکـە کـە بیـرت لـێ دەکەمـەوە زەردە خەنـە سـەر لێـوم جـێ نـاهێڵێ ،بـە یـەك ووشـە پـێم بڵـێ تـۆ چیـت ؟؟! تـۆ کێییـت ؟؟! وا بە بیرکردنت هەموو گیانم سر ئەبێ .

هــەموو ڕۆژێ جیــا لــە ڕابــردوو هــەنگاو دەنــێم بــە پۆشــاکێکی پولەکـە ئاسـا پێکـانم جیـا لـە جـاران هـەڵم دەگـرن ڕێگاکـەم شـەپۆلی دەریایــە کــی ڕەنگینــە هــەموو ڕۆژێ جیــا لــەدوێینێ بیــرت دەکــەم وەك ئەســتێرەیەك لەهــەر ســەیرکردنێکدا بریســکەییەك دێتــە بــەر گلێێنــەکانم هــەموو ڕۆژێ جییــا لەوســا پێکــەنین هــەموو جەســتەم دادەپۆشــێ تــۆش وەك تــەڕی لەســەر لێوەکــانم دەنیشــی هــەموو ڕۆژێ جیالەهــەموو ســاتێ لــەناو خــەونێکتا گــوزەر دەکــەم و زۆر ئاســان وون دەبــم وزۆر ئاســان دەتدۆزمــەوە جیــا لەهــەموو جــارێ لەناو هەناسەیەکتا ئەتوێمەوە !!

کــاردۆ : بــەخوا هێلـین گیـان خـۆم منـیش بـە هـەمان شـێوەی تـۆم بگـرە زیـاتریش بـروا بکـە دەزانـم ڕۆژێـک دێـت منـیش هێنـدەت بیـر دەکەم عـەموودی سـەر جادەکـان مـاچ ئەکـەم تـا وام لـێ دێ ئێوارەیــەك بــە زەمیلەیــەك خــەم و بــە دڵێکــی شــکاو بەجەســتەیەکی شــەکەت و دامــاوەوە بــە کــۆڵی شــیعری پــر خــەم و و هەســتێکی

روخـــاوەوە خـــۆم دەكێشـــم بە دیوارەكـــانی شـــەقامەكاندا خـــۆم دەكێشـــم بە دەرگـــای ژوورەكەمـــدا و ئەكـــەوم بە جێگەكەمـــدا ئیتـــر لەوێدا بە هێمنی دەمرم .

هێلین : خوا نەكا بەساقە وا مەڵێ توخوا با گیانم دەرنەچێ .

كاردۆ : هێلین گیان ئەگەر توانیت با سبەینێ یەك ببینین باشە ؟

هێلین باشە هەوڵ دەدەم خەم نەبێ .

كاردۆ: ئەی چی بوو بۆچی تەلەفونت كردبوو ؟

هێلـــین : تـــەنها بیـــرم كـــردی و تـــەواو دەی خـــوات لەگـــەڵ ئـــەزانم ئێستا سەرقاڵی .

كاردۆ: خوات لەگەڵ رۆحەكەم .

ئـەم جـەنجاڵی و قـەرەباڵغی یـە بـازاری ئێمـە قـەت تـەواو نـابێ ئـەم عەشـاماتە هـەر لـە بـەیانیان هەڵدەسـتن خـەمی ورگیانـە تـا ئێـوارە هـەر هەڵپـەی خواردنیانـە خـۆ لـە سەرێكیشـەوە ناحـەقیان نـی یـە چی بكەن لەم نیشتیمانە وێرانەدا .

ئـای نیشـتیمان  بـە خـوا نیشـتیمان لـە نـاو تـۆدا تەنانـەت خەونیشـمان نەما ..خەونەکانمان کۆن بوون کۆن .. بەسەر چوون

چیتــر خــەونمان پــێ نــەما ئەمەنــدەمان خــەون بینــی و نەهاتــە دی چیتر خەونمان پێ نەما تەواو بووین ئەی نیشتیمان تەواو .

بەراسـتی گەرانـەوە بـۆ ماڵـەوە ئـارامی یـە هیمنێـەکی خۆشـت پـێ ئەبەخشـێت مـن هەمیشــە کــە لــەماڵ بـم بێـزار نــابم هەســت بــە هێمنــی زیــاتر دەکــەم هەرچەنــدە هەمیشــە تــەنهام ، ئــای تــەنهایی پارچــە پارچــەت کــردین ســەیرە هــەموو قــەرەباڵغین .. پــرین کـەچی هەمیشـە تەنیاشـین  لەگـەڵ خۆمانـدا لەگـەڵ خەڵکدا تـەنیا لـە گــەڵ ئەمانــدا تــەنیا لەگــەڵ ئەوانــدا تــەنیاین ...تــەنیایی نــوقمی خــەمی کــردوین   کــەچی هێشـتا تـەنیایمان پــێ باشـترە بـۆ هێـور کردنـەوەی رۆحمـان  بـەس مـن ، مـن هەمیشـە ئـەموت ڕۆژێـك دێــت مــرۆڤ شــانــازی بــە تـەنیــایی خۆیــەوە  ئـەکــات ئــەو رۆژە ئێسـتایە ، بـەخوا لـە کۆتایشـدا هـەمومان بـە تـەنیایی سـەفەر دەکــەین هــەر بۆیــە بــەهێتزترین مرۆڤــەکانی ئــەم گەردوونــە ئەوانەن کە تەنیان  .

لـە تەنهایـدا مـرۆڤ زۆرتـر بیـر دەكاتـەوە بـە تایبـەتی لـە رابـردوی خـۆی ئیتـر زۆرتـر بەسـەر ئازارەكانیـدا ئەچێتـەوە بـەس سـەیرە هـەنێك ئـازاری مـرۆڤ وەك قـاوە وایـە سـارد ئەبێتـەوە بـەڵام تـاڵی یەكـــەی هـــەر دەمێنێتـــەوە ، مـــن هەمیشـــە ئـــازاری كارەكـــانی رابـردووم تاڵـە لـە گەرومـدا ، ئێسـتا بیـری ئـەوەم كەوتـەوە كـە مـن لـــە رابـــردوودا پـــارەم هـــیچ پـــێ نـــەبوو نـــانێكی پـــێ بكـــرم زۆر چەنـــدێكم داوا ئـــەكرد كەســـێك نـــەبوو لـــەتێك نـــانم بـــداتێ چـــەنێك داوام دەكـرد بـەڵام وەڵام نـەبوو كـە منـیش زانـیم ئـەم پارانـەوەی چ سـودێكی نـی یـە بۆیـە ناچـار سـەمونێكم دزی و ووتـم خـۆ هـەر كـەس نامـداتێ ئێسـتا بـە تێری بـە بـەردەم ئەوانـەدا ئـەرۆم كـە بـە برسێتی لێیـان ئەپارامـەوە تـا تێبگـەن ئـەوانیش نـەبن مـن هـەر تێـر ئەبم .

لـەرابردو شـتی سـەیرم بەسـەر هـاتبوو زۆرینـەیم بیـر نـەماوە خـۆم بـەڵام لـەم لاو ئـەو لا بـۆم ئەگێرنـەوە خۆشـم سـەیرم پـێ دێـت كـە چـۆن توانیوومـە تـا ئێـرە گـوزەر بكـەم ، رەنگـە هـەر ئـەو ئـازارە زۆرانـــەی چەشـــتوومە و ئـــەو كەســـانەی گوزەرمـــان كـــرد بـــوو پێكـەوە هـەر ئەوانـە بـووبن بـە ماموسـتام ، منـاڵی مـن تابلۆیـەكی رەنگـین بـوو هەسـت ئـەكر هـەموو رەنگـەكانی تێدایـە تەنانـەت

رەش و سـپی و خۆڵەمێشیشـی تێـدا بـوو ، لـە جیهـانی منداڵـدا خـراپ بـوونی نـی یـە   ئـەوان ئاوێتەیـەکی روونـی پـاکن بێگـەردن ئێمـەین کـە ئـەوان فێـری بۆگـەنی یـەکانی ژیـان دەکـەین ئـەوان هەویرێکی نەرمن چیت بوێت ئەتوانی دروستی بکەیت لێیان .

کـە منـاڵ بـووم هەمیشـە پێیـان ئـەووتم درۆ بکـەی خـوا کـوێرت دەکـات ، ئەمـە ئەسـڵەن بـۆ خـۆی درۆیـەکی گـەورە بـوو ، کاتێـك ئـەم درۆیـەم بـۆ دەرکـەوت ئیتـر فێـر بـووم منـیش چۆن درۆ بکـەم ، رۆژێکیـان لەگـەڵ بـاوکم چووینـە بـازار لـەوێ بـە بـەردەم مزگـەوتێکی گـەورەی ناوەراسـتی بـازاردا تێپـەرین کـە بینـیم خـەڵکانێکی زۆری کـوێری لـێ بـوو لـە بـاوکم پرسـی بابـە ئـەوە ئـەم پیاوانـە هـەموو درۆزنـن ، ئـەویش ووتـی بـۆ وا ئـەڵێت نـەخێر جـارێکی تـر شـتی وا مـەڵێ ، پـێ ئـەچو باوکیشـم خـۆی لـە بیـری چـوو بێـت کـە درۆکـەی لەگەڵـدا کـردووم ، درۆزن ئـەبێت بیـری تیـژ بێـت دەنـا وەك بـاوکم تـێ دەکـەوێ ، منـیش ووتـم ئـەی باوکـە تـۆ نـەتووت ئـەوەی درۆ بکـات خـوا کـوێری دەکـا ئـەی ئـەوە نـی یـە ئەوانـە کـوێر بـوون کەواتـە ئەوانـە درۆزنـن ، دووبـارە ئـەویش لـێم تـورە بـوو ووتـی نـەخێر مـن شـتی وام نـەوتووە خـوا چـاوی کـەس کـوێر ناکـا خـوا بەرەحمـە ئیتـر لـەو رۆژەوە زانـیم ئـەم خەڵکـەی

ئێـره بـۆ ئــەوەی رێگــای درۆت لێبگــرن درۆت لەگــەڵ دەكــەن و لەوێوە فێری درۆت دەكەن .

تەنانـەت كـاتێ بـاپیرم و نـەنكم چـوون بـۆ حـەج پرسـیارم لـە بـاوكم كـرد ووتـم باوكـە خـوا چەندێكـە ؟ ووتــی خـوا گەورەیـە كـورم زۆر گەورەیـە ، ووتـم ئـەی لـە چـی گـەورەترە ، ووتـی لـە هـەموو شـتێ گـەورەترە ، تـا ئـەو رۆژەی بـاپیرم و نـەنكم لـە حـەج بـوون ووتـم باوكـە ئـەوان بـۆ چـوون بـۆ حـەج ووتـی ئـەوان چـوون بـۆ مـاڵی خـــوا ، راســـتی یەكـــەی ئـــەوە دەركـــەوتنی نهێنـــی یـــەكی زۆر گـەورەی ژیـانم بـوو پـر بـە دڵ حـەزم دەكـرد مـاڵی خـوا ببینم ووتـم باوكـە كامـە مـاڵی خوایـە ، لـەو كاتـە چونكـە وەختـی حـەج كـردن بـوو هەمیشــە لــە تەلەفزیونەكــە كەعبــەی نیشــان ئــەدا كــە پێیــان دەوت مـاڵی خـودا ، بۆیـە خسـتی یـە سـەر كـەناڵێك و ووتـی ئـەو پـەردە رەشـە ئـەبینی ئـەوە مـاڵی خوایـە ، كـە ئەمـەم بیسـت ئـەتووت لــە ســەربانەوە فــرێم ئەدەنــە خــوارەوە واقــم وورمــا و حەپەســام ووتـم باوكـە ئـەی تـۆ ناڵێیـت خـوا زۆر گەورەیـە و لـە هـەموو شـتێ گــەورەترە ئــەی پــێم بڵــێ چــۆن لــەم شــوێنە بچووكــە جێگــای دەبێتـەوە ، ئـەویش دیسـان تـووره بـوو ووتـی بـێ دەنـگ بـە كـەره بڵـێ خوایـە لـێم خـۆش بـە ئـەوە تـۆ كفـر ئەكـەی جـارێكی كـە شـتی

وا نــەڵێیت هــا ، تومــەس ئەســڵەن بــاوکم وەك زۆرینــەی خــەڵکی ئێــرە نــە خــوا ئەناســن وە نــە لــە دینەکــە تێگەیشــتوون بۆیــە لــەو ســەردەمەوە بریــارم دا بیــر لــەو بابەتانــە نەکەمــەوە بــۆ ئــەوەی توشی کێشە نەبم .

لــە بیــرم دێ یەکــەم کــچ کــە خۆشــم ویســت توشــی شــتێکی ســەیر بــووم ووتــم بــا بچینــە دەرەوە لەگــەڵ خــۆم بــردم بــۆ ئــەو شــەقامانەی هاورێکــانم پێیــدا تــێ دەپــەری تــا ئــەوان ببیــنن و منــیش پــۆز لێــدەم کــە کچێــك خۆشــی ئــەوێم ، جــا شانســەکەی مــن کــە بــە شــەقامەکەدا رۆیشــتین ســەیارەکەی باوکیمــان بینــی ، ئــەویش زۆر ترســا ووتــی ئەرۆمــەوە منــیش تــورە بــووم ، ئــاخر چوونکــە هێشــتا هاورێکــانم نــەیانبینی بــوو بۆیــە ووتــم بــرۆی ئــەم خۆشەویســتی یــەی مــن تــۆ کۆتــایی پــێ دێــت ئیتــر بــە تــەما مەبــە مــن بێمــە داوات، راســتی یەکــەی ئــەو خۆشەویســتی یــە خــۆی دوو رۆژ بــوو دروســت بووبــوو بۆیــە ئەســڵەن تێنەگەیشــتم کــە تــامی خۆشەویســتی چــی یــە و چۆنــە ، ئــەویش لــە ترســا ووتــی مــن ئیتــر خۆشەویســتی ناکــەم ئەرۆمــەوە خــوا حــافیز جــارێکی کــە قســەم لەگــەڵ مەکــە . منــیش زۆر بێباکانــە ووتــم کــەیفی خۆتــە دوای زەرەر ئەکــەیت مــن بــە تــەمام بتهێــنم ئەگــە ناتــەوێ پێکــەوە ببینــە هاوســەر چــاوت دەرەهــات

بــرۆ ئەمــەی مــن ئــەمووت تەمــەنم تــەنها ســیانزە ســاڵ بــوو وابــزانم ئەسَــڵەن نەمئــەزانی کــچ مــەمکی هەیــە نــەم ئــەزانی بــۆ ئــەبێ کەسـێکت خـۆش بـویٚ تـا تـامی لێوەکـانی بزانــی نـەم ئـەزانی ئـــەبێ چـــی بکـــەیت لەگـــەڵ خۆشەویســـتەکەت وەختـــیٚ بـــە تـــەنها پێکـەوە ئـەبن راسـتە ئـەو کـات رەسـمی ئـەو شـتانە هـەبوو لـە نێـوان کورانــدا ئەگۆڕایــەوە بــەڵام مــن وام ئــەزانی هــەر ئــەو ئافرەتانــە ئــەو شــتانە ئەکــەن نــەم ئــەزانی هــەموو ئافرەتێـك حــەزی مــاچی خۆشەویسـتەکەی هەیـە لــە ناخیـا ئاواتــە خـوازی باوەشـێکی تونــدە کــاتیٚ پێکــانی ئەخاتــە ســەر پێکانــت . بۆیــە بــە خــەیاڵما نــەهات هــەر ئــەوە رۆژە لــەو شــوێنەدا زۆر بــیٚ باکانــە وازمــان لــە یــەك هێنــا و ئیتر یەکترمان نەبینی یەوە .

هــەر یەکســە ردووای ئــەو بــە دوای کچێکــی تــردا گــەرام تــەنها ئەوەنــدە گرنــگ بــوو لام جــوان بــیٚ ئــەم زانــی بــۆ بیرچونــەوەی ئافرەتێــك ئەونـــدە بەســـە ئـــافرەتێکی لـــەو جـــوانترو بـــە نـــازتر بـدۆزەرەوە ئیتــر ئاســان ئــەوەی یەکــەم بیــر ئەچێتــەوە ، هاورێمــان هـــەبوو ئـــەیوت لای مـــن گـــۆڕینی کچـــەکان وەك گـــۆڕینی کراســـەکەی بەرمـــە هێنـــدە ئاســـانە . ئەمـــە مێـــژوی ئێمەیـــە زۆرینـــەی هاورێکـــانم خـــەریکی ئەمانـــە بـــوون لـــەو تەمەنـــەدا

هەشـیان بـوو خـۆی سـەرقاڵ کردبـوو بـە وەرزشـەوە بـەڵام وەك ئێسـتا هاورێمـان نـەبوو خـەریکی دیـن و مزگـەوت بێـت ئـەو کـات کـە منـاڵ تـەواو گـەورە ئـەبوو ئینجـا کـەمێ لـە دیـن شـارەزا ئـەبوو نـەك وەك ئێسـتا تەمـەنی پێـنچ سـاڵەنە لـەچکێکی لەسـەر کـراوە ئـەڵێن خـۆت داپۆشـە بـا خـوا لێـت تـورە نـەبێ ئـاخر هـەی نەگبـەت خوا چۆن لە بەرائەتی مناڵ تورە ئەبێت .

وا بـزانم لـەم بیرکردنەوانـەم واز بێـنم و خـەمێکی ورگـم بخـۆم منـیش ، وا بـزانم ئـەویش زەنگـی لێـدانی نزیـك بۆتـەوە مـن خـۆم بـە تـەنها چێـژ لـە دروسـت کردنـی خـواردن دەکـەم بـەڵام بـۆ خـواردنی حـەز ئەکـەم کەسێکم لەگـەڵ بێـت بۆیـە خـواردنێکی زۆر بـە تـامم دروسـت کـردو تەلـەفونم بـۆ جـوانرۆ کـرد تـا کـەمێ لـەم بێتاقەتیـەم بێمـە دەرەوەو خواردنەکـە پێکـەوە بخـۆین ئـەمزانی ئـەویش لـە ئاسـت فـەرمووی خواردنـدا نـەئی نـی یـە وە هەمیشـە حەز بە خواردنی بەلەزەت ئەکات .

کاردۆ : ئەلو جوانرۆ چۆنی ؟

جـوانرۆ : وەڵا خـراپ نـیم بـەس بەشـەرەف خەریکـە لـە برسـا وەك مشـك ئـەتۆپم ، بـە تـەمام بچـم شـتێك لـە دەرەوە بخـۆم لـە

ماڵــەوە ســاوەرمان هەیــە مــن و ســاوەر رێــك دوو دوژمنــی ســەر سەختی یەكین ئەگەر تۆش دێیت وەر با پێكەوە برۆین .

كــاردۆ: نــا كاكــە دەســت خــۆش مــن خــۆم بــۆ ئــەوە تەلــەفونم بــۆ كــردی تــا بانــگ بكــەم بــۆ ماڵــەوە دەعــوەتی منــی شــتێكی بەلــەزەتم لێ ناوە حەزەكەم پێكەوە بیخۆین .

جوانرۆ : ئەك بە قوربان بم ، چیت لێناوە تو شەرەف؟

كاردۆ : برنج و فاصولیاو قاز .

جــوانرۆ : ئــەك بــرا جــا بڵــێ وەرەو لێــرە خــۆت بكــوژە لــە خوشــیاو هــەر لێــرەش بــا لــە تەنیشــت قازەكــەوە بتنێــژم بــە قــەد دەنكــە فاصــولیاكانیش فاتیحــەم بــۆ دایــە ، بابــە ئەمــە نــەك چەژنــە ئەمــە تەبــەروك و حەجــە بەشــەرەفم ، ئــەزانی چــی ئــا ئیســتا هــەر بــە بیجامــەوە هــێم تەحــەمولم نــەما تــەواو پەتــەكانی ســكم هــەمووی پچرا .

كــاردۆ : نــا كاكــە خــۆت بگــۆرە تــا تــۆ ئەگــەیت قازەكــەش كــەمێكی ماوە بكولێ .

جـوانرۆ : بــە قوربانــە بــە کەســی کــە نــەڵێت ئــا ئیسـتا هـێم خـۆم شــەهید ئەکــەم دەی بــە قوربــان جــارێ خــوا حــافیز ئــە هـیچ نــەهێنم لەگەڵ خۆمدا ؟.

کاردۆ :نا کاکە هەر خۆت و ورگت بێنەو تەواو .

هەسـتم کـرد تـوانیم ئـەم ئێوارەیـە بەهەشـتێ ببەخشـم بـە جـوانرۆ ، ســەرقاڵی ئامــادەکردنی خواردنەکــە بــووم لــە جەرەســی دەرگاکــە درا ، راسـتی ترســام ووتــم ئــەبێ کــێ بــێ بــە خــوا تــازە بزانــە نسـیبی کـێ ی تریشـی تێکـەوتووە ئـەو قـازە بـێ نـازە چەنکـە بـروام نەکرد بەو زوی یە جوانرۆ بگات.

کە دەرگاکەم کردەوە حەپەسام و بروام نەکرد .

کــاردۆ : جــوانرۆ ئــەوە تـۆی ، ئــەی بـۆ وا مــوحترەم بــووی لــە جــەرەس ئــەدەی باشــە ئــەوە بــە چــی هــاتووی وا زوو گەیشــتی رۆڵـە ؟

جـوانرۆ: کـورە بابـە قـازە قـاز تەنەکـەچی ئـەکا بـە سـەفیر چـۆن موحتــەرەم نــابم ئێسـتا هێمــە ژورەوە ســەری رێـز بـۆ قـازە کـوڵاو دانەوێنم .

سـەیرە بەختـەوەری هەنـدێك كـەس چـەن ئاسـانە ،ئـەوەی نهێنـی خۆشـبەختی و بەختـەوەری یـە گرنگـی دۆزینەوەیـەتی لـە لایـەن كەسـەكە خـۆی دەنـا زۆر جـار ئـەوەی تـۆ بـە بەختـەوەری و خۆشـبەختی ئـەزانی و ئەتـەوێ پێـی بگـەیت مـەرج نـی یـە بەختـەوری بێـت هەرچەنـە بەختـەوەری زۆریـان كـاتین یـان تامەكـەیان تـەواو ئـەبێت بـەس گرنـگ تـۆ بتوانیـت بـۆ چركەیـەكیش بێـت بەختـەوەر بیـت ئـەوەتا جـوانرۆ بـە دیـدەنی بـەرێز قـاز شـادە وە گرنـگ ئـەم سـاتەیە كـە ئـەو تێیـدا دەژی بۆیـە پێویسـتە مـرۆڤ ئـەو سـاتەی تیایدایـە پەنجـە بـۆ هـەموو بەختەوەریـەكانی خـۆی ببـات بەمـەرجێ ئـازاری كـەس نـەدات وە زەرەری بۆ كەس نەبێ .

دەی ئێسـتا كاكـە جـوانرۆ بەختـەوەرترین مرۆڤـی سـەر ئـەم زەمینەیە لەگەڵ رێز و سوپاس بۆ قازی بەرێز.

بـەدەم لێسـانەی ئێسـقانەكانی قازەكـەوەو خواردنـەوەی سـوپەكەی جـوانرۆ ووتـی : بەراسـتی دەسـتەكان خـۆش بێـت قـازێكی تـا بڵـێ ی بەلەزەتـە ئەمـە چـی یـە غـەزەب ئـەم تـۆ چ وەسـتایەكی قـازی بـروا بكـە دایكیشـم ئـاوا لـێ ی نانێـت باشـە تـۆ ئـا ئەمـە لـە كـوێ وە فێر بوویت .

کـاردۆ :عافیـت بێـت گرنـگ بـە دڵ بێـت ئـاخر بـرام مـن ماوەیـەکی زۆر لــە چێشــتخانە کــارم دەکــرد ئەمــە هــەمووی شــارەزایە ئــەو وەسـتا جەمالەیـە کـە کـاتی خـۆی ئیشـم لەگـەڵ دەکـرد بـە رەحمـەت بێت وەستایەکی زۆر شارەزا بوو بەڵام کەمێك رەزیل بوو .

جـوانرۆ : شـازە شـاز، باشـە کـاردۆ پرسـیارێك بکـەم ؟ ئـەڵێن پیـاو کـە تێـر بـوو قسـەی زلـی بـۆ دێـت ئـەڵێم تـۆ بـۆ قـەت مەشـروب ناخۆیتـەوە ؟ ئـەڵێن ئـەم قـازە دوای چـارەکێ ویسـکی حەیاتـە تـۆ بـۆ شتێك ناخۆیتەوە ؟

کــاردۆ : راســتی یەکــەی مــن گــەدەم تــەواو نــی یــەو نــاتوانم بخۆمــەوە لــەوە دەچــێ بــە گــەدەم نەکــەوێ چەنــد جارێــك کــە خواردومەتـەوە زۆر ئـازاری گـەدەو نـاو سـکی داوم بۆیـە وام پـێ باشـتر بـووە ئـەو ئـازارە بـە خـۆم نەگەیـەنم پاشـان خواردنـەوە لـەم وڵاتــەی ئێمــە ســەقەت کــراوە مــن تێناگــەم مرۆڤــەکان لێــرە ئەخۆنــەوە بـۆی خۆیـان ئـازار بـدەن یـان دەوروبەرکـەیان ئـازار بــدەن بــەم جــۆرە خواردنەوەیــەی ئێــرە ، ئیتــر بەشــێکیش بــە حــەرامی ئــەزانێت بەمــەرجێ هــەر ناشــزانێت بــە چ ئایــەتێ حەرامـە یـان حـەرام نـی یـە ئـا بـەم شـێوەیە ئیتـر لەبـەر ئـەوەی کـە ووتراوە حەرامەو نابێ بخورێتەوە تەواو تەرکیان کردووە .

جوانرۆ : باشە ئەی ئەگەر گەدەت باش بووایە ئەتخواردەوە ؟

کـاردۆ: ئـەی بـۆ نـا بـەس بـە سـلوکەت بـە دڵنیـایی یـەوە ، بـەڵام جیـاوازیش هەیـە لـەنێوان ئـەو کەسـەی خـۆی ناخواتـەوە لەگـەڵ ئەو کەسەی نایەڵن بخواتەوە .

جوانرۆ : ئەی هیچ کاتێك پەشیمانیت چەشتووە لە ژیانتا ؟

بیـرم کـردەوە بـزانم ئایـا پەشـیمانیم چەشـتوە ؟ یـان ئـازارم چەشـتوە .

کـاردۆ : نـا پەشـیمانیم نەچەشـتووە قـەت چونکـە ئـەو شـتەی هەڵـە بوبێـت لـە دەسـەڵاَتی خـۆم نـەبووبێ پێویسـتی نـەکردووە پەشـیمان بـم لـێ ی ئەوەشـی مـن هەڵـە بـوبێتم لـە کردنـی ئـەوا هـەوڵم داوە هەڵەکـەم چارەسـەر کـەم وە یـان داوای لێبـوردنم کـردووە بـەڵام بـە دڵنیـایی لـە ئاسـت هەڵـەکانم بەرامبـەر خـەڵکانێك کـە ناسـیومن زۆر زۆر ئـازارم چەشـتووە تەنانـەت ئێسـتاش ئـازارم ئـەدات ، بـەڵام پەشـیمانی گـەر ووشـە بێـت هـیچ مانایـەکی نـی یـە ئەگـەر هەڵـەکان ئـازار نـەدەن و درك بـەو هەڵەیـە نەکـەیت سـوودی نـی یـە پەشـیمانی ، چونکـە مـرۆڤ بـە پێگەیشـتنی ئـازار ئیتـر ئـەوە

دووبـــارە ناکاتـــەوە وەك مناڵێـــك دەســـتی بـــە زۆپـــا ئەســـوتێ و ئازاری ئەدات بە دڵنیایی جارێکی کە دووبارەی ناکاتەوە .

جوانرۆ : وەڵا من زۆر جار دووبارەی دەکەمەوە .

کـاردۆ : لـێم ببـورە کـە وا ئـەڵێم کەواتـە تـۆ یـان کـەم مێشـکی یـان چەتوونێکی بێ باکی .

جـــوانرۆ : راســـتیەکەی مـــن چـــەتونیم زۆرە هـــەر ئەمـــەش وای لێکـــردووم زوو زوو توشـــی سەرکێشـــی بـــبم ، گرنـــگ هـــەموو جـــارێ لێـــی دەردەچـــم ، کـــورە گـــوێ مەیـــەرێ بـــەس ســـەر سەلامەت بێت .

کـاردۆ : باشـە جـوانرۆ تـۆ چیـت ئـەوێت لـە ژیـان لـە خـۆت لـە خەڵك ؟

جوانرۆ : من . پارە و دەسەڵات ، ئافرت ، گەران .

کـــاردۆ : بـــۆ ئەمانـــەت ئـــەوێت ؟ (پـــێ ئـــەچوو پرســـیارەکەم لـــە شـــوێنی خـــۆی نـــەبووبێ چونکـــە ئـــەو بـــە روویـــەکی زۆر ســـادەوە ســـەیری ژیـــان ئـــەکات هەمیشـــە بـــە ئاســـانی بابەتـــەکان وەرەگـــرێ ) باشە چیت لە مانە ئەوێت ؟

جـوانرۆ : تـامم ئـەوێت  تـام ، ئەمـەوێت تامیـان بکـەم تێـربم لێیـان ، تیایاندا بژیم ، ئیتر ئەمە حەزە حەز .

کاردۆ : راستەکەی جوانرۆ هەر کەسەو حەزێکی هەیە .

جـوانرۆ : بـرام تـۆ ئێسـتا ژیانـت خۆشـە ئـاوا رازیـت گلـەییت نـی یـە لـە ژیانـت  ؟ بـروا ناکـەم کـەس هـەبێت رازی بێـت لـە ژیـانی بروامو‌ا نی یە مرۆڤ هەبێت بە سادەیی سەیری ژیان بکات .

کـاردۆ : جـوانرۆ گیـان ژیـان بـۆ کەسـێ خۆشـە کـە ئاواتـەکانی بێتـە دی ، خەونـەکانی ووشـك نـەبێ لـە ناخیـا لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە ئێسـتادا ئـەبێ بـژین. کـاتێ عیشـق دەکـەین، تـەنها عاشـق بـین. کـاتێ قسـە لەگـەڵ کەسـێک دەکـەین تـەنها قسـە بکـەین. کـاتێ تەماشـای گوڵێـک دەکـەین، تـەنها تەماشـا بکـەین. جـوانی لـە سـاتەکاندا بدۆزینـەوە. ئەمـە زۆر گرنگـە بـۆ مـرۆڤ بـا بزانـی قوربان .

جـوانرۆ : بـەڵام تـۆ ئەتـەوێت ژیـان هـەمووی بـە عاقڵانـە بـەرێوە بروات ئەمەش ئەستەمە .

کــاردۆ : نــا جــوانرۆ هەنــدێك شــێتیش پێویســتە لــە ژیانــدا هــەبێت دەنــا ژیــان زۆر بــێ تــام دەبــێ وە بــە تــەنها بــە عــەقڵ نــاڕوات بەڕێوە ئێستا پێویستمان بە کۆمەڵێک مرۆڤی شێتە !

سەیر کە عاقڵەکان چیان بەسەر هێناوین .

جــوانرۆ : کــورە بــەخوا مــن ئەونــە تێگەیشــتووم لــە ژیــان کــە ڕەنگــە ژیــان ئــەو جەژنــە نــەبێت ، کــە ئــارەزووی دەکــەی بــەڵام کاتێک بانگێهشت کراوی ... تا دەتوانی بخۆ و سەما بکە .

کاردۆ : ئافەرم تێگەیشتنەکەت جوانە ، دەست خۆش .

جـوانرۆ : کـورە دەسـتی تـۆ خـۆش بێـت بـۆ ئـەم قـازە بەلەزەتـە مـن تەواو تێر بووم .

کاردۆ : دە با چاکە لێ بنێم بیخۆینەوە .

جــوانرۆ: نــا نــا وەرە چاکــە لەســەر منــە ئــەچین بــۆ چایخانــەی سەرەوە .

کــاردۆ : هەرچەنــە بارانــە بــەڵام پیاســە و گــەڕان بــە بارانــەوە جوانە با ئەمشەو شەوی بەدیهاتنی ئاواتەکانی تۆ بێت .

جوانرۆ : ئەزانی کاردۆ ژیان سەیری بەسەر هاتووە .

کـــاردۆ : ســـەیرکە جـــوانرۆ ئێمـــە هـــەمومان ئێســـتا رەنگمـــان نـــەماوە لـــە فلْچەکانمانـــدا بۆیـــە تابلۆکانمـــان هەمیشـــە رەش و ســـپی یـــە ، هـــەموو جوانیـــەکانمان لـــەدوای حـــەزەکانمان فرێـــدا . خـــەون نـــاو چاوەکانمـــانی جێهشـــت ، پێکـــەنین و خەنـــدەمان لـــە خۆمـــان زیـــز کـــرد، ووشـــك بوینـــەوە تـــەرای عەشـــق لـــە نـــاو رۆحمـــان نـــەما .. بـــووین بـــە مقەســـت و بـــەرد و دەرگـــا و دیـــوار .. ئێســـتا ئـــەوەی پێکانمـــــان هەلـــــدەگرێ و گوزەرمـــــان پـــــی دەکـــــات بـــــەم کوچـــــە تاریکانـــەدا ، حـــەز نـــی یـــە خۆشەویســـتی نـــی یـــە عەشـــق نیـــە.. بـــەڵکو رقـــە .. چاولێکردنـــە ، لاســـایی کردنەوەیـــە بـــۆ مێشـــکی یـــە ... ئـــەوەی لـــە نـــاو جانتاکانماندایـــە وێنـــەی قـــات و عەزیـــە گـــران بـــەهاکانی ئـــەوی تـــرە .. وێنـــەی فـــێلا پـــر خوێنەکانـــە ...تەنانـــەت یـــەك دەستکیشـــی رەنگینـــی خۆمـــان نیـــە ... ئـــەو کۆلانانـــەی یـــاری منـــدالْیمان تیـــدا دەکـــرد هـــەموویمان تێکـــدا و تەنانـــەت وێنـــەی دووکانـــە کۆنەکـــەی بســـکیتمان لـــی دەکـــری دڕانمـــان .. هیچـــی ئەوســـامان نـــەما تەنانـــەت خۆشـــمان ...ئیســـتا کـــە بـــاران دەبـــارێ را دەکـــەین بـــۆی تـــەر نـــەبین .. کـــە بـــەفر دەبارێـــت .. خۆمـــان دەشـــارینەوە تـــا لـــە و ســـپیایەدا نـــاخی خۆمـــان نـــەبینین و لـــە خۆمـــان

نەترسـین ..کەسـمان نـەماوە دەنکـێ گـەنم بـە کـۆتری بـدات .. چڵـێ کـەوەر بکـات بـە دەمـی مەڕێکـەوە .. ئـەوەتا کـە پێکـەوە پیاسـە ئەکـەین هـەموو جـار یـەکتر ئەناسـین و یـەکمان بیـر دەچیتـەوە .. وێنـــەمان وەك ئاژەڵـــە کـــانی لێهـــاتووە .. یـــەکێ گـــورگ و یـــەکێ ســـەگ و یـــەکێ رێـــوی و یەکێکیشـــمان وەك مـــەرە ... هـــەموو یـەکێکمان هـەزار عـەبا ئـەدەین بـە سـەرمانا خۆمـان و نهینـی و منـــاڵی و پـــاکی و جـــوانی یـــەکانمان ئەشـــارینەوە .. لـــەوی دی ئەترســـین .. تـــا رۆژی وامـــان لـــی دێ هـــیچ کامـــان ئـــەوی تـــر نانانسێ

شـتێك کە بێـزارم ئەکـات ئەوەیە، مـرۆڤ بەو هەمـوو ناشـرینییەی خـۆیەوە چـۆن ڕوی دێـت لـوت بەرزبێـت، کەسـەرچاوەی هەمـوو بەدبەختـــی و نەهامەتییەکـــانە......مـــن تێناگـــەم چـــۆن مـــرۆڤ ئەتوانێت بەو هێندە بێ دەماغ بێت .

جـــوانرۆ : هەرچەنـــدە نیـــوەی تـــێ نەگەیشـــتم بـــەڵام روون کردنەوەکەت جوان بوو دەست خۆش .

كــاردۆ :دە تــۆ  وەرە بــا بچینــە چایخەنەكــەوە بــە پەلــە لــەوێ دانیشـین بـاران تـەواو تـەری كـردین ، بـا بچینـە ژوورەوە چاكـەمان بخۆینەوە .

لەگـەڵ جـوانرۆ چـا كـەمان بـە بـێ دەنگـی خـواردەوە لەوەئـەچوو ووشەمان بۆ ئەو شەوە پێ نەما بێ .

جـوانرۆ : كـاردۆ گیـان مـن ئیتـر ئـەبێ برۆمـەوە تاقـەتی بۆڵـە بـۆڵی ماڵەوەم نی یە ئەمشەو تێر ئەنووم بە خۆشی قازە گوڵینەوە .

كاردۆ: باشە كاكە گیان هیوادارم گلەییت نەبێ لێمان .

جـوانرۆ : گـورە گلـەیی چـی بەشـەرەفم تـۆ لـە بـاوكم پیـاوتری ( بـە پێكەنینەوە )..

كاردۆ : نا كاكە ئەوە چی یە ، عافیت بێت .

ئــەو رۆیشــت و منــیش وەك هــەموو ســاتەكانی تــرم حــەزم لــە بیستنی دەنگی هێلین كرد ، بۆیە تەلەفونێكم بۆ كرد .

هێلــین : كــەمێ بۆســتە كــاردۆ گیــان كــارێكم هەیــە ئێســتا خــۆم تەلەفۆنت بۆ دەكەمەوە .

بە دەم چاوەڕێی هێلین بەروە ماڵەوە بەرێ کەوتم .

هێلـــین تیلـــی کـــردەوە ئـــەمزانی ئـــەویش لـــە مـــن پـــەرۆش تـــرەو زۆری پێ ناچێ .

هێلین : ئەلوو رۆحەکەم ، چۆنـێ ، ئەوە لە کوێیت ؟

کـــاردۆ : مـــن باشـــم بـــە قوربـــان ئـــەی تـــۆ باشـــی ، وەڵا مـــن لـــە دەرەوەم .

هێلین : بەم سەرما و بارانە ، چی دەکەی لە دەرەوە ؟

کـاردۆ : کـە لەگـەڵ تۆنـەبم ، بـاران خەمـەکانم لـێ دەتکێنـێ...ئـەم بارانــە نــم نــم پیــانۆ لــێ ئــەدا بــە نــەرمی دڵــم ئــەنوێنێ وورد وورد ختوکــەی روومــەتم ئــەدا هێــدی هێــدی چــاو بــرۆ پەنجــەکانم تــەر ئـەکا بـۆنی ئـەم بارانـە لـە بـۆنی یادگاریـەکانم ئـەچێ بـە هێمنــی رام ئەچڵـەکێنێ حـەزم لـێ یـە لەگـەڵ تـۆ ئـەم بارانـە تـەواو تـەواو تـەرم بکـــات تـــەواو بمخنکێنـــێ و و لـــە نـــاو تـــۆدا .. وونـــم کـــات ... دە تـــــۆش لەشـــــەوێك لـــــەم شـــــەوانەی زســـــتاندا...لەگـــــەڵ کڵـــــۆ بەفرەێکـدا...هـێمن هـێمن.... بـە چاومـا وەرە خـوارێ ....لەگـەڵ دەنکە ئەستێرەیەکدا وورده وورده ...بەسەر لێوما دا بباری .

هێلـین : وای کـاردۆ گیـان ووشــەکان سـریان کـردم نـازانم چـی بڵـێم کـە ئـە ستەمە بـەم هێنـدە لـە بیـرم بیـت و هێنـدەش بیـر بکـەم هێنـدە لەناوما بیت ...کە خۆم لە یاد کەم .

کــاردۆ : بەراســتی تــەواو پێویســتم بــە بینینتــە بــەیانی بــە دڵنیــای دەبێ یەك ببینین .

هێلـین : بـە دڵنیـایی منـیش پێویسـتم پێتـە کـاردۆ تـۆ دای مەخـەرەوە جارێ گوێ لەم گۆرانی یە بگرە .

دەنگــی گــۆرانی یەکــەی بــەرز کــردەوە ووشـــەکانی باســی ویســتی پێکــەوە ژیــان بــوو باســی مــاچێکی قــوڵ بــوو کــە تێیــدا بتوێیتــەوە منیش ئەمزانی کاتێک کەسێك

پێــت ئەڵــێ گــوێ لەم گــۆرانیە بگــرە. دڵنیابـــە ووشـــەکانی ئەو قسانەنکە ئەیەوێ پێتی بڵێت .

کـاردۆ : بەراسـتی گـۆرانی یـەکی هێمنـە و ووشـەکانی پـر هەسـتی مــنن ( ئــەوەی ووتــم درۆ نــەبوو بــەڵکو هــەمان ئــەو هەســتانەش لای من هەبوو ).

هێلـین : ده بـرۆرەوه ماڵــەوه بەســاقه بــا هـیلاك نــەبی و نــەخۆش نەكــەویت ئــەزانی كــاردۆ مــن ئێســتا لــه ترۆپكــی بەختەوەریــدام هــەر بۆیــه گــوێم لــه دەنگــی ترپــەی دڵــی چۆلەكــەكانی بــەر ژورەكـەی خۆمـه كـه قسـه لەگـەڵ تـۆ ئەكـەم كـه ئـەزانم تـۆم هـەیت .

كـاردۆ باشـه هێلـین گیـان ئێسـتا وا بـەرێوەم بـۆ ماڵـەوه كـەمێكی تـر ئەگەمە ماڵەوه .

بــەرەو مــاڵ چــووم و خــەیاڵم لای جــوانی یــەكانی هێلــین بــوو خــەیاڵم لای هەســتەجوانەكانی ئــەو بــوو چــوو بوومــه دنیــای خــەیاڵاتی ئــەوەوه ، بەراســتی بــەس نــی یــه خــەیاڵ هەیــه دەنــا حەقیقەت تەواو ئەیكوشتین ...

دیســان مــاڵ و تــەنیایی و بــێ دەنگــی و شــەو ئەمانــه هــاورێ ی هەمیشــه یــی یــەكانی مـنن كـه قـەت لێیـان بێـزار نـابم . بـەیانی دێـت و دەوام و دووبــارە بوونــەوەكان دەســت پــێ دەكاتــەوه ئــەو شــەوه و نـزام بـۆ خـودا تـەنها ئەمـه بـوو : خوایـه گیـان ئەگـەر لـه هـەموو كتێبــەكانتا لــه گوناحــه گەورەكانــدا درۆ و خیانــەت و رقــت دابنایــه لــەجێ ی كفــر و نــوێژ نــەكردن و بــەرۆژو نــەبوون .. ئــەوكات

تــەنها بەهەشــت دەبــوو ، چونکــە کــەس کــارێکی وای نــەدەکرد تــا پێویستت بە جەهەننەم بێت .

ماوەیــەك تێپــەری بەســەر ژیانمــدا هــەر هــەمان دووبــارەی یــەکانم ئەنوســـیەوە لـــە رۆژانەکانمـــدا تـــا رۆژێکیـــان بـــەرو دەوامـــەکم بەرێکـەوتم  کـە گەیشـتمە ژورەکـەم لـە دەوام شـتێکی سـەیرم بینـی کـە سـەیرم کـرد کـاك محمـود زۆر بێتاقـەت و بێـزار دیـار بـوو جیـا لـە رۆژانـی تـر بـوو تەنانـەت لـە پۆشـاك و پـێلاو بۆنەکەشـیدا ، چوومە لایەوە و ووتم .

کاردۆ : کاك محمود هەستەکەم بێتاقەتی زۆر خێرە چی بووە ؟

محمود : وەڵا بڵێم چی غێر ژن و سەگ و سەگبابیەکانی .

کاردۆ : بۆ چی بووە ئەی چی بە من ئەکرێت ؟

محمـود : وەڵای کـاردۆ گیـان واز نـاهێنن هـەر خـەریکی موشـکیلە دروســت کــردنن ئیتــر شــتەکان خەریکــە گــەورە دەبــن و لــە تەحەمولما نامێنێ جیا بینەوە بۆ هەردولا مان باشترە  .

کـاردۆ :کـاك محمـود گیـان خـۆی ژیـان هـەر کێشـەو گرفتـی  هەیـە ئیتــر ژیــانی هاوســەریش کێشــەی تــێ ئەکــەوێت بــەڵام ئــەوەش

بزانــه خــۆ کاتێــك نینۆکمـــان درێژدەبێــت ئــەو کــات  دەیقــرتێنین نـــەك پـەنجەکانمـــــان ببـــرین و برینـــداریان بکـــەین ، گرفتـــــه خێزانییـــــەکانیش بــه هــەمان شێــوەن ،ئـــەگەر گرفـت و ناکــۆکی یـــــه خێزانییـەکانمـــــان زیادیانکـــــرد پێویستـــــــه ، کۆتایـــــی بـــــه گرفت و ناکۆکییــەکان بهێنین نەك به پـەیوەندییـەکانمــان .

محمـود : ئـاخر بـرام خـۆ تـۆ لـەم وەزعـەی منـدا ناژیـت هەسـت بـه ئــازارو سەرئێشـــەکانی مــن ناکــەیت بابـــه وەڵا ئێمــه ســەرمان لـــه مناَڵاکـــانیش شـــێواندووه جیابوونـــەوەمان ئیســـراحەتی هەمووانـــه ئــێ بــه خــوا بــرام ژیــان زۆر لەوه کــورتتره ببیــته قوربــانی بــۆ کەسـێکی تـر . کـاردۆ بـەس کـاك محمـود کێشــه کـه ئەوەیـه تـۆ بەرپرسـیاری لــه ژیــانی ئـەو مناڵەنـەش کـه تـۆ هێناوتنەتــه دنیــاوه ئــاخر ئــەوان گوناحیــان چــی یــه تەحــەمولی بــێ عــەقڵی گــەورەکان بکەن .

محمـــود : راســـتەکەی کـــاردۆ بـــەڵام مـــرۆڤ رادەیـــەکی دیـــاری کراوی هەیه لە خۆ راگرتن .

ئـەم قسـانەی کـاك محمـود بۆیـە وا راسـتەوخۆ بـوو ئـەیزانی کـە ئـەو بـەدیل ی هەیـە مـرۆڤیش کـاتێ بـەدیلی هـەبێت ئیتـر گـوێ بەوانەی دوای خۆی نادا .

کـاردۆ : مـن وام پـێ باشـە هـەوڵ بـدەی کـە کێشـەکانت بـە لێـك تێگەیشـتن چارەسـەر بکـەیت ، ئیتـر خـۆ مـەرج نـی یـە ژیـانیش هەموو رەنگەکانی بدا بە تۆ .

لەو قسانەدا بووین کاك ئاری هاتە ژورەوە .

ئـاری : بـەیانیتان بـاش ، بەراسـتی ئـەم جـادەو بانـە هـەر بـە کـەڵکی هــاتوو چــۆ نــەماوە ، خــۆ تــا ئەگەیتــە ئێــرە ئــەبێ پــەنجا ئایەتولکورسـی بخـوێنی ، ئـاخر نـازانم ئـەم هـەموو پارەیـە ئـەخۆن وورگیــان ناتــەقێ ، بەوخوایــە ئــەم وڵاتــە هــەمووی گەندەڵــە بــە خۆشمەوە ئەمە چی یە ؟

بـاش بـوو ئـەم هاتنـە ژورەوەی ئـاری بابەتەکـەی گـۆری چونکـە بـە خـوا مـن بـروام بـەوە نـی یـە مـن نەسـیحەتی کەسـێك بکـەم خـۆی منـاڵی هـەبێت و لـە هـەمان کاتـدا شـتێکی نهێنـی هـەبێت هـەرچی قسەیەك بکەم وەك بڵقی سەر ئاو دەبێ .

محمـود : کـوره کـاك ئـاری ئێـره کاولەیــه ، ئیتـر بـۆ ئێمــەیان کــردووه بــه دۆزەخ و بــۆ خۆشــیان بەهەشــته ، وەڵا ئــەوەی ئێــره جێ دەهێڵێ رووی سوور ئەبێ .

ئـاری : جـا خـۆ دنیـا رۆیشـت کـاك محمـود وەڵا مـن لەشـم سـاغ بوایـه دەمـێ بـوو رۆشـتبووم ، نـازانم کـاك کـاردۆ چـی ئـەکا لێـره ئاخر بڵێ تۆ هیچ پەیوەستی یەك نی یه بۆ نارۆیت .

کـاردۆ : راسـتەکەی کـاك ئـاری ئێـره تـەواو بێکـەڵك بـووه ، کـاك محمـودیش راسـت ئـەکات کـه ئێـره کاولەیـه تەنانـەت ، مـن ئـەوه تێگەیشــتم لــەم وڵاتــەدا ئــەو کەســەی چــاوەڕێی ژیــانێکی باشــتر بکــات ئــەوه ئــەبێ فاتیحــه بــۆ عــەقلی دا بــات بــەڵام بــروا بکــەن رۆیشـتن بـۆ مـن سـوودی نـی یـه ، ئـەوه قورسـه کاکـه گیـان مـن ئـەوێم بینیـوه ژیـانی ئـەوێش وا ئاسـان نـی یـه بەتایبـەتی بـۆ ئیمـەی رۆژهـەڵاتی دواکـەوتوو پاشـان بـۆ رۆیشـتن هـێ،ده ئاسـانه ئـەی نـابینی بـەم رۆژگـاره چـی منـاڵ و ژن ئـەخنکێن لـه ئـاودا نـابینی چەنــــد کــــەس لــــه ســــەرما رەق بوونــــەوه چەنــــدەها ئــــافرەت پەلــەماردران لــه لایــەن قاچــاغچی و ۆێگرەکــان ئــەزانی چەنــد کــەس مــاڵی وێـران بـوو هــەموو شـتێکی فرۆشـت و ســەرەنجام

گێراشیانەوە هیچی بۆ نەمایەوە کاکە گیان خۆ تۆ خۆت هەموو ئەمانەت ئاگا لێ یە .

ئاری: کورە برام بۆ قورسە ئەو عالەمە رۆیشتوەو لەوێ بە مورتاحی ئەژی ، ئەتوانی پارەی باش بەیت و بە رێگایەکی باشدا برۆیت .

کاردۆ : جا تۆ چوزانی مورتاح ئەژی کاك ئاری ؟ پاشان خۆ هەموو کەسیش ئەو پارە چاکەی پێ نی یە خەڵك لە نەهامەتی و نەبوونیا ئەروات برام لە نەمانی دڵنیایی بە داهاتووی ئەم وڵاتە ئەروات لە ترسی بۆ دوا رۆژی منداڵەکانی . پاشان سەیرکە با بۆت روون کەمەوە ، من کەسێکی رۆژهەڵاتیم ، وابەستەم بە کۆمەڵی کولتووری رۆژهەڵاتی و دینی و کۆمەڵایەتی ، من بە شێوازێك پەروەردە بووم زۆر جیاوازە لەوەی ئەو وڵاتانەی تر ، من لە کۆمەڵگایەکی سۆزداری دوا کەوتوودام ، چۆن بتوان بچمە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوی عەقڵانی ئاخر ئەمە چۆن ئەبێ هەڵکەم لەوی ، ئەزانی خەڵکانی وڵاتی ئێمە لە ئەوروپا توشی دوو لایەنیەکی زۆر ناخۆش بوون ، من کچێکی پورم هەیە لەوێ یە ئەڵی کاکە کاردۆ من لەبەر ئەوەی چوومەتە ئەوێ و لەگەڵ ژیان و

یاسـایی ئەوانـدا راهـاتووم نـاتوانم بێمـەوە ئێـرەو لەگـەڵ خـەڵکی بـێ یاســایی ئێــرە نــاتوانم هەڵکــەم لەهــەمان کاتیشــدا لەگــەڵ کلتــوری ئەوێـدا نـاتوانم هەڵکـەم لەبـەر ئـەوەی مـن بـە کلتـوری ئێـرە گـەورە کــراوم تەنانــەت خێزانەکــەم رێگــەم نــادەن لــەو کلتــورە کــۆن و دینــەی ئێـرەم لا بـەم خۆشـم ئەمـەوێ ئـەو ژیانــەی ئـەوێ بـژیم کـە تێیـدا گـەورە بـووم مـن ئـەو کلتـورەی ئـەوانم ئـەوێت مـن لـەوێ ئـەژیم بـروا بکـە ئێمـە فـەوتاووین نـازانین کـام لا هـەڵبژیرین دوای ئـەوە سـەیری خێزانــە کوردەکــان بکــە کورەکانیــان دێنــەوە لێــرەوە ژن ئەبەنــەوەو کچەکانیشـیان دێنــەوە کـور دەبەنــەوە ئەمــە نیشـانەی ئەوەیـە ئـەوان لەگـەڵ ئـەو کومەڵگایـەدا نـاگونجێن ، دە بزانـە کـاك ئـاری خـۆ ژیـانی ئـەوروپا هـەر تەمـەڵی و سوشـیال و پاڵدانــەوە نـی یـە مـن و تـۆ بـەم عەقڵانەمانـەوە چـۆن ئـەتوانین قبـوڵی کـەین لــەوێ کچەکــەمان لــە تەمــەنی ســیانزە ســاڵیدا هــاورێ ی کــوری هـەبێت و ئێمـەش ئاهـەنگی بـە هـۆی نـەمانی کچێتـی بـۆ بگێـرین ئـەی چـۆن ئـەتوانین لـەوێ بـژین کـە پێچەوانـەی رەفتـارو هەڵسـو کــەوتی ئــەوان رەفتــار کــەین ئێمەیــەك لەوپــەری دواکــەوتووی فکـری و پیشەسـازی چـۆن ئـەتوانین بگـونجێین لەگـەڵ ئـەو فکـرو پێشـکەوتنەی ئەوانـدا، بۆیـە هـەر چۆنێ بێـت بـۆ ئێمـە ومانـان ئێـرە کـــەمێ باشـــترە راســـتە وڵاتەکـــە کاولـــە بـــەڵام ئیتـــر ئـــەوە

ناوچەوانەکـــەی ئێمەیـــە و ئـــەوەش بزانـــە زۆری شـــتەکان دروســـت کـراوی دەسـتی میللەتەکـە خۆیـەتی ئـەی کـە مـن پـێم ئـەوتن مـەچن بـۆ دەنــگ دان و پەنجــەی خۆتــان پــیس مەکــەن ئەمانــە هیچیــان شــایەنی ئــەو نــین بــرواو متمانــەیان بــدەیتێ ئێــوە گاڵتــەتان پــێ ئـەکردم ئـەتانووت تـۆ هەسـتی نیشـتیمان پـەروەری لـە ناختـا نـی یـە تــۆ کەســێکی بــێ هەڵوێســتی ئــەوتا بینیتــان جــاران یــەك دکتــاتور هــەبوو ئێســتا بــە ســەدەها دیکتاتۆرمــان دروســت کــردووە بــە دەستی خۆمان.

ئـاری : کـورە وەڵا مـن ئـەو ئینزیلاقـەم چـاك بێتـەو یەکسـەر چـوار دەفتـەر ئـەدەم و بـە رەسـمی ئـەرۆم بـۆ ئـەوروپا مـن تاقـەتم نـی یـە لەم کاولەدا دانیشم .

کـاردۆ : جـا خـۆ لـەوێ بـە چـل سـاڵ چـوار دەفتـەر کـۆ ناکەیتـەوە ، دەی خێــری پێــوە بێــت ئیشــەڵا خــوا بــۆت ئاســان بکــات و بــە چەقەنەیەك بگەیتە خۆشبەختی یەکانی ئەوێ .

گـێلاس خـان خـۆی کـرد بـە ژوردا و پـێ ئـەچوو ئەسـڵەن ئـەو ئــەمرۆ لەوپــەری کــەیف و تەرەفــدا بێــت جیــا لــە رۆژان بــە تەوســەوە ووتــی بــەیانیتان بــاش ، کــاك محمــودیش ئــەوت ئــاوی

قازیـان داوە لەبـەر سـمێڵی بـە پێکەنینـەوە ووتـی ئـەك یـاخوا بـەخێر بێـت ، ئەسـڵەن ئـەتووت هـیچ کێشـەیەکی نـی یـە لـە ماڵـەوە مـن تێناگـام باشـە ئـەو تێگەیشـتن و تـەنازول و پێکەنینانـەی ئـەم دووانـە بـۆ یـەکی ئەکـەن لـەدەرەوەی خێزانەکـەی خۆیـان بـۆ لەگـەڵ هاوسـەرەکانی خۆیانـدا هـەوڵی ئـەوە نـادەن تـا بتـوانن تێگەیشـتن دروسـت بکـەن لـە نێوانیانـدا کـەچی بـۆ دەرەوە دوو جـۆر دەم وچـاوی جیـان وەك لـە ئـەوەی ماڵـەوە نـازانم ئـاخۆ ئەمـەی دەرەوە دەمامکـە یـان ئـەوەی ماڵـەوە دەمامکـە ، لـە سەرێکیشـەوە ئـەو ئـاو هەوایـەی ماڵـەوە کـە هاوسـەرەکانانیان دروسـتی دەکـات رێگـە نـادات ئـەمانیش لـە کەلـەرەقی خۆیـان بێنـە خـوارەوە بـەخوا هـەر ئەوەیـە کـەی پیـاو وازی لـە لـوت بـەرزی و ئـافرەتیش واز لـە کەلـەرەقی خـۆی بێنێـت ژیـان بەختـەوەریان پـێ ئەبەخشـێت پێکەوە و هەموو کێشەکانیش چارەسەر دەبن .

پیاوێـك هـەبوو لـە دائیرەکـەمان ناسـراوو بـوو بـە بـەرتیل خـواردن نـاوی رەزا بـوو پێیـان ئـەوت رەزای پـارە هاتـە لام و هاتـە تەنیشـت گوێچکەمـەوە شـتێکی پـێ ووتـم ، منـیش ووتـم ببـورە بـەخوا نـاتوانم زۆر سوپاسـی تـۆش و ئـەویش ئەکـەم بـە نـا بـەدڵی چـووە دەرەوە ، گـێلاس خـان وەك پیشـەی هەمیشـەی خێـرا خـۆی

خستە مەنجەڵەکەوەو ووتی : کاك کاردۆ ئەوە رەزا ی پارە بۆچی هاتبوو بۆ لات ؟ توخوا چی ئەویست ؟ ئەو بەرتیل خۆرە .

کاردۆ : (بە پێکەنینەوە ) وەڵا هەر بۆ بابەتی ناوەکەی خۆی هاتبوو.

گیلاس : ناوی خۆی چی ؟

کاردۆ : ئەوەی ئێستا خۆت پێت ووت ،قابیلە پیاوی وا بۆ چ ئیشێك بێت ، هاتبوو ئیشی کەسێکی نا یاسایی یە ئەیەوێت من بۆی بکەم و ئەویش دیاری یەکم بۆ بێنێ ، ئێ منیش قبوڵم نەکرد ، ئیتر ملی شکان و رۆیشت .

ئاری : باشە کاك کاردۆ خۆ تۆ بروات بە حەڵاڵ و حەرام نی یە ئەی بۆ ئەو دیاری یان ئەو بەرتیلە وەر ناگریت بۆ تۆ چی فەرق ئەکات خۆ تۆ دین نی یە تا تاوانبار بکات بە گوناحەکردن و پاشان بچیتە جەهەنەمەوە ئیتر لە چی ئەترسی خۆ ناشێ بە تەمایی بەهشتێك بیت کە بروات پێ ی نی یە ؟

كــاردۆ :راســتەكەیت مــن دیــنم نــی یــە وە بڕواشــم بــەو خورافاتانــە نــی یــە ، بــەڵام كــاك ئــاری مــن ڕەوشــتم هەیــە عــەقڵم هەیــە ویــژدانم هەیــە ، ئــەزانم كــە ئــەوە دیــاریش نــی یــە ئــەوە بەرتیلــە وە ئــەزانم كــە ئــەوو كــارەی ئــەو پیــاوە داوای ئــە كــات نایاســایی یــە ، بــە دڵنیــایی زەرەری دەبــێ جــا یــان بــۆ تــاك یــان بــۆ كومــەڵگا بێــت ، ئــەم پیــاوە ئەیــەوێت مــن ئیمــزای مــن لــە ســەر ڕەزامەنــدی دان بــە دانــانی ریكلامێكــی بــۆ بكــەم لەســـەر شــەقامی چــل مــەتری لـــە شـــوێنی پەرینـــەوە ، ئـــەزانی ئەمـــە چەندێكـــە شـــتێكی خەتـــەرە ، ئەگــەر بێــت و لــەو شــوێنەدا ئــەو ریكلامــە دابنــێ بــۆی هەیــە كــاتێ كەســـێ ئەپەڕێتـــەوە ســـەیارەیەك لێـــی بـــدات و بیكـــوژێ لەبـــەر ئـــەوەی ســـایەقی شـــوفێرەكە بـــە هـــۆی ئـــەم ریكلامـــەوە پیادەكـــە نــایبینێ بــە واتــا ئــەم ژیــانی خەڵكــە ئیتــر ئەمــە پەیوەنــدی نــی یــە بــە دین و یاساوە ئەمە ڕەوشت و ویژدانە .

دوای ئــەوە مــن ڕەوشــتم ڕێگــام پــێ نــادات ئــەو شــتانە بكــەم مــن نامــەوێ ئــازارم هــەبێت بــۆ كــەس دەنــا نــاتوانم شــەو ســەر بكەمــە ســەر ســەرین ، ئــەزانی كــاك ئــاری نیــوەی بەختــەوەری ئەوەیــە كــە شـــەو ســـەرت كـــردە ســـەر ســـەرین مێشـــكت ســـاف بێـــت و ئـــارام

بنــووی ئــازار بــۆ کــەس نــەبووبێ و نەتهێشــتبێ کەســیش ئــازارت بدات .

گـێلاس : کـوره وەڵا راسـت ئەکـەیت بـەس بـەخوا دەرونــی ئـارام نــەماوه لــەم رۆژەیــا ئیتــر بڵێــین چــی بەهــەر حــاڵ ئینســان ئــەبێ پارێزگاری لە سومعەو ناوی خۆشی بکات .

لــەم قســانەدا بــوین و نــارێ هاتــە ژورەوە ، بــە هێواشــی ووتــی بەیانیتان باش .

نــارێ : کــاك کــاردۆ ببــوره بــە ئــەرك نــەبێ ئەگــەر کاتــت هــەبێ ئەمــەوێ دوو قســە بکــەین ئێشــێکمان پێتــە لــە ژوری خۆمــان کتابێکمان لایە پەیوەندی بە تۆوه هەیه .

منــیش لام ســەیر بــوو مــن هــیچ شــتێکم نــەبوو پەیوەنــدی بــە بەشەکەی ئەوانەوه هەبێ .

کاردۆ : فەرموز نارێ خان ؟ ئەمرکه .

نــارێ : تــەواو دڵ تــەنگم کــاردۆ ، تــەواو بیتاقــەتم نــازانم چــی بکــەم هەست بە دڵتەنگی یەکی زۆر دەکەم ؟

کــاردۆ : چــی بــووە خێــرە بــۆ وات لێهــاتووە تکایــە پــێم بڵــێ ؟ (راســتی زۆر شــڵەژا بــوو هــەر بــە ســەیرکردنی هەســتت بــە ماندوێتی و بێتاقەتی ئەکرد لە روخساریا)

نــاریێ : نــازانم مــن ئــەو هــەموو خۆشەویســتی یــە ئــەدەم بــە یادگــار ( ئــەم نــاوە هاوســەری نــاریێ بــوو ) بــەڵام نــازانم لەگــەڵ ئــەوەش ئــەو زیــاتر پــارەو موڵــك ســەرەوەت و ســامانی ئــەوێت هەمیشــە بــە دوای ئەوانــەدا را ئــەکا مــن تێناگــەم ئــەو ئــەڵێت خۆشــم ئــەوێت بەس من هەستی پێناکەم .

کـــاردۆ : نـــاریێ خۆشەیســـتی بـــە کـــارو کـــردەوەی مرۆڤـــدا دەردەکــەوێت بــە قســە نابێــت تــۆ هەســت ناکــەیت ئــەو کردەوەکــانی لەبــەر مەبەســتی خۆشەویســتی تــۆ بێــت ؟ بــە واتــا هەڵبــەت ئــەو بــۆ ئێوە وا ماندووەو خەریکی پارە پەیدا کردنە .

نــاریێ : نــا هەســتەکەم ئــەو شــتێکی تــری ئــەوێت ، هــەموو کــاتێکی بــۆ پــارە پەیــدا کردنــە نــازانم مــن وام لێهــاتووە هەســت بــە بــوونی ناکــەم ، مــن بێــزار بــووم لــە پــارە هــەموو ژیــانی تێکــداوین ، ئــەو پارەی زۆر لە من زیاتر خۆش ئەوێ .

نــازانم مــن چەنــد رۆژی لەمــەو پــێش قســەم لەگــەڵ ئــەم کــرد بــەم شـــێوەیە نـــەبوو یـــان مـــرۆڤ جادوگـــەرێکی شـــارەزایە لـــە شـــاردنەوەی ئازارەکـــانی خۆیـــدا و لـــە تەمســـیل کردنـــدا هـــەر ئــەوەش هەمیشــە مــرۆڤ دوو بونــەوەرە لــە نــاو یــەك پێســت دا ئــەوەی دەرەوە زۆری جیایــە لــەوەی نــاوەوە ، بــەڵام زیرەکــی بــە کارهێنــانی دەمامکــەکان وات لــێ ئەکــەن دوانــەی هــیچ کەســت لــە یەك بۆ جیا نەکرێتەوە.

کــاردۆ : مــن نــازانم چیــت پــێ بڵــێم بــەڵام پــێم باشــە کــەمێ لەســەر خــۆ بیــت ژیــانی هاوســەری کێشــەو هەڵــە تێگەیشــتنی ئــەبێت بــە دڵنیــایی یــەوە ، ئێــوەش لــە ســەرەتاکانی ژیانتــانن ســەیرکە مــرۆڤ وەك بــەرد ســەیر بکــە کــە قەراغــەکانی تیــژ بێــت کاتێــك ئــەم دوو بــەردە بــە یەکــدا ئــەدەن بــە دڵنیــایی لــە ســەرەتاوە یــەك برینــدار دەکــەن تــا ووردە ووردە ئــەو تیژیانــە ئــەخورێت و ســاف ئــەبێت و دوو بەردەمــە ئەچنــە پــاڵ یــەکترەوە ئــەوە کــات تــەواو ئــەگونجێن بــۆ یــەك ، تــۆش ئــەبێت لــە ســەرەتاوە کــەمێ لــە ســەر خــۆ هــێمن بیت تا تەواو یەك ئەناسن.

نـاریَ : ئـاخر مـن بۆیـه وا بیتاقـەت بـووم بـەوه خۆشـم نـازانم خـۆ مـن یادگـارم خۆشـەوێت بـەڵام نـازانم ئـەو بـۆ وای لـێ هـاتووه لەگەڵم.

تێگەیشـــتن لـــه خۆشەویســـتی ســـێ بەشـــی خۆشەویســـتی یەکـــه خۆیـەتی ، مـن ئـەزانم کـه ئـەم کـاتی خـۆی ئـەم کـوره هاتـه لای ووتـی خۆشـم ئـەوێیت نـارێش ووتبـوی مـن ئـەو شـتانه نـازانم ئەگـــەر بێیتـــه داوام ئـــەو کـــات رازی ئـــەبم ،ئـــەم نـــاریَ یـــه خۆشەویستی یەکـەی بەستۆتەوه بـه زەواج کردنـی بـه واتـا ئەگـەر یادگـار ئامـاده نەبوایـه بێتـه داوای ئـەویش نـەی ئـەتوانی خۆشـی بوێـت ئەمـه تێگەیشـتنی ئـەم و یادگـاره بـۆ خۆشەویسـتی ئەمـه ئەگـەر لـه دینـدا بوایـه پێیـان ئـەوت کـوفری خۆشەویسـتی ، ئـاخر چـۆن دوو مـرۆڤ ئـاوا یـەکیان خـۆش ئـەوێت تەنانـەت ئەگـەر یادگـار کەسـێکی دەوڵەمەنـد و کەشـخه نەبوایـه نـاری خۆشـی ناویسـت بـه دڵنیـایی ، هـەر بۆیـه ئـەویش ئـەزانێ کـه ئـەم پـارەو ئـاڵتون و جلـی جـوانی ئـەوێت هەمیشـه هـەوڵی پەیـداکردنی ئەوانـه ئەدا تا خۆشەویستی یەکەی نەپچرێت .

کـاردۆ : نـاریَ تـۆ بزانـه یادگـار چـی دەوێـت بـا ئـەویش لـه ویسـتەکانی تـۆ تێبگـا ئـەو کـات تێگەیشـتنی شـتەکان لای یـەکتر

ئاسان دەبێت ، بەڵام تۆ خۆت بینیوە چەن قەڵەو بوویت و قژ و خۆ گۆرینت تێك چووە هیچت وەك جاران نەماوە ( ئاخر كاتی خۆی یادگاریش ئەمی لەبەر جوانی و رێكی باڵای و جلە جوانەكانی خۆش ویست دەنا یەك سەرە واو لە سكی ناریێ دا نی یە لەسەر خۆشەویستی و ژیانی هاوسەری ) هەوڵبدە وەك جاران لێبێتەوە ئەو كات بە دڵنیایی خۆشەویستی یەكەت بۆ دەگەرێتەوە .

ناریێ : چی بكەم بەخوا ئەمەنە هیلاكم بە ئیشی رۆژانەوە فریایی هیچ ناكەوم بەس هەوڵ ئەدەم بەڵام تكایە با كەس ئەم بابەتە نەزانیێ.

من ئەمزانی رۆژێك ئەم دۆخەی ئێستایی ناریێ ئەبینم بەڵام شتەكە درەنگ و زوو كەوتبوو چونكە لوتبەرزی ئەو لە ئاست دان نەنان بە حاڵی نەبوونی لە ژیان تێنەگەیشتنی لە خۆی و دەوروبەرەكەی زۆر بوو، بۆیە ژیانیش تۆڵەی ئەو تێنەگەیشتنەی لیێ دەكاتەوە ، هەروەها ر هۆكارێكی تریش هەیە ، ئەم حاڵەتەی ناریێ ئەوەیە كە زۆرێك لە پیاوەكان عاشقی جوانی ئافرەتان دەبن شەیدایی روخسارو دەرەوەیان دەبن ، وە زۆرێك لە ئافرەتانیش عاشقی قسەی پیاوان دەبن

ئــەوان دەیانــەوێت هــەموو جوانیــەکانی پیــاو ببیســتن ئەیانــەوێت ئــەوەیان پــێ بــووترێ کــە خۆیــان ئەیانــەوێت گوێیــان لــێ بێــت ..!هەر بـۆیە ئافرەتـان میکیـاژ دەکـەن تـا روخسـاری راسـتەقینەی خۆیــان بشــارنەوە روخســاریان روپۆشــی درۆ بکــەن و پیــاوانیش زمانیــان بــە هــەموو ووشــە درۆینــەکان بــەکار دێــنن و تــەواو درۆزن ئـەبن ..!هەشـیانە عاشـقی پـارەی پیـاو ئـەبن هـەر بۆیـە پیــاوان هــەموو ژیانیــان بــۆ پەیــدا کــردن پــارە تــەرخان دەکــەن دەزانــن ئــەو ژنــە جوانانــەی کــە ئــەمان جوانیــەکانیان دەوێــت ئــەو ژنانــــەش پارەیــــان دەوێ کــــاتێ تــــێ ئەگــــەن پــــارە خەونــــەکانیان ناهێنێتــە دی ئــەوجا بــە دوای خۆیانــدا ئەگــەرێن . ئــەم دۆخــەی ئێسـتا نـارێ تـێ کـەوتوەە دۆخێکـی ئاسـایی یـە هەرچەنـدە مـن لـە دڵـەوە پـێم نـاخۆش بـوو بـەڵام هەسـتم ئـە کـرد مـن تـەنها مەمەیـەکی ژێــر کــەرەوەم و هیچــی تــر ، بــەڵام کارەکــەی مێردەکــەی ئاســانترە لــەوەی خــۆی چونکــە مێردەکــەی ئــەوەی لەســەرە بــە بــەردەوامی پـارە پەیـدا بکـات تـا لیڤڵـی خۆشەویسـتی یەکـە وەك خـۆی بهێڵێتـەوە ، بــەڵام ئــەی نــارێ چــی دەکــات تــا ئــەو جــوانی یــەی بهێڵێتــەوە تــا لیڤڵەکــەی ئــەم دانەبــەزێت و خۆشەویســتی یەکــەی کــەم نــەکا ئەمــەیان ئەســتەمە زۆر لەبــەر ئــەوەی جــوانی تــا ســەر بــۆ کــەس نامێنێ .

کــــاردۆ : نـــــاریێ ژیـــان خەونیشـــی هەیـــە و حەقیقەتیشـــی هەیـــە ئـــەتوانی کـــەمێ لـــە خەونـــەکانتا و کـــەمێکیش لـــە حەقیقەتەکانـــدا بژیــت بــە خــوا بروابکــە خــەیاڵ نەبوایــە حەقیقــەت ئەیکوشــتین ، هــەوڵ بــدە ئــەم ماوەیــە زیــاتر بنــوو تــا مێشــك ئــارام ئەبێتــەوە زۆر جار نووستن خۆ شاردنەوەیە لە ئازارەکانی ژیان .

نــاریێ : وای لــێ ئەکــەم ببــورە توخــوا ســەرم ئێشــانی خۆزگــەم بــە خــۆت دووری لـــەم دۆخانـــە ئەمـــەوێت ئـــەم خەمانـــەم بشـــارمەوە کــەس نــەزانێ بــەس نــاتوانم نــازانم چــی بکــەم بــە قســەی مــن ئەکەیت قەت ژن مەهێنە بروا بکە هەر ئاوا سەرت سووکە .

کــاردۆ : هــاوریێ تــۆ گــەر بتــەوێ خەمــەکان بشــاریتەوە ئــەبێ بــە چاوو داخراوی برۆی ئەوەش ئەستەمە ....

ئەو رۆیشت بەڵام ئەو نازانێ .

ئــەو ئاگــاداری هــەموو چیرۆکــە ســەیرو ســەمەرەکانی دڵــم نــەبووە چونکــە قــەت نەچۆتــە چاوەکانمــەوە نــازانێ ئــەوەی بەســەر مــن دا هــاتووە کــەس نــی یــە بتــوانێ بەرگــەی بگــرێ نــازانێ مــن چــەنێك لــەت لــەت بــووم و خــۆم پێکــەوە نایــەوە و لــەتیان کردمــەو ، ئــەو مێــژوە شــاراوەی مــن هەمــە مــرۆڤ لــەت لــەت ئــەکا ئــای لــەو

میـژوه جوانــەی شــارا ئــای لــە ئــازاره بــەجێماوەکانی ئــای لــە تــامی ماچــە ئەفســوونایەکانی ئــای لــە نیگــا ســیحراوی یــەکانی ئــای لــە عەشـقی رۆحــی ئــەو بــەڵام حــەیف کــە مــەرگی ئــەو عەشـقە زۆر زوو بــوو ، مــن نــازانم بــۆ ئەوەنــده ئاســانه لــەم وڵاتــە کەســی لەســەردزی زینـدان بکـرێ کـەچی کـەس لەسـەر کوشـتنی عەشـقێ زیندان ناکرێ کەسیش تاوانبار ناکرێ

بـەڵی شــارا ئــەو خۆشەویسـتی یـە پـر میهـر و سـۆزه بـوو کـە لـە ناخمـدا هەڵـدەقوڵا ئـەو کـانی عەشـقە بـوو هەمیشـە خـورەی دەهـات لــە مێشـکمدا ، کـارێزی خۆشەویسـتی بـو لــە قوڵــەیی یــەکانی دڵمـدا ، رووبــاری ئــەوین بــوو ، دەریایــەك لــە سـۆز بــوو ، مێـژوو بــوو مێـژوو ، ئــەو مێـژوەی کــە ئێسـتاش رقـم لــە خوێندنەوەیــەتی . مـن ئێســتاش تــا بــزانم ئــەو لـــە کــوێ یـــە جوگرافیــام خــۆش ئـــەوێ ئەمــەوێ بــزانم لـــە چ مەملەکەتێکــە چــۆن ئــەژی چــی ئــەکا مــن مێژوەکەیم ناوێ بەڵکو جوگرافیاکەیم ئەوێت .

ســەیرترین داواکردنــی خۆشەویســتی بــوو ، ئێســتاش لــە بیرمــە کــاتێ یەکــەم جــار شــارام بینــی چاوەکــانم لــە جوڵــە وەســتان زمــانم سـر بـوو پێکـانم لـە رۆیشـتن کـەوتن نـازانم چـیم بەسـەر هـات هـەر لەوێـدا و لــەو سـاتەدا ویسـتم پـێ ی بڵـێم بـە هـەموو ئـەو زمانانــەی

ئــەیزانیت وە ئەوانــەی نایزانیــت پێــت بڵــێم خۆشــم ئــەوێیت ، لــێم گــەڕێ لـــە نـــاو خەونـــەکانتا گـــوزەر کـــەم بـــە شـــەمەندەفەرکانی خـــەیاڵت ســـەفەر بکـــەم لـــێم گـــەڕێ بـــا هـــەموو یاســـاکان بشـــکێنم هــەموو دینــەکان لــە بیرکــەم لــێم گــەڕێ بــا تێــر بۆنــت کــە م تێــر ســەیرت کــەم ، لــێم گــەڕێ لــەژێر ئــەم بارانــەدا تێــر ســەمات بــۆ بکــەم ئەمویســت لەوێــدا بیفــڕێنم هــەمووی بــۆ خــۆم بــەرم تەنانــەت نەشــم ئــەزانی نــاوی چــی یــە بــەڵام هەســتم کــرد هــەموو ڕۆح و هەناســەکانم لــە نــاو ئــەودا لــێ جێمــاوە ئــەو کــات مــن تەمــەنم هــەژدە ســاڵ بــوو بــەڵام هیلاکــی ڕۆژگــار و مەینــەتی ژیــان عــەقڵیان لــە خۆم گەورەتر کردبووم .

مــاڵی ئــەوان لــە نزیــك ئــەو نانەوایــە بــوو کــە مــن شــەوانە کــارم لــێ ئــەکرد هــەر کــاتێ بــە بــەر مــاڵی ئەوانــدا بهاتمایــە مانــدوێتیم نــە ئــەما هیلاکی لە جەستەم دەر ئەچوو .

بــۆ یەکـــەم جـــار بڕیـــارم دا نامەیـــەك بنووســـم و بیدەمـــە دەســـتی ، بۆیــە نامــەیکم پــڕ کــرد لــە ووشــە ســادەکانی ئــەو ســەردەمە بــەڵام پــڕ لـــە هەســـت و ســـۆزی خـــۆم ، چوومـــە لای ماڵیـــان ســـێ کـــاتژمێر وەســـتام تـــا هاتـــە دەرێ خـــۆڵ بڕێـــژێ ووتـــم ببـــورە شـــارا خـــان ئـــەکرێ ئـــەم نامەیـــەم لـــێ وەرگـــری ، هـــەر لەوێـــدا تاســـام لەبـــەر

ئــەوەی وەڵامــی نەدامــەوە تــەنها ســەیرێکی کــردم ، مــن تــەنها یەکــەم جــار نیگــای ئــەوم بینــی هەســتم بــە ســۆزی ئــەویش کــرد بــەڵام لــە دوای ئــەوە بــە هــیچ شــێوەیەك ســەیری نــەکردم ، بۆیــە دووبــارەو ســێبارەم کــردەوە هــەر نامــەم نوســی و وەڵامــی نــەبوو ، بۆیــە ناچــار چوومــە لای خوشــکە بچوکەکــەی وە خــۆم کــرد بــە هــاورێ ی براکــەی تــا بتــوانم قســەیان لەگەڵــدا بکــەم بــە خوشــکە بچووکەکــەیم ووت ئــەتوانی ئــەم نامــەی بــدەیتێ ئــەویش زۆر رەق بــوو لــە قســە کردنــدا بــە تونــدی وەڵامــی دامــەوە ووتــی نــەخێر مــن شــتی وا ناکــەم ، پــاش چەنــد جــار پارانــەو رۆژێکیــان پــێ ئــەچوو فریشــتەکان قســەی خۆشــیان بــۆ کردبــێ دڵــی نــەرم بــوو ووتــی باشــە لێــت وەرنــاگرم نامەکــە بــەڵام پــێ ئــەڵیم ، بەراســتی هیوایــەکی دامــێ نەمــدەزانی ئــەو شــەوە لــە خۆشــیانا بنــووم هــیچ خــەو نــەچووە چــاووم چــاوەرێ بــووم ســەحەر دەرکــا و بــە خێــرای برۆمــە دەرەوە ، بــەیانی کــە ســارا ی خوشــکیم بینــی ووتــی ببــورە رازی نــەبووە نامەکــەت لــێ وەرگــرم ، ئــەم دۆخــە شەشــە مانــگ بــەردەوام بــوو ســەد نامــەم نوســیبوو بووبومــە شــاعیر بووبومــە نوســەر تــا رۆژێکیــان ســارا ووتــی شــارا ئەیــەوێت خــۆی قســەت لەگــەڵ بکــات ، ئیتــر هــەموو گیــانم ئەلــەرزێ ئــەتوت ئێســتا ئەمبــەن لــە ســێدارەم ئــەدەن لــە هــەموو شــتێ ئەترســام لەگــەڵ ئــەوەی ئــەو

هـی مـن نـەبوو بـەڵام ئەترسـام لـە دەسـتی بـدەم ، بۆیـە یەكـەم نامـەی وەرگــرت و بــردی بــۆ شــارا و ووتـــی بـــەیانی لـــە پاســـەكەدا چــاوەرێ بكــە تــا دێ لەگەڵیـدا سـوار بـە ئـەو لـە كـوێ دا بـەزی لـەوێ تـۆش دابـەزە ، بـۆ بـەیانی نـەم ئـەزانی ئـەمرۆ جەژنـە یـان جەنگــە ئــاوات هەناســەكانمی ســوار كردبــوو ترسـیش قــورگی ووشــك كردبــووم نــەم ئــەزانی چـــی بڵــێم چـــی بكـــەم ئەمـــەی ئەیگێرمەوە سەرەتاكانی بوونی هەستم بوو بە عەشق .

بـۆ بـەیانی وەك ئـەوەی سـارا ووتـی وام كـرد ، تـا لای باخەكـەی مـــاڵی پارێزگـــا دابـــەزی ، منــیش بـــە دوایـــدا دابـــەزیم ، كەوتـــە رۆشـتن منـیش بـە دوایـدا بـەڵام نەمـدەوێرا لێـی نزیـك كەومـەوە ، تـا خـۆی ئـاورێكی دایـەوە ووتـی وەرە ، كـە چوومـە لایـەوە ووتـی چیـت ئـەوێت ؟ هەناسـەم بـۆ نـە ئـەدرا ووتـم ببـورە لـێم مـن راسـتی هەسـتێكی سـەیرم هەیـە بـۆ تـۆ ، كـە ئـەتبینم سـۆزێك لـە ناخمـا دروست ئەبێ ئەمەوێ پێت بڵێم خۆشم ئەوێیت .

شارا : چوزانی ؟

كـاردۆ : ئـاخر كـە تـۆ ئـەبینم هەسـتەكەم هەناسـەم زیـاتر بـۆ ئـەدرێ هەســتەكەم خــوێنم ئاســان هــاتوو چــۆ ئــەكات هــەموو مولولــەكانی

خـۆم ئـەبینم ، کـە بـۆنی تـۆ دێ بـەلاما وا ئـەزانم لـە نـاو باخێـك لـە نیرگـزوو و شـەوبۆم ، کـە گـوێم لـە دەنگـت ئـەبێت ئیتـر سـر ئـەبم ، تــۆ قســەی دڵــی منــی تــۆ ووردە هەناســەکانی گیــانی منــی ، ئـەزانی لـە باخەکـەی ئێمـەدا .. گـوڵ ئـەروێ لـە نـاو دڵـی منیشـدا تـۆ ... تـۆ لـە نـاو دڵمـا لـە گـرێ کـوێرەی فەقیانەکـەی نـەنکم ئـەچی قـەت ناکرێتـەوە ..بشـکرێیتەوە .. دوو دەنـك بایـەمی شـیرینی هـەر لەوێـدا ئەمێنیتـەوە ، ئـەزانی ئـەوەی لـە نـاو منـدا رواو رەگـی کـرد مـن نـەبووم ئـەوە تـۆ بـووی ئـەوەی لـە نـاو تـۆدا مـرد و ووشـکی کـرد ئـەوە مـنم ، تـۆ ئەتـەوێ بـەم هـەموو عەشـقەوە مـن بـێ دەنـگ بم ...

شارا : بەڵێ پێویست ناکا هیچ بڵێیت بێ دەنگ بە .

کــــاردۆ : بــــۆ ( بــــە هەناســــەیکی قــــوڵ و خــــەمێکی زۆرەوە خەریکبوو بگریم ) بۆ بێدەنگ بم تکایە ؟ بۆ؟

شارا : ئاخر پێویست ناکا ئەم شتانە بڵێیت.

کاردۆ : باشە رێگەم بدە با تێ بگەم بۆ هیچ نەڵێم ؟

شــارا : چونکــه مـن هەسـت بـه هــەموو خۆشەویسـتی یەکـەت ئەکـەم پێویسـت ناکـا هـیچ بڵێیـت چونکـه منـیش خۆشـم ئـەوێیت . ئـەزانی مـن لـه یەکـەم بینـین خۆشـم ویسـتی وه هەسـتم بـه خۆشەویسـتی تـۆ کـرد بـەڵام وویسـتم بـزانم ئامـادەی زەمـەنێك ئـەم خۆشەویسـتی یـه به تەنها له ناختا هەڵبگری ، منیش تۆم خۆش ئەوێت .

ئیتــر ئــەو رۆژه لــه دایــك بــووم ، ئــەو رۆژه هەســتم کــرد مــن ئــەژیم هەســتم ئــەکرد بــوونی مــن لێــرەوه دەســت پــێ دەکــات ،هــەرگیز ئــەو رۆژەم بیرناچێتــەوه وه هــەرگیز نەشــمتوانی وه پێناســەی ئــەو رۆژه بکــەم وه ئێســتاش ئــەو هەســتەم بــۆ وەســف ناکرێ ئەوه تایبەمەندترین رۆژەکانی ژیانم بوو .

شــارا زۆر کــەم قســەی دەکــرد بــەڵام مــن هــەموو ووشــەکانیم دەزانــی کــه ئــەمبینی پێویسـتی نەئـەکرد کەسـمان هـیچ بڵێـین وەك ئــەوه وا بــوو لــه نــاو یەکـدا تــوا بێتینــەوه ، وەك ئــەوەی تــەواو تێکــەڵی رۆحــی یــەك بــووبین ، لای مـن شــارا هــەموو شـتێ بـوو نــان ئــاو هەناســه ، هەسـتم ئـەکرد هـەموو هیموگلۆبینـەکانی نــاخم نــاوی شــارای لەســەر بــێ بمبینیایــەو نەمبینیایــه هەمیشــه بیــرم ئـەکرد ، رۆژێکیـان هـەموو رۆژەکـەم بـەوه بـردە سـەر بیـرم لـەوه ئــەکردەوه کــه ئیتــر ئەونــدە بیــری لــێ نەکەمــەوه بــەڵام نــەمتوانی

بگـــره ئێســـتاش زۆر جـــار بیـــری لـــێ دەكەمـــەوه ، ووشـــەكانی کتێبیـــەکانی مەكتـــەبم هـــەمووی بووبونـــه نـــاوی شـــارا ، وێنـــەكانم هـــەمووی پـــرچ و چـــاوو ئـــەبرۆی ئـــەو بـــوو ، شـــارا بـــۆ مـــن لانكـــه بـــوو هیمنـــێ شـــارا ئـــەو شـــەمەندەفەره بـــوو كـــه دەمێـــك بـــوو دڵـــم چـــاوەرێی بـــوو ، ئێســـتاش هەمیشـــه وێنـــەكانی دێتـــه پـــێش چـــاووم هەمیشـــه ئاســـوودەم بـــه ناوەكـــەی بـــه بۆنەكـــەی ، شـــارا شـــای مەملەكـــەتی عەشـــقی مـــن بـــوو ئـــەو یەكـــەم عەشـــق بـــوو لـــه ژیانمـــدا تەمـــەنێك ... لـــه دوای ئـــەو بومـــه ئەكتـــەری شـــانۆی وونبـــوون لـــه خـــەم زیـــاتر میـــوانێ نـــەبوو ســـەیرم كـــاعومرێ وه ك چـــاوەروانی شـــەمەندەفەرێك وەســـتابووم شـــاراش بێـــرەدا تێنەپـــەری هەمیشـــه دوری ئـــەو دیاریـــەكی پێچـــراوەم بـــوو هەمیشـــه لـــه مانـــگ دەچـــوو چەنـــدێك بـــۆ لای چـــووبم پێـــی نەدەگەیشـــتم لـــەپی دەســـتەكانم پـــر بـــوو بـــوون لـــه گریـــان ، مـــن لـــه دوای ئـــەو لـــه فرمێسـك تـــەرتربووم هێنـــده دڵـم تـــەنگ بـــوو بـــوو نـــەك شـــارا خـــەریك بـــوو جێگـــەی خۆشـــم لـــه دڵمـا نـــه ئـــەبووەوه ئێـــواره نـــەبوو بـــه دوای ئـــاوابوونی خۆمـــدا وێـــڵ نـــەبم شـــەو نـــەبوو لەگـــەڵ ئەســـتێرەكاندا وورێنـــه نەكـــەم ئەمویســـت ئـــەو رابـــردووه بـــه پەتـــەوه بكـــەم ئەمەویســـت شـــارا و خـــەم و خـــۆم دنیا هەمووی له یاد كەم .

کـاتێ گەرامـەو ژورەکـەی خـۆم بـەس کـاك ئـاری لـێ مـابوو ووتــی کاکــە ئــەوە تــۆ لــە کوێیــت چــاوەرێی تــۆ بــووم چەترەکــەت بیــر نەچێ .

کاردۆ : سوپاس کاکە گیان ببورە کەمێ ئیشم هەبوو .

ماوەیـەکی زۆر بـوو بـاوکم نـەبینی بـوو بۆیـە ئـەمرۆ  بریـارم داوە سـەردانی بـاوکم بکـەم  بـزانم هـەر پێویسـتی یـە کـی هـەبێت بـۆی بکــەم  راســتی خۆشــم کــەمێ بیــرم ئــەکرد خــۆ ئــەو تەلــەفونێکیش ناکات نازانم ئەم دڵەی چی یە بەراستی کەسێکی سەیرە.

لە رێگەی هاتنە دەرەوە لە دائیرە لەنیام بینی .

کـاردۆ : هـا لـەنیا گیـان چـۆنی ؟ بـاش بـووی؟ رێکـەوتێکی جـوان بوو بەراستی .

لەنیا : وەڵا باشم سوپاس ، ئێستا لە دەوام تەواو بووی ؟

کاردۆ : بەڵی .

لەنیا : ئەی بۆ کوێ ئەرۆی ؟

کــاردۆ: راسـتی یەکــەی بەتــەمام بچـم بـۆ لای بــاوکم ســەرێکی لــێ بدەم .

لەنیا دەباشەدەی سەلامەت بیت .

کاردۆ : ئەی تۆ باش بووی بۆ کوێ ئەچی ؟

لــەنیا بــاش ئــەبین لــەم رۆژگارەیــا کــاردۆ گیــان بــاش ئــەبین ئــەم رۆژگــارە ســەیرە سـەیر ، ئەمە چ ڕۆژگــارێکە تــێ ی کــەوتووین مـن تـۆم خۆشـدەوێ، تـۆ کەسـێکی تـر و کەسـێکی تـریش مـن،بەڵام هەمووشـمان تەنیـاین ، منـیش ئـەچم بـۆ لای ئـەو کەسـەی ئـەو منـی خۆش ئەوێ ، بە پێکەنینەوە رۆیشت .

بــەرێ کــەوتم بــۆلای بــاوکم لــە پاســەکەدا لــە تەنیشــت ژنێکــەوە دانیشـتبووم ئـەویش کچێکـی دراوسـێیان لەتەنیشـتی یـەوە بـوو دیـار بـوو کچەکـە تـازە شـووی کردبـوو چونکـە ئەڵقەکـەی لـە پەنجـەی دەسـتی راسـتی بـوو ، گـوێم لـێ بـوو ژنەکـە لـە کچەکـەی پرسـی و پێـی ووت تـۆ کورەکـەت لـە کـوێ وە ناسـیوە ، ئـەویش ووتــی ئـەو شـــەوە مـــاڵی ئـــەوان مـــەولویان کردبـــوو ئیتـــر منـــیش بـــە هـــۆی خوشـکەکەیەوە بانـگ کـرا بـووم لـەوێ بـوو بـە فەرتەنـە ئـەم کـورە ویسـتی خـۆی بکـوژێ مـن نەمهێشـت . ئیتـر مـن لــە دوای ئــەوە

گـوێم لـێ نەبووباسـی چـی کـەیان کـرد  بـەڵام لام سـەیر بـوو باشـە ئەمـە چ جـۆرە ژیـان پێکـەوە نانێکـە کەسێك بیـەوێت خـۆی بکـوژێ تـۆ چـۆن ئـەتوانی هێنـدە بـە ئاسـانی ژیـانی لەگـەڵ پێـك بێنـی ئـەوە سـەرەتا ئـەو کەسـە شـەش مانـگ بـۆ سـاڵی چارەسـەری دەرونـی ئـەوێت تـا ئەبێتـەوە بـەو کەسـەی بتـوانێ خـۆی بناسـێتەوە پاشـان ئـەتوانێ کەسـانی دەوروبـەری بناسـێ ، ئـەم یەکسـەر دوای ئـەوە ئـەو کچـەی هێنـاوە  ئـەم وڵاتـەی ئێمـە ئاوایـە زۆرێکـی ژن هێنانـەکانی ئێـرە بناغـەیان پوچەڵـەو  هـەر بۆیـە کـە دەگەنـە یـەك یـان ژیـانێکی ناچـاری یـان خیانـەت یـا جیـا بوونـەوە بـە دەگمـەن دوو هاوسـەر دەبینـی نـوقمی یـەك بـووبن ، ئـەوە جـوانرۆ هەمیشـە ئـەڵێ لێـرە تـەنها دوو شـت گرنگـە پـارە بـۆ پیـاو جـوانی بـۆ ئـافرەت ، هـەر بۆیـە لـە دوای دا کـە پـارەو جـوانی یەکـە نـەمێنێ هـەموو پەیوەندی یەکان ئەپچرێ .

کـە گەیشـتمە مـاڵی بـاوکم هـەموو یادگـاری یـەکانی منـاڵیم بـە بیـر کەوتنـەوە ،ئـای کـە بەهێواشـی منـاڵیم لـێ جێمـا گەورەیشـم لەبـەردەمما ووردە ووردە لـێ وون بـوو تـەنها تـۆزو خـۆڵێکی سوتاو مامەوە  وەك سەراب خەونەکانم یەك یەك وون دەبن

وەك بەفر هەموو ئومێدەكانم دەتوێتەوە ئەژیم و ئەژیم رۆژ بە رۆژ ئەژیم

گوزەر دەكەم ، گوزەر دەكەم و را ئەكەم تا لە مردن نزیك ببمەوە ئەمە عومرێكە من هەر ئەگەرێم و ئەگەرێم و ئەگەرێم كەچی هەر منداڵیم نادۆزمەوە .

كە سەیری وێنەی خۆم دەكەم ئێستاش خۆم منالّیم ناناسم ئێستاش لە منالّیم ونم ئەگەرێم و ئەگەرێم كەچی لە دوا كوچەشدا هەر منالّیم نابینمەوە . ئەها من بۆ كە سێك ئە گە رێم بمگە رێنێتە وە سە ردە مى منالّیم بە هە موو جوانیە كانییە وە.. بۆ كەسێك دەگەرێم لوقمێكم بۆ بخاتە نێو دوو بسكیتەوە وەك خۆی ناسك بێ كەسێ خەت خەتێن و تول تولێن و مالّە باجێنە بزانێ من بۆ كەسێك ئەگەرێم لە سۆز وعەشقیا لە دایكم بچێ خۆزگە ئەمتوانی جاریك وەك منالّی لاسایی بكەمەوە رق بگرم بقیژێنم دە هەزار ئەوندەی تر هاوار بكەم منالّیم ئەوێتەوە .

باوكم ئەو كاتە لەگەڵ من هاتەوە بەرەو روی رۆیشتم و سەلامم لێ كرد ( باوكم كابرایەكی بێ دەنگ بوو بە شێوەیەكی

گشـــتی کـــەم قســـەی ئـــەکرد هەمیشـــە خـــەریکی کێشـــەکانی خزمـــەکانی بـــوو کـــەم ئەپەرژایـــە ســـەر کێشـــەکانی خۆمـــان ، مـــن هـــەرگیز لـــێ ی تێنەگەیشـــتم و نـــەم ئـــەم پیـــاوە کابرایـــەکی موسـولْمانە یـان بـێ دینـە ، بەرامبـەر منـاڵ سـۆزی نـەبوو ئەونـدەی مـن بـە بیـرم بێـت زۆر حەزیشـی بـە پـارە سـەرف کـردن نـەبوو هەرچەنـدە لەگـەڵ ئێمـە رەزیـل بـوو بـەڵام کێشـەکە ئـەوەبوو نـەمان ئـەزانی ئـاخۆ بـۆ خۆشـی وایـە چوونکـە زۆرتـری کاتـەکان لـە دەرەوە نـانی ئـەخوارد بۆیـە نـەمان ئـەزانی چـی ئـەخوات و چـی ئـەکات بـە شـێوەیەکی گشـتی مـن بـە منـاڵی تـورە بـوون و لێیـانی زۆرم خواردبـوو بـە دەسـتی هـەرگیز لـە بیـرو بۆچوونەکانیشـمانا رێـك نـە ئەکـەوتین بـەڵام مـن هەمیشـە وەك باوکێـك رێـزم گرتـووە زۆر جـار ناحەقیشـم نـەگرتووە ئـەو لـە خێزانێکـدا گـەورە بـووب بـوو دە کـەس بـوون بـروا ناکـەم کـەس بـەوی ووتبـێ وا بکـەو وا مەکـــە پاشـــان خوێندەوراریشـــی تـــەواو نـــەکردبوو ئیتـــر لـــەم کۆمەڵگایەشدا هەر ئەوەی لێ دەر ئەچوو.

بـاوکم : چـۆنی کـورم کـاردۆ ئـەوە بـۆ دیـار نیـت کـورم بـۆ سـەر نادەیت تەلەفونێ ناکەی ئەزانی لە کەیەوە نەهاتووی باوکەکم.

کـاردۆ : مـن باشـم باوکـە گیـان ئـەی تـۆ باشـی شـکور ؟ وەڵا نـازانم مــن زۆر مەشــغولم بــروا بکــە فریــایی هــیچ ناکــەوم ، کێشــەکە ئەوەیە هیچ ئەنجامێکم نی یە .

بــاوکم : دە تــۆ وەرە ژورەوە کــەمێکی تــر شــتێك حــازر ئەکــەم پێکەوە ئەیخۆین ، ئەو کات زیاتر قسە ئەکەین .

بـە بیـرم نایـەت بـاوکم دەسـتی گـرتبم فێـری کـردبم بـە بیـرم نایـە هـیچ کـاتێ کـە مـن نـەخۆش بوبـوم دەسـتی لـە ملـم کردبـێ یـان بـۆ لای دکتــۆرێکی بــردبێتم ، ئــەو هەمیشــە ســەرقاڵی گــەران و پیاسـەو ژیـانی خـۆی بـوو ، قـەت نەمـەبینی خـەم بخـوا مەگـەر بـۆ رۆژێ ئـەو ویسـتبێتی سـەیرانێ بکـا و بـاران بـارێبێ ، یـان شـەوێ لەگـەڵ دوسـت و خزمــەکانیا پۆکــەر بکـاو لــەپر تەعزیەیــەك پەیـدا بـێ ، بـە بیـرم نایـە نـاوی منـی بـە هێمنـی ووتبـێ ، قـەت لـە تەنیشـت خـۆی نـەی ئەنوانـدم لـەوە ئـەچوو حـەز نـەکا یـان شـەرم بیگـرێ ، ناشـزانم ئـاخۆ ئێسـتا لـە نـەمانی دایکـم دڵ گـرا بـووبێ یـان نـەبووبێ ، هـەر گیـز نـەی ئـەزانی مـن حـەز لـە شـیرینی ناکـەم ترشـیم ئـەوێ ، لەگــەڵ ئەمانەشــدا مــن لــەو خــۆش ئــەبم چونکــە ئــەو لــە بــاوکی خـۆش بـوو بـوو ، ئیتـر مـن نـازانم رەنگـە ئـەویش بـاوکێکی وەك منی هەبوبێ .

کــاردۆ : باوکــه پــێم بڵــێ دەنــگ و باســـی تــۆ ؟ چــۆنی ؟ حاڵـــت چۆنه ؟ خۆت به چی یەوە سەرقاڵ کردووە ؟

بـاوکم : باشـم ئیتـر هـەموو رۆژ هـەمان قەوانـەو دووبـارە ئەبێتـەوە ، تەکســـیەکەم ئـــەگێرم تـــا ئێـــواران هێـــز لـــه بەیـــەنما نـــامینێ و شـــەکەت ئـــەبم ئیتـــر دێمـــەوە تێـــر تێـــر ئـــەنووم ، جـــار جـــار ئەچمـــه لای برادەرە کۆنەکانم ئیتر ئاوا بەرێ ی ئەکەین .

کـاردۆ : ئـەی باوکـه بـۆ نایـەیت بـۆ لای مـن ؟ مـن ئێسـتاش تێناگـەم تۆ بۆ لەگەڵ من ناژیت ؟ یان بۆ زوو زوو سەردانم ناکەی ؟

بـاوکم : کـوره لـه هەفتەیکـدا سـێ جـار زیـاتر دێـم ، بـۆ تـۆ ئەکەویتـه ماڵ رۆڵه .

کاردۆ: ئاخر من بەشەو زیاتر له ماڵم باوکه گیان نازانی .

بـــاوك : ده بـــەخوا مـــن شـــەو مانـــدووم کـــورم تـــۆ جـــار جـــار ئـــاوا سەربه فەرقمان چی یه .

ئـــەو نێوەرۆیـــه لەگـــەڵ بـــاوکم نـــانم خـــوارد پـــێم خـــۆش بـــوو کـــەمێ بەختـــەوەری پـــێ ببەخشـــم ، کـــەمێ لـــه ئازارەکـــانی هـــەڵگرم ، زۆر

جـار پـێم ئـەوت بـۆ نایـەی لەگـەڵ مـن بـژی ئـەو حـەزی نـەکرد لـەوە ئەچوو ئەوەمان لەیەك بچێ ، لە پیریدا تەنیایمان پێ باشتر بێ.

لــە هــۆڵی دانیشــتنەکە هێشــتا وێنــە کۆنەکــەی دایکــم هەڵواســراوە ، هەمیشــە هەســتەکەم ووشــەکانی گــۆرانی یــە ناســکەکانی تەنانــەت بـۆنی لـە ماڵەکـەدا مـاوە ئـای دایـە گیـان چـەنێك زوو جێـت هێشـتم بریـا پـێش رۆیشـتن پارویـەکی تـرت بـۆ ئـەکرد تـا منـیش ئەوەنـدە برسی بینینت نەبوومایە .

دایکـــم ..دایکـــم لـــە تـــەمێك دەچـــێ دێـــت و دەروا .. دەروا و دێ تارمـای یـەکانی ئـەو لـە نێـو چاوەکانمایـە نەخشـی دەکـەم رەنگـی دەکــەم کــەچی ... هەرئــەم وێنــەیم پــێ ناکێشــرێ دایکـم لــێ بۆتــە خـــەون .. لـــێم بۆتـــە هـــەور .. بـــاران .. خـــۆر دایکمـــی وەك ئـــەو بـەفرە توانـدەوە کـە پـێش ئـەوەی شـێرە بەفرینەیـەك بکـەین پێکـەوە ئـەو بـوو بـە او پاشـان بـوو بـە هـەڵم و دیـار نـەما ، بەراسـتی دایـك وەك نانــە وەك ئــاوە خۆزگــە ئــەمتوانی بــە دەنگــی بــەرز هــاوار بکەم و بڵێم هەموو شتەکانم بەرن .. بەس جارێك دایکم بەنێ ..

بـــاوکم هاتـــە ژورەوە ووتـــی ئـــەری رۆڵـــە ئـــەوە هـــەر ئـــەڵێم چـــا ئەخۆی یان نا لەوە ئەچێ خەیاڵ رۆشیتبێ .

کـاردۆ : نـا باوکـە گیـان نـاخۆم ئـەبێ بـرۆم ئێسـتا بیـرم کەوتــەوە زۆپاکــەم نەکوژانۆتــەوە ، کــاتێکی خــۆش بــوو پێکــەوە بــووین ئــەزانم تـۆش مانـدوویت کـەمێ پشـوو بـدەو پاشـان بـرۆرەوە بـۆ ئیشەکەت .

باوکم : باشە مەرۆ ئێستا خۆم ئەتگەیەنم .

کـاردۆ : پێویسـت ناکـات باوکـە گیـان تـۆ مانویـت بـۆ پشـوویەك نادەیت من خۆم بە پاسەکە ئەرۆم .

لـە سـەیارەکە بـاوکم شـتێکی بـۆ بـاس کـردم بەراسـتی سـەیر بـوو لام .

بـاوکم : کــاردۆ لــەم رۆژانــەیا کابرایــەك لەگــەڵما ســوار بــوو پیاوەکـە سـێ ژنـی لەگەڵـدا بـوو کـابراش منـاڵێکی تـازە لـە دایـك بـووی لـە باوەشـدا بـوو ووتـی بمـان بـە بـۆ خەسـتەخانەی منـاڵان ، لـەرێگا ووتــی کاکـە ئـەوە تـۆ بیسـتوتە منـاڵ بـە پێـنج مـانگی لـە دایـك ببــێ ، منــیش ووتــم نــەوەڵا ، ژنــە بــە تەمەنەکــەی دواوە هەڵیدایـە و ووتـی دە کـورم ئـەو پیـاوە چـوزانێ ئـەرەوەڵا شـتی وا بووە ، منیش ووتم لەوانەیە .

کــە گەیشــتینە خەســتەخانەکە پیاوەکــە منـاڵەکــەی بــردە ژورەوە و بەوانی ووت لە ناو تەکسیەکە چاوەرێ بکەن .

کــە پیاوەکــە رۆی ئافرەتــە جوانەکــەیان بــە ژنــە بــە تەمەنەکــەی ووت پـێم نــەووتی باوەرمــان پــێ ناکــا ئــەویش ووتــی تــۆ قســە مەکــە مــن و خوشــکەکەی قەناعــەتی پــێ ئەکــەین ، ئیتــر ئــەویش هەر ئەگریا .

ئافرەتەکــەی تــریش ئــەیووت بــەخوا مــن پــێم ووتــم هــەر رۆژێ پێمان ئەزانرێ .

لــەم قسـانەدا بـوون و پیاوەکــە هاتــەوە ســواری ســەیارەکە بـوو پێـی ووتم لە کوێ وە هاتووین بچینەوە بۆ ئەوێ .

هــەر لــە نــاو ســەیارەکە منداڵەکــەی دایــەوە دەســت ئافرەتــە جوانەکـەو ووتـی هـا بیگـرە ئەمـە هـی مـن نـی یـە هـی کـێ یـە بیبـە بۆ ئەو .

ئــەویش بــە گریانــەوە وەری گــرت و ســەری داخســت پاشــان ئافرەتــە بەتەمەنەکــە پــێ ووت دە کــورم تــۆزێ ســەبر هــەبێ خــۆ ئێمـە درۆ لەگـەڵ تـۆ ناکـەین ئـێ باشـە ئـەو درۆ بکـات قابیلـە مـن و

خوشـكەكەش درۆ بكـەین ، كورەكـە ووتــی دایكـە مـن پێـنج مانــگ ئـەبێت هاتومەتــەوە چـۆن ئــەم منداڵــە هــی منــە ئــەوە دكتۆرەكــە راپـۆرتی داومــەتێ و پــێ ووتـم كـە ئـەو منداَڵـە نـۆ مـانگی تـەواو كردووە تەمەنی نۆ مانگە بۆ راستی ناڵێن .

ئافرەتـە جوانەكـەش پـێ ئـەچوو بزانـێ كـە تـازە شـتەكە لـە دەسـت دەرچــووە ، ووتــی ئــەوەی مــن كــردبێتم دایكــت و خوشــكەكەت ئاگایــان لــێ بــووە وەڵا ئــەوان هانــدەرم بــوون بیكــەم ، دایكەكــە كەوتـە چـەپۆك پیاكێشـانی لـە سـەیارەكەدا و ووتـی سـەر لـە قـور نێیت بێ دەنگ بە با قژ لە بنا دەرنەهێنم .

ئافرەتـــە جوانەكـــە ووتـــی بـــا بـــا بزانـــێ مـــن لەگـــەڵ هـــەلۆی دراوسـێمان بـووم هـەموو شـتیكمان ئـەكرد ئـەویش پـارەو دیـاری ئـەدا بـە دایـك و خوشـكت منیشـی لـە دوری تـۆ تێـر ئـەكرد ، ئێتـر ئەوەنـەی كـە بـوو بەشـەریان ، تـا پیاوەكـە ووتـی بێـدەنگ بـن تـازە هـیچ شـتێك سـوودی نـەماوە مـن ئەرۆمـەوە هـەر نایەمـەوە ئێـرە ئێـوەش خۆتـان چـی لـەو مناڵـە ئەكـەن بیكـەن و نـەرمینیش لـەمرۆ بـە دوا ژنـی مـن نـی یـەو تـەلاقی ئـەدەم ئیتـر هـەموویان بـێ دەنـگ بوون تا دا بەزین .

کــاردۆ : باشــە باوکــە ئــەوا ئافرەتەکــە بــە هــۆی دوری پیاوەکــەو جێهێشتنی ئەو کارەی کردووە ئەی دایك و خوشکی کابرا .

بــاوکم : کــورە ئیتــر دنیــا زۆر خراپــی بەســەر هــاتووە خــۆا رەحممان پێ بکا .

ئیتــر دابــەزیم و بیــرم کــردەوە باشــە بــۆ مــرۆڤ ئــاوا ئــەکات ئــەم جەنگەڵســتانە چــی یــە ئێمــەی تــێ ی کــەوتوین وا بــزانم لـــەو دارســتانە پــر ئاژەڵانــەیا تــەنها مرۆڤــە ئەمەنــدە درۆ ئــەکات و بــروای بــە درۆکــانی خۆشــیەتی ،مــن هەســتەکەم رۆژ لــە دوای رۆژ مرۆڤایەتی ناشرین تر ئەبێ .

کــە چوومــەوە ماڵــەوە تێــر بــووم و مانــدووش بــووم بۆیــە یەکســەر نوســتم ، کــاتێ هەســتام لــە خــەو بــانگی عەســری دابــوو ئــەویش بــە دەنگــی جەرەســی دەرگاکــە خەبــەرم بــوەوە ، کــە چــووم کردمــەوە ، هەســتم بــە بــۆنی رۆحــی خــۆم کــرد ئەهاتــە حەوشــەکەوە ، هەســتم ئــەکرد هــەموو وێنــەکانم بــە یــەك جــار خۆیــان کــرد بــە ژورا ، ئەمویســت گالیســکەیەك بێــنم و فەرشــێکی ســور راخــەم تــا پێکــانی بــەر زەوی نەکــەوێ ، پــێم ووت ئــای یــاخوا بــەخێر بێیــت هێلــین گیان .

هێلـین :کـاردۆ ، کـەمێ بۆسـتە ئەمـەوێ جـارێ تێـر سـەیرت کـەم تێـر تێـر بۆنـت کـەم ، تـۆ هـیچ مـەجولێ هـیچ مـەڵێ ، ئەمـەوێ چاوەکانت بخوێنمەوە .

کـاردۆ :ئەتـەوێ چـی بخوێنیتـەوە پـەرەکانی چـاوی مـن نوسـینی نـەما لـە کتێبـەکانما ووشـە نـەماوە ... رسـتە نـەما لـە قسـەکانما مـن لەبـەردەم تـۆدا هـیچ رێزمـانێ نـازانم بگـرە لاڵـم نامـەوێ هـیچ بڵـێم پێویستیم بە زمانێك نی یە بۆ ووتن .

ئەتـەوێ چـی بخوێنیتـەوە پێناسـەکەم و رەگەزنامەکەشـم نوسـینی تیـا نـەما تەنانـەت پارەکـانی باخەڵیشـم وەرەقـەی ئـاو کارەباکەشـم یـەك سـوچ و بنمـیچ نـەما لـە ماڵەکـەم نوسـینی لەسـەر بـێ لـە نـاو منا نوسین نەما هەمووی وێنەن ...ئەزانی وێنەی کێ ..

هێلین : وێنەی کێ ؟

کـاردۆ :وێنـەی تـۆ ،ئیتـر ئەتـەوێ چـی بخوێنیتـەوە ، دە ئیتـر لـێم گـەرێ بـا هەناسـەم بیـت .. بـاران و بـەفر و سـێبەرم بیـت لـێم گـەرێ بـا هـەر لـە نـاو تـۆدا بخولێمـەوە ...بـا هـەر لـەوێ چاوشـارکێ کـەم بـا لـەناو ئـەم رەنگـە زەردانـەی پـایزدا بیـر لـە سـەوزی و سوری تـۆ بکەمـەوە لـێم گـەرێ بـا جـارێکی تـر لـە نـاو

تـۆدا لــە دایـك ببمــەوە مـن كـوری ئــاو ئاسـمانم لــە هـەر لایــەك بمــەویٚ بتبینـم تــەنها لــە لای چــەپی سـنگم ئـە روانـم بـروا بكـە هێلــین هــەموو ئــەمرۆ بیــرم لـــەوە دەكــردەوە چــۆن بتــوانم ئیتــر بیرت لیٚ نەكەمەوە .

لــێم گەریٚ بــا كەمێــك لـــە جوانیــت بەســـەر شــۆخەكانی ولاٚتــدا بپــرژێنم بــا كچـانیتریش لـە تـۆ بچـن .. لـێم گـەریٚ بـا مـن ئەگـەر بـــارانیش بــم بەســـەر تــۆدا تنــۆك تنــۆك عەشــق بەســـەر رۆحتـــا ببارێنم .

لەوێـدا هێلــین بەتونــدی باوەشـــی پیــاكردم هــەردوو پێكــانی خســتە ســـەر نـــووكی پــێم منــیش پــر بـــە گـــەروم دەمــم خســتە دەمیـــەوە ئــەتووت یــەك ســاڵە تینــووم ئــەتووت لــە بیایــان جێمــاوم لــە شـیلەی گـــەروی تێــر نـــابووم ، پێكـــەوە توابوینـــەوە هەســـت نەئــەكرد یــەك پارچــە نــەبین ، وەك یــەك قــەدی دار بــووین ، لــە پــاش مــاچێكی زۆر قوڵ.ووتم دە وەرە دانیشە ئەمەویٚ چاوم لە چاوت بێت .

هێلین : كاردۆ پێم بڵیٚ باشی ؟

بیرۆ: تۆم لا بێت بە دڵنیایی باش ئەبم .

هێلین : هەمیشە لێرە هەر وا بە تەنیایی ؟

کاردۆ : بەڵێ من بۆم دەرکەوتوە تەنیای نزیکترین هاوڕێمە .

هەستایە سەر پێ و سەیرێکی ئاوێنەکەی کردو ووتی .

هێلین : ئەزانی کاردۆ من بەخیلیم بە ئاوێنەی ژورەکەت دێت دەتوانێت هەموو ڕۆژێک تەماشات بکا ، خۆزگە لە ماڵەکەی تۆدا ئاوێنەیەك ئەبووم .

کاردۆ : تۆ هەمیشە ئەو ئاوێنەیەی کە خۆمی تیا ئەبینم هێلین گیان

هێلین : من هەستەکەم من و تۆ لە هەموو شتێکدا لە یەك دەچین.

کاردۆ : ڕاستە لە هەموو شتێکدا لە یەك دەچین تەنها لە یەك شتدا کەمێ جیاوازین ئەزانی چی یە ؟ سەیری کە لە چیا جیاوازین لە یەك ، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تۆ جوانتر ئەبی و منیش پیرتر .

هێلین : نا تۆ هەمیشە لە ناخی منا وەك خۆتی جوانی پاکی بێگەردی .

کــاردۆ : ئــەزانی هێلــین لــەنێوان مــن و تــۆدا ژیــان هەیــە. چــەنێك دوریــن لــە یــەکیش ... مــن زەوی و تــۆ ئاســمان کــەچی هەمیشــە هەناسە و ئاو و گریان و پێکەنین و خەون هەیە .

هێلـین : کـاردۆ تـۆ عاشـق بـووی لـە رابـردووا کەسێك هـەبووە لـە ژیانتا پر بە بوون عاشقی بوبێتی ؟

هەناســـەیەکم هەلکێشـــا پربـــوو لـــە یادگـــاری و ئـــازارو وێنـــەی رابردوو .

کـــاردۆ : هێلـــین گیـــان مـــن هـــەرگیز نـــاهێلم رابـــردوو کـــونترۆلم بکات ، تەنانەت زۆر بیری لێ ناکەمەوە .

مـن نـازانم تـۆ چ مەبەسـتێك هەیـە بـەڵام لـە راسـتی دا بـەڵی عاشـق بووم .

هێلـــین : ئـــەتوانی بـــۆم بـــاس کـــەی کـــێ بـــوو چـــۆن بـــوو ئـــەی بـــۆ نەگەیشتنە ئامانجی عەشقەکەتان .

کـــاردۆ : ئاســـایی یـــە لای مـــن ئەگـــەر تـــۆش بـــە ئاســـایی وەری بگری .

هێلین : ئاسایی یە حەزەکەم باسی بکەی بۆم .

ئـەوەی لــە ســەرتاوە پەیوەیســتی کـردم بــە شــارا وە و وای لێکـردم خۆشــم بوێــت هــەموویم بــۆ باســکرد ، بــەڵام بەشــێوەیەك نــا کــە هەسـتی برینـدار بێـت ، ئــاخر هــەر چـۆنێ بێـت ئــەویش مێینەیــە ئـەبێ لــەبارەی باسـکردنی مێینەیــەکی تـر هەسـتیارانە قسـە بکـەیت تا دڵی بریندار نەکەی .

مـن ئەگــەر بمــەوێ رۆمانێـك بنووسـم لەســەر شــارا تــەواو بــوونی نــابێ لەگــەڵ ئــەوەی شــارا زۆر کــەم قســەی ئــەکرد بــەڵام هــەموو ئـەو ووشـانەی ئێسـتاش لـە نـاو مێشـکمدایە ، کـاتێ باسـی مـرۆڤ و بیرکردنـــەوەی بــۆ ئـــەکردم ئـــەیوت کـــاردۆ ئەگەر کەلەی خـــاڵیش بەئەنــدازەی ســکی خـــاڵی قــۆرەو نـــاڵە نـــاڵی بکــردایە و ئـــازاری بداینایــە ، بــروا بکــە ئــەو کاتــە زۆر لــە ئێســتا عــاقڵتر ئــەبووین ، ئـــەیووت ئێمـــەی مـــرۆڤ ئەوەنـــدەی بـــۆ تێرکردنـــی ســـکمان و ناوگـەڵمان هەڵپـە ئەکـەین بـە نیـوەی ئـەوە مێشـکمان تێـر کردایــە ئێستا هەموومان بەختەوەر ئەبووین .

جارێکیــان بــە بیــرم دێ ئــەو کاتــە مــن زۆر نــوێژم ئــەکرد دایــم ئـەچووم بـۆ مزگـەوت رۆژێکیـان پـێ ی ووتـم باشـە کـاردۆ تـۆ بـۆ ئەمەنــە خــەریکی خــوا پەرســتیت خــۆ تــۆ تــاوان زۆر نــی یــە ، مــن بیســتومە ئەوانــەی تــاوانی زۆر ئەکــەن زیــاتر ئەگەرێنــەوە بــۆ لای

خـواو پەرسـتنی زیـاد ئەکـەن و زۆر جـار ئـەگرین تـا خۆیـان پـاك بکەنــەوە لــە تاوانــەکانیان و بــە مێشـکی خۆیـان کـارە قێزەونــەکانیان بسـرنەوە خۆیـان سـپی بکەنــەوە بـەس خـۆ تـۆ تـاوان و گوناحــەت نـی یـە ئـەی بۆ ئەوەنـە خـوا پەرستی ئەکـەیت ، منـیش ووتـم نـا مـن تــاوانم نــەکردووە لــە ژیــانم بــەڵام مــن ئەمــەوێ لــە خــوا نزیــك ببمــەوە ، ئـەویش ووتــی جـا بــە پەرسـتن ، ووتـم بـەڵی ، ووتــی تـۆ ئەگــەر ئەتــەوێت لــە خــوا نزیــك ببیتــەوە بیــری لێبکــەرەوە نــەك بیپەرسـتی ، بۆیــە لــەدوای ئــەو ووشــەیەی ئــەو بیــرم کــردەوە تــا تەواو نزیك بوومەوە لە خوا ناسیم .

ئێسـتاش زۆر رێگــا هەیــە کــە دێتــە بــەردەمم لــە ژیانــدا بیــر لــە بۆچوونــەکانی ئــەو دەکەمــەوە تــا بریــار بــدەم چــی بکــەم ، ئەشــێ ئــەوکات مــن زیــاتر عاشــقی ئــەو بــووبێتم و مێشــکی خــۆم بــاش کــاری نــەکردبێ یــان لەوانەیــە شــارا دیــاری خــودا بوبێــت بــۆ مرۆڤایــەتی بــەڵام زۆر لێــرە نەیهێشــتەوە مــن و ئــەو بــێ ئــەوەی کەســمان هــیچ بلێــین .. لــە هــەموو ووشــەکانی دلــێ یــەك تــێ ئەگەیشتین ...

هێلین : ئەی باشە بۆ جیا بوونەوە ؟ بۆ پێکەوە نەمانەوە ؟

کـاردۆ : لەبـەر ئـەوەی لـەم وڵاتـەدا بـووین ، لێـرە خـەوێکمان بینـی مـن و ئـەو کـە لە کۆتاییـدا داوای لێبوردنمـان لە خۆمـان کـرد، چـونکە جـۆرە خەونێکمـان بینـی، مـافی ئەوەمـان نەبـوە ئەو خەونـە ببینـین ، مـن ئێسـتاش نـازانم بـۆ جیـا بووینـەوە هەستەکەم ئـازاری زۆری جیابوونەوەکـە زۆر شـتی ئـەوی بیـر بردوومەتـەوە یـان هەسـتەکەم خـۆم رامکردبـێ لـە هـەموو یادگـاری یـە ناخۆشـەکان و ئەوانـەی نەویسـت بـوون لام فـرێم دان ، ئەوەی ئێمە بینینمان پێکەوە خەون بوو خەون ...

هێلین : تێناگەم بۆ خەون بوو ؟

کـاردۆ: ئـاخر ئەمـە قورسـە راسـتە مـن ئێسـتا تـۆم خـۆش ئـەوێ و ئەمـەوێت هـەموو راسـتی یـەکان پـێ بڵـێم ، بـەڵام زۆرێـك لـەو شـتانە ژیاننامـەی تایبـەتی شـارا ن نـەك بـە تـەنها مـن ، مـن مـافی ئـەوەم نـی یـە بـۆ کەسـی بـاس بکـەم لەوانەیـە رۆژێـك بێـت خـۆت ببینـی یـان دەنگـت پێـی بگـات ئـەو کـات دەزانـی بـۆ بـۆ یـەك نـەبووین لەوانەیـە ئـەو کاتـە تـۆ باشـتر لـە ئازارەکـانی هـەردوو لامان تێبگەیت و بزانی ئێمە کێ بووین پێکەوەو ئێستا کێین .

هێلــین : ئەمــەوێ قســەی لەگــەڵ بکــەم ، وات لێکــردم تامــەزرۆی بیننــی بـم ، خـەزەکــەم بـوزانم ئەمــە کـێ یــە ئــەم مرۆڤــە ســەیرە ، ئەو لە کوێ یە ئێستا ؟.

کـــاردۆ: لـــــەدەرەوەی ئـــــەم وڵاتەیـــــە ، زۆر دەمێکـــــە ئێـــــرەی جێهێشـــتووە و ئـــــەم ولوڵاتـــەی بێنـــاز کـــردووە لـــــە هێمنـــــی و روونــاکی ، بــەس بــروا بکــە نــازانم لــە کــوێ یــە ، خۆشــم زۆر جـار تامــەزرۆی ئــەوە بــووم بـزانم لــە کـوێ یــە بــەس بــێ ئــەنجام بووە ئەو وویستەم .

هێلین : ئێ کەواتە ئاسایی یە پێم بڵێ خۆ ئەو لێرە نی یە .

کــاردۆ : هێلــین گیــان شــەرم و رێــزی مــن بــە تــەنها لەکەســەکە خــۆی نــی یـە بـەڵکو لــە مێـژوو یادگاریەکانیشـێتی ، مـن ئـەبێ ئـەو جــوانی یانــەی ئــەو هــەر لــە نــاو ئــەلبومی یادگــاری یەکانیــدا بهێڵمەوە پاشان بروا بکە وەك پێم ووتی زۆر شتم بیر نەماوە .

هێلــین : وای ئەوەنــدە عاشــقی بویــت وا بــزانم ئێســتاش بیــرت نەچۆتــەوە ، هەســتەکەم ئێســتاش لــە نــاو رۆحتــا راکشــاوەو پێکــی شــەرابی بــە دەســتەوەیە و تــۆش بــە ووشــە وێنــەی دەکــەیت ، ئەتوانم بزانم ئێستاش عەشقت بۆ ئەو ماوە .

ئەمــە پرســیارێکی زۆر قورســە ، نــازانم چــۆن وەڵامــی بەمــەوە ،چونکــە لــە ناخــەوە نــا هەمیشــە رێــز لــەو عەشــقەی ئــەگرم ئــەو مامۆســتا و مامــان بــوو بــۆ عەشــق ، بــەڵام ئیتــر زۆر جــار مــەرج نـــی یـــە تـــەنها مـــردن عاشـــقەکان لێـــك جیاکاتـــەوە ، بـــەخوا بیرکردنــەوە لــە یادەوەرییــەکان جگــە لەبیرکردنــەوە، شــتێك ناخاتــە سەر شتێکی ترەوە.

هەرچەنــد دەکــەم ، نــاتوانم ئێســتاش چــن بکەمــە ســنگمەوە و لــە نـــاو دڵـــم دەربێـــنم هەرچەنـــد ئەکـــەم .. نـــاتوانم هـــەموو پـــەرە شــیعرەکانی شــارا بســوتێنم هــەموو ئــەو شــەقامانەی ئــەو پیاســەی پیــا کــردوون کۆیــان بکەمــەوەو گۆرەپانیکیــان لــێ دروســت کــەم ئاوێنـــەکانی روخســـاری وێنـــەکانی نـــاو چوارچێوەکـــانی نـــاخم هەمووی بشکێنم ...

هەرچـــەن ئەکـــەم .. نـــاتوانم نـــاتوانم لـــەم رۆحـــەما دووری بخەمــەوە لــە عەشــقا .. فێــری خۆشەویســتی فێــری رقــی کــردم هەرچــەن ئەکــەم نــاتوانم ، بــەڵام خــۆ تــازە ئــەو رۆیشــت تــازە ئــەوەی لــەو بــەجێماوە باوەشــێ یادگــاری و چــەپکێ خــەمی پــرەو لــە ناخمایــە ، مــن هەمیشــە ئەمــەوێ ئــەو لــە بیــر بکــەم بــەڵام ببــورە حــەیا وحورمــەتی نــاخم ببــورە پیــاوەتی یــەکانم ببــورە ئــارامیم ،

هێلـین گیـان ئـەو لـە ناخمـا هێشـتا زۆر بـەرێزە  لەگـەڵ ئـەوەی هیچمـان ئاگامـان لـە یـەك نـەما ئـەو هـەر پەرەیـەكی قـەد كـراوی فرێ نەدراوە لە ناوما دەی تازە ئەمانە هەمووی رۆیشت .

كاردۆ : نازانم . ئەمە ئێستا بۆتە رابردوو .

هێلین : راستەكەی ئەمە بوو بە رابردوو تەواو .

كـــاردۆ :راســـتەكەی ئەمـــە رابـــردووە و تـــەواو  وە حوكمـــدان بەســـەر رابـــردوودا ئاســـانە ،  بـــەلام وەختێـــك خۆتـــان بەرلێشـــاوی لافاوەكـــە دەكـــەون وئافـــات و رقـــی ژیـــان بـــەم بـــەردو وئـــەو بەردەتانـــدا دەكێشـــیت. ئەودەمـــە گـــەرتوانیت بەرگـــەی بگریـــت توانیـت خـۆت بگـری ونـەهێڵی تـرس ناخـت بكێڵـێ بـەڵێ ئەودەمـە كاتێ ئارامی وە چنگ دە هێنیت  لە زەتی بوون دەچێژیت ) .

هێلین : ئەی ناخۆشترین ساتی چی یە كە لەگەڵ ئەو بینیبێت ؟

كـاردۆ : ئـەو كاتـەی كـە ووتـی ئیتـر تـەواو ، ئـەزانی تـۆ قـەت پێـت وتراوە ئەو ئیتر بونی نییە ، قەت پێت ووتراوە تەواو ؟!

پێـت ووتـراوە كـە ئـەو كەسـەی خۆشـت ئـەوێت ئیتـر جـێ پێیـەكی لەســـەر ئـــەم خاكـــە نیـــە .. شـــەماڵیش بـــۆنی هەناســـەكانیت بـــۆ

ناهێنێـت .. قـەت تـەلفونت بـۆ کەسـێک کـردووە و مۆبایلەکـەی داخـرا بێـت و کـەس نـەبێ جوابـت د ؟؟ هەواڵێکیشـت لێـی نـەبێ .. هەسـت بـەو جـۆرە مردنـە کـردووە چـۆن مردنێکـە .. کـەس نیـە شـتێکت پـێ بڵـێ .. هـەر خـۆت و هـەر خـۆت . بـە دەردی خۆتـەوە لـە سـوچێکی ژورەکـەتا دا ئەنیشـیت و دەسـت و پـێ بەستراو ئەمێنیتەوە .

دڵیشت خەریکە لە سینەت یەتە دەرەوە و هیچت پێ ناکرێت ..

قەت بەسەرت هاتووە ؟!

هێلـین بـۆی بابەتەکـە بگـۆڕێ ووتـی : ئـەرێ ئـەوە ئێسـتا ئـەچیت بۆ لای نەنکت ؟

کـاردۆ : بـەڵی لـەم چـەن ڕۆژەی پێشـو لـەوێ بـووم ، جـا خـۆ نیـوەی کاتـەکی لای بـووم ئـەو خـەریکی نـوێژو دوعـا کـردن بـوو بۆ من .

هێلین : ئەی پێت نەوت دوعاش بۆ من بکا ؟

کـاردۆ :ئـۆی هێلـین گیـان ئـەی چـۆن مـن لـە دوعاکـانی نـەنکما لـەجێ ی خـۆم دامنـایی لـە هـەموو ڕکـاتێکی نوێژیـا پـێم ووت

نـــاوی تـــۆ بێنـــێ لەســـەر هەر دەنکـــە تەســـبیحێکی وێنـــەکانی تـــۆم هـــەڵکۆڵی لـــە نـــاو فەقیانەکانیشـــیا نامـــەکانی تـــۆم لـــول کـــرد و هەڵمگرت .

ئـەها بـروا بکـە کـە ئەچمـە ئـەوێ هـەموو جـارێ لەگـەڵ بـۆنی سـمڵ ومێخـــەك و گـــوڵاوا هەمیشـــە بیـــری تـــۆم دێ ، ئـــەزانم تـــۆ چەنێکـــە نەنکم خۆش ئەوێ .

هێلـــین : مـــن حەزەکـــەم لێـــرە بمێنمـــەوە نەرۆمـــەوە ، حەزەکـــەم لـــە نێـــو باوەشـــی تـــۆدا بخـــەوم ، ئیتـــر قـــەت هـــەڵم نەســـتێنن لـــەو خـــەوە ئەبەدی یە.

کـاردۆ : مـن ئەمـەوێ تێـر بۆنـت بکـەم تـا هـەموو دنیـام لـێ ئـەبێت بە تۆ ....

ئینجـــا باوەشـــت پێـــا دەکـــەم تـــا خـــەون لـــێم ببێتـــە ســـەفەری ســـەر هەورێ ..

دوای لەســـەر شـــانت پێڵوەکـــانم لێـــك دەنـــێم جگـــە لـــە ترپـــەکانی دڵـــت هیچی تر نابیستم .

تاڵــە ڕەشــەکانی ســیمات دەدەم بەســەرچاوەکانما بــاخۆری بــوون هەڵم نەستێنێ .

لەگــەڵ تــۆدا بــم هــەرگیز نــاگریم وخــەمم نــابێ و لــە گــەڵ تــۆدا بــم هەرگیز تەنهایی نامترسێنێ .

ئــەو ڕۆژە پێکــەوە بــووین تێکــەڵ بــوین لــە یــەك ڕژایــن کــەچی هــەر تێر نەبووین ، لە ئێوارەدا ووتی ئیتر ئەبێ بڕۆم .

کــە ئــەو ڕۆیشــت و هــەر خــۆم مامــەوە بــۆم دەرکــەوت تــەنیای نزیکتــرین هاوڕێمــە لەگــەڵ بۆنــە بەجێماوەکەیــدا لــە گــەڵ بیرەوەری یەکانی تۆزێ پێش ئێستایدا مامەوە بە تەنهایی.

گەرامــەوە نــاو هــەواڵ و سیاســەت و وڵات و ســەر ئێشــەکانی گەرامــەوە نــاو جیهانــە پۆخڵــەکانی سیاســەت و تەلــەفیزۆن و هەواڵــە ناخۆشــەکانی کــە وا باشــترە گــوێ لــە هیچــی نــەگریت هــەمووی درۆ هــەموو بەشــدارن لــە بــەش کردنــی درۆ و دزی و تــەنها ئەوانیشــن ئەیانــەوێت هــەڵمان خــەڵتێنن ،دۆخــی نیشــتیمان ڕۆژ بــە دوای ڕۆژ بــەرەو ئــاڵۆزتر و ناخۆشــتر دەچــێ ، ئــای کــە خــەومان ئــەبینی بینــە خــاوەن وڵاتــی خۆمــان ئــەو هــەموو بەرگــە گرتنــی ئــازار و نەهامــەتی و ئــازار و ئەشکەنجانە هــەمووی بــە بــا

چـوو ، خـۆ مـن زۆر بـاش ئـەزانم نـاوی نیشـتیمان و شـەهید و ئـاڵا و ســـەربەخۆی ئەمانـــە تـــەنها بـــۆ زیـــاتر پركردنـــی گیرفـــانی ســـەرمایەدارەكانە ، هـــەژارەكانیش بـــە دوو ووشـــەی ئاســـان هەڵەخـــەڵتێن ، نـــەوت و پـــارە و دەسَـــەڵات لـــە وڵاتـــی ئێمـــە بۆتـــە هـۆی بێقیمـەت كردنـی تاكـەكانی نـەك بـە قیمـەت كردنـی ، ئـەوە خـۆ فرۆشـی و تەسـلیم بوونمـان بـەم لاو ئـەو لاش بـە لای خۆیـەوە بوەسـتێ هیچمـان لاریمـان نـی یـە زەوی ئـەم نیشـتیمانە وەك قاشـە كێـك بفرۆشـین كـە زۆر دەمێكـە ئـەم بودەڵانـە ئەیبـەن بـەرێوە فرۆشـتویانە ئەوانـەی خۆیـان لـە ئێمـە كـردووە بـە گـەورەمان هەرچەنـدە ئـەوەی وای لێكـردووین ئـەم دەسـەڵاتە بـە گـەورەو بەهێز بزانین ، بچوكی خۆمان و لاوازیمانە .

چ نەگبـەتێكین هەرچەنـدە خـۆ ئێمـەش لـە سـایەی عـەقلی خۆمـان گەیشـتین بـەم رۆژەی ئێسـتا تـێ ی كـەوتووین بـە هـۆی گـەمژەی ئێمـەوە هـەرچی گەنـدەل و دزە گەیشـتە دەسـڵات ، ئێمـە دۆرایـن تـامی دۆرانمـان كـرد بـەڵام ئـەوەی لامـان قورسـە ئێسـتا دان بنێـین بـە و دۆرانەمانـدا ئـاخر زۆر قـورس تـامی دۆران بكـەیت و بكەویتە ژێر كاریگەری یەكانی یەوەو تێیدا بژیت .

ماوەیـــەك لەگـــەڵ كۆمـــەڵی یابـــانی كـــارم ئـــەكرد رۆژێكیـــان سـەرۆكی تیمەكـە ووتـی ئـەزانی مـن ئـەم ماوەیـە شـتێكی سـەیرم بـۆ دەركـەوتووە ، ووتـم چـی یـە ؟ ووتـی ئـەم میللەتـەی ئێـوە میللـەتێكی زیـرەكن زوو شـت فێـر ئـەبن وە مێشـكتان بـە توانایـە بـروا بكـە میللـەتی ئێـوە لـە میللـەتی ئێمـە زیرەكتـرن ، منـیش ووتـم ببـورە بـەس هەسـتەكەم گاڵتـەم پـێ ئەكـەی ئـێ خـۆ نـە ئـەكرا پێـی بڵـێم پـێم رابـوێری ، ووتـم راسـتەكەی ، پێكـەنی ووتـی چـی یـە بـروام پـێ ناكـەی . ووتـم ببـورە نـەخێر ئـاخر سـەیركە ئێـوە لـە چ ئاستێكن و ئێمەش لە كوێداین .

ووتـی بـا بـۆت روون بكەمـەوە ، میللـەتی ئێمـە لـە سـەدا نـەوەدی زیـرەك نـین بیـر ناكەنـەوە بـەڵام لـە سـەدا دەی زۆر زیـرەكن و بیـر دەكەنـەوە لـە پـێش خسـتنی نیشـتیمان و پێشـكەوتنی گەلەكـەی ، لای ئێمـە ئـەو لـە سـەدا دەیـە حـاكمی وڵاتـن و وولات ئەبـەن بـەرێوە ئـەوان لـە سـەدا نەوەتەكـە ئیـدارە ئەكـەن و ئاراسـتەیان ئەكـەن بـە رێگـا راسـتەكاندا بـەڵام لای ئێـوە لـە سـەدا دە كـەتان كەسـانی بـێ دەمـاغ و گەنـدەڵن كـە ئـەوان وڵات و میللـەت ئەبـەن بـەرێوە بۆیـە واتـان لێهـاتووە ، منـیش راسـتی سەرسـام بـووم بـە شـیكردنەوەكەی و ووتـم رێـك وایـە ، جـا ئیتـر ئێمـە نەگبەتیمانـە

کۆمـەڵێ ئـەم وڵاتـە ئەبـەن بـەرێوە لێبونەتـەوە لـە بـەها پیرۆزەکـان داماڵراون ، بـەش مـن ئەونـدە تێگەیشـتووم لـەم وڵاتـەدا ئێمـە تـازە گەیشـتووینەتە ویسـتگەیەك کـە ئیتـر داهاتوومـان باشـتر نابێـت لـە ئێستا و رابردوومان.

بـــەیانی یەکـــەی دی هـــات و خـــۆریش ســـنەوبەرەکانی ئـــاڵتونی کـردەوە ، بـەیانی یـەکی دی هـات و چۆلـەکانن کەوتنـە گـۆرانی و هەڵبەزینـــەوە ، بـــەیانی یـــەکی دی هـــات و هـــەموو مریشـــك و مـراوی و قـاز و قەلـەکان بـەرەو دەرەوە بـەێ کـەوتن بـە قیـرە قیـرو گـاره گـارەوە، مـەرو مانگـا بـۆرە و ماعـەیان ئـەهات هەڵپـەیان بـوو کامیـان زوو کایانەکـە جـێ بێڵـێ و بـۆ ئـەو دەشـتە راکـا ، بـەیانی یـەکی دی هـات و ئێمـەی مرۆڤـی ئـەم وڵاتـەش بـە دیـــار بیســـتنی هەواڵەکانـــەوە هـــەر بـــە خـــەوتووی چاوێکمـــان کردۆتـــەوە لـــە ژێـــر جێگاکـــەوە چـــاوەرێین بابـــە نـــوئێلێ بێـــت و ســـەرتاپای ئـــەم وڵاتـــەمان بـــۆ بکاتـــە بەهەشـــتێ ، نـــەمانزانی بابـــە نوئێـل بـۆ لای گـەورەکان نایـە ، وڵات بـە ئـەو نـاگۆرێ ، ناچـار سـەرمان کـردەوە بـە ژێـر بـەتانی یەکـەدا و چاوەکانمـان لێـك نـا ویسـتمان خـۆی بگـۆرێ وڵات ، ناچـار ووتـم بـا هەسـتم بـە خـوا

نــاگۆرێ بــا بچــم بــۆ دەوامەکــەم باشــترە بــە خــوا راســتیان ووتــوە پێش ئەوەی دەسەڵات خەبەر بکەیتەوە خۆت هەستە لە خەو .

هەرچەنــە مــن موناقەشــەی بابــەتی سیاســی ناکــەم بــەڵام کــە بــەیانیش چومــە ژورەکــەی خۆمــان لــە دائیــرە باســی ئــەوەیان ئــەکرد چونکــە ئــەو شــەوە هەواڵــە کــان گــەرم بــوون ئیتــر دەرەوەشــی گــەرم کردبــوو بــە لێکدانــەوەی ســیایی و قســەی زیــادەوە کــە چــۆن نەخشــەی رۆژهــەڵاتی ناوەراســت ئــەگۆرێت و پێگـەی ئێمـە چـەنێك گرنگـەو ئێمـە ئـەبێت چـی بکـەین ، کـاك ئـاری ووتـی تـۆ ئـەڵێت چـی کـاك کـاردۆ : ووتـم ئەمـە چـی یـە کـە ئـەیڵین ، ووتــی رێککــەوتنێکی نێــو دەوڵــەتی هەیــە کــە ئــەم ناوچەیــە دابــەش بکرێتەوە .

کــاردۆ: باشــە بــە بــرِوای ئێــوە رێکــەوتنێکی ئــاوا ســتراتیجی و گرنــگ کــە داهــاتووی زۆر لــە زلهێزەکــانی جیهــانی پێــوە بەســتراوەتەوە ئــەو هــەموو بەرژەونــدی نــەوت و ســنورانە ئەمەنــە بابــەتێکی ئاســانە چــوار نــەزانی وەك ئێمــە لەســەرمێزێکی دائیــرە بەدەم چا خواردنەوە بیزانین و ئاگامان لێ بێت .

ئاری : ئەی بۆ نا کاك کاردۆ ئێمەش ئاگامان لە سیاسەتە برام.

کـــاردۆ : براکـــەم ئـــەوەی ئـــەم وڵاتـــەی تێکـــداوە ئەوەیـــە سیاســـی یـــەکانی بازرگـــانی ئەکـــەن و خەڵکـــە ئاســـایی کەشـــی سیاســـەت ئەکـــەن ، کـــاك ئـــاری تـــۆ ئـــەزانی کـــاتێ رێکـــەوتنێ کـــرا ســـاڵی ١٩١٤ بـــوو ئێمـــە لـــە ســـالی ١٩٨٠ لەســـەر داهـــاتووی ئـــەم ناوچەیـــە تـــەنها نـــاوی رێکەوتنەکـــەمان بیســـت ئـــەی باشـــە رێکـــەوتنێکی ئـــاوا گرنـــگ بـــەم شـــێوەیە چـــۆن ئێمـــە و ئەوانـــەی لـــە ئێمـــەش عـــاقڵترن ئـــاوا بـــە ئاســـانی ئەیبیســـتن و ئـــەیزانن براکـــەم سیاســـەت هـــەمووی بـــووە بـــە درۆ و دزی ، بـــا یـــەك شتیشـــتان پـــێ بڵـــێم تـــازە لـــەم وڵاتـــەی ئێمـــە بەرژەوەنـــدی نـــەوت ئەمەنـــدە گـــەورە بـــووە هـــیچ شـــتێ داهاتوویـــەکی باشـــی نـــابێ جـــا ئـــەوە پەنـــدێکی ئینگلیـــزی هەیـــە ئـــەڵێت سیاســـەت هونـــەری هەڵخەڵەتاندنـــە لـــە مێشـــکە لاوازەکانـــدا . بـــەخوا ئەمـــەی وڵاتـــی ئێمـــە بـــەس تـــەنها پاراســـتنی بەرژەونـــدی یـــە و هیچـــی تـــر وە بـــا بـــاش بزانـــی ئـــەم دەســـەڵاتە بێمەنەتـــە لـــە خەڵکەکـــەی ئـــەزانی بـــۆ براکـــەم چوونکـــە ئـــەم دەســـەڵاتە کلکـــی خـــەڵکی بـــاش پێـــواوە ، هـــەر بۆیـــە ئەونـــدە بـــێ منەتـــە لێیـــان، تـــۆ ســـەیریکە بزانـــە خـــەڵك داوای چـــی دەکـــات چـــی دەوێـــت بزانـــە ئـــەم خەڵکـــە چـــی تێگەیشـــتوە لـــەم دەســـەڵاتە گەندەڵـــە مـــن وای بـــۆ ئـــەچم کێشەی هەرە گەورە ئەوەی کە

هەمیشــه داواکــاری خــەڵك لــه خــوار ئاســتی بینینــی دەســەڵاتەوه بووه .

کاکــه گیــان هەمیشــه ئەوانــەی لــه دەســەڵاتان زیــرەك و ووریــان ئــەوەتا دەســەڵات هەمیشــه وا لــه گەلەکــەی دەکــات لەوســەرەوه بیربکاتەوه له کاتێکدا خۆی لەمسەرەوه هەڵسو کەوت دەکات .

لــەو قسانەدا بــووین و کــاك محمــود ووتــی کــاك کــاردۆ بــه ئــەرك نەبێ کەمێ ئیشم پێته .

کــاردۆ: بەســەرچاو ، حەزەکــەی بچینــه کافتریایەکــه پێکــەوه ؟ یــان هەر لێره ئەبێت پێکەوه دانیشین ؟

محمود : ئەگەربه ئەرك نەبێت با بچینه کافتریاکه باشتره .

پــاش ئــەوەی چووینــه کافتریاکــه هەســتم ئــەکرد کــاك محمــود بابــەتێکی گرنگــی هەیــه و ئەیــەویت بێلێـت ، بــەڵام شــپرزەش دیــار بــوو بۆیــه هــەر کــه دانیشــتین ووتــی: چاکــەم داواکــردووه دانیشــه ئێســتا بۆمــان ئــەهێنن . منــیش دانیشــتم و چــاوەرێ ئــەوم ئــەکرد تــا قسەی خۆی بکا .

محمـــود : كـــاك كـــاردۆ راســـتی یەكـــەی مـــن لـــە خێزانەكـــەم جیـــا بوومـــەوە ، و ئێســـتا مـــن ماڵەكـــەم جێهێشـــتووە مناڵـــەكانیش لای ئەوون .

كاردۆ: كاك محمود تۆ چی ئەڵێیت بۆ وات كرد ؟.

محمـــود: كاكـــە كـــاردۆ گیـــان چـــۆن هەنـــدێك جـــار هاوســـەرگیری هۆكارێكـــە بـــۆ ژیـــان دروســـت كـــردن هەنـــدێك جـــاریش هەیـــە جیـــا بوونـــەوە هۆكارێكـــە بـــۆ ژیـــان دروســـت كـــردن مـــن ئـــەو تـــەواو رێـــز نـــەما بـــوو لـــە نێوانمانـــدا كەســـمان بـــوونی ئـــەوی تـــری لا گرنـــگ نـــەبوو ، بەكـــەڵكی یـــەك نـــەما بـــووین لـــە بیـــرت دێـــت ماوەیـــەك لەمـــەو پـــێش پـــێم ووتـــی كەســـمان لـــەوی تـــر تـــێ ناگـــا ئـــێ ئیتـــر شـــتەكان لـــە دەســـەڵاتی كەســـمان نـــەما و جیابووینـــەوە ، منداڵـــەكانیش مـــانگی جارێـــك ئـــەچم ئـــەیانهێنم شـــەوێك لای مـــن ئـــەبن و دوای ئەیانبەنـــەوە لای دایكیـــان ، ئێســـتا خـــۆم بـــە تـــەنیام دوو ژورم هەیـــە لـــە شـــوقەكانی ســـارێن هـــەر كـــات حـــەزت كـــرد ئـــەتوانی ســـەردانم بكەی .

کـاردۆ: مـن زۆرم پـێ ناخۆشـه بـەڵام وەك خۆشـت ووتـت ئەمـه ژیانـه ئیتـر هـەموو شـتێ رەنگـی روودانـی هەیـه ، بـه دڵنیـاییی مـن سەردان دەکەم وە ئەوەی بە منیش ئەکرێت بۆت ئەکەم .

محمـود : راسـتی یەکـەی کـاتی خـۆی باسـی شـتێکم بـۆ کـردی لەسـەر گـێلاس خـان جـا بیـرم نایـه کـردبێتم یـان نـا بـەس حەزەکـەم ئـەو بابەتـەش لـه بیـر خـۆت بەریتـەوه ، چونکـه لـەم رۆژانـه بـانگی کـردم و ووتـی نامـەوێ ئیتـر قسـه بمێنـێ لـه نێوانمانـداو پـێ ی ووتـم مـن نامـەوێ ژیـانی خـۆم تێـك بـدەم راسـته مێردەکـەم هـەر لـه جێگـەی نەبووانـەو لەگـەڵ کـەرێکی تۆپیـودا جیـاوازی نـی یـه ، راسـته دایـم سەرخۆشـەو و بۆگەنەکـەی دەمـی رۆژە رێ یـەك ئـەروات ، بـەڵام گرنـگ ئەوەشـه ئێـواران دێتـەوه نـاو مـاڵ و منداڵەکەی خۆی ئیتر ئەویش سەربەسته .

کاردۆ : کاك محمود راستی یەکم پێ ئەڵێیت ؟

محمود: بەڵێ.

کـاردۆ : تـۆ بـه تـەنها لەبـەر پەیونـدی یـه خراپەکـەی خـۆت و خێزانەکـەت وازت هێنـا یـان گـێلاس خـانیش هیوایـەکی تـازەی دابویتێ .

محمـود : راسـتی یەکـەی نیـواو نیـو ، هـەر بۆیـە لـەنیوەی هەسـت بـە ئـارامی دەکـەم و لـە نیوەکـەی تـری هەسـت بـە دۆران دەکـەم ، مــن ئەبوایــە متمانـــەم بـــە گــیلاس نەکردایــە ئەبوایــە بمزانیایــە ئــەویش ئافرەتــە بــەڵام تــازە هــیچ شــتێ ســوودی نــی یــە ، ئــەو ئـەیوت مـن نـاتوانم بـە بـێ مێردەکـەم بـژیم مـن بـێ ئـەو منـاڵـەکانم بـۆ نــاروات بــە رێــوە وە مەســرەفی منـاڵــەکانیش بــە مــن نــاکرێ بۆیـە مـن ئەمـەویت لـە ماڵەکـەی خۆمـدا بمێنمـەوە تەنانـەت ئەگـەر لەگەڵ سەگێکیشدا بێت گرنگ ئیدارەمان بکات .

کــاردۆ: کــاك محمــود مــرۆڤ پێویســتە متمانــە بــە کــەس نــەکات ئەسـڵەن گرنـگ نـی یـە متمانـەت بـە دەورو بەرەکـەت هـەبێ وە چ گرنگــی یــەکی هەیــە تــۆ متمانــە بــە خەڵکەکــەی دەورت هــەبێت کەســانێك وا دەکــەن کــە لــە دنیــا تــێ نەگەیشــتبن . کاکــە گیــان مــرۆڤ بونــەوەرێکی بــێ متمانەیــە ، دڕنــدەیەکی گەورەیــە بــەس پــێ ئــەچێت تــۆ شــارەزایی باشــت نــەبێ ، دیــارە تــۆ ژیانــت بــە ئاســانی و ئاســایی بــەرێ کــردووە ، بەڵام ئەوە لە مــن بپرســە ، مـن پێـت دەڵـێم مـرۆڤ چ بونەوەرێکـە ، مـرۆڤ وایـە تـا خـراپ بیــت لەگــەڵی ، ئــەو زیــاتر رێــزت بــۆ دادەنێــت وە تــا رێــزی بگریـت زیـاتر ئەتچەوسـێنیتەوە ، بـۆیە پێـت دەڵـێم قـەت پێویسـت

ناکا متمانە بە کەس بکەی  من هەمیشە ئەوەم ئەوت تۆ پیاوێکە ژندار و ئەویش ژنێکی خاوەن مێرد لە غەریزەی سیکس و تێرکردنی یەکتر چی کۆتان ئەکاتەوە بە یەکەوە من تێناگەیشتم ئێوە بە تەما بوون بگەن بە چی ئاخر خۆ مرۆڤ کە کارێك دەکات ئەی نابێ هیچ نەبێ تروسکایەکی داهاتوو ببینێ .

محمود : ئیتر لە هەر خەسارەتێك و عەقڵێك .

کاردۆ : بەس بەو جۆرەش نا کە مرۆڤ تا عاقڵ بێت بە تەواوی ئیتر خۆی پارچەی پێوە نەمابێ .

محمود : راستەکەی من ئەمرۆ سەرم ئێشانی بەس تکام وایە ئەم بابەتە لە نێوان خۆماندا بێت .

ئەم قسەیەی کاك محمود بۆی دەرخستم کە ئەو سوودی لە تاقیکردنەوەکانی نەبینیوە دەنا بابەتێکی تایبەتی وا بۆ بۆ من باس بکا و بۆ متمانە بە من بکا .

کاردۆ : خەم نەبێ کاك محمود ، من پێت ناڵێم نهێنی یەکەت لە بیردایە ، چونکە بیر کەسانی زۆر ئاوی لێ دەخۆنەوە بەڵام

ئـەو نهێنـی یـە بـە دڵنیـایی ناچێتـە دەروەی مـن بـێ خــەم بـە کـەس لەوە ناخواتەوە کە لە ناخی مندایە .

محمود : سوپاست دەکەم .

چوینــەوەە ژورەکــەی خۆمــان لــەوێ کــە ســەیری گــێلاس خــانم ئـەکرد ئـافرەتێکی بـەرەڵای قارەمـانم ئەهاتـە بـەر چـاوو ، بـەرەڵا لــەوەی کــە رێگــەی دا ژیــانی کــاك محمــود بــەو شــێوەیە تێــك بشــکێت ، قارەمــانیش لەبــەر ئــەوەی ژیــانی خــۆی تێــك نــەدا هەرچەنــە لەوانەیــە پێچەوانەکەشــی راســت بێــت چونکــە ژیــانیش بــە درۆ و بــەو قبــوڵ کردنــی نەهامەتیانەیــەوە شــتێکی قێزەونــە ، زۆر جــار مــرۆڤ ناچــارە بــە شــوێن ژیانــدا بگــەرێت بــەڵام وا باشـتر بـوو رێگایـەکی بـاش بدۆزێتـەوە ئـەیتوانی محمـود ی خـۆش بوێـت بـەڵام وەك هـاورێ وەك رۆحێکـی پـاك بـەو جـۆرە ئـەیتوانی هاوبەشـی خەمــەکانی بێـت و یارمــەتی بـدات لــە ژیانـدا بــە هــەر حــاڵ ئــەویش لــە هــەموو بارەکانــدا کەسـێکی بــاش نــەبوو رەنگــە بڵــێم ئــەمجارە کــاك محمــود شانســی هــەبوو کــە لــەو دۆزەخــە دەرچــوو کــە تیایــدا بــوو نــەچووەوە دۆزەخێکــی گــەرمتر ، رەنگــە داهـاتووش وانەیـەکی قـورس بـدا بـە کـاك محمـود و هاوسـەرەکەی و هـەردوولا تێبگـەن کـە ژیـان عـەقڵی ئـەوێت نـەك بـە تـەنها سـۆز

و سـیکس بـەخوا ئیتـر خـۆ هـەر کەسـێکیش کەلەسـەری هـەبوو بەشـەر نـی یـە چونکـە مـەرج نـی یـە هـەموو سـەرێ عـەقڵی تیـا بـێ کەلە سەر هەی کای تیایە کا .

بەراسـتی ماوەیـەکی زۆرە سـەردانی نـەنکم نـەکردووە هـەر لـە مـاڵ بـۆ دەوام و لـە دەوام بـۆ مـاڵ ، ئـەوەی هەمـە بـەس شـەوانە تەلەفونـە نازدارەکـانی هێلـین ە بۆیـە ئـەمرۆ دوو نەفـەر کـەبابی گـەرم ئەبەمـەوە لەگـەڵ نەنـە گیـان ئـەیخۆین پێکـەوە ئـەو حەزیشـی زۆر لە حەلْوای گەزۆیە ئەوەشی بۆ ئەبەم .

نـەنکم راسـتە بـە تـەنیا ئـەژیا بـەڵام زوو زوو خـاڵم سـەری لـێ ئـەدا هەرچەنـە مـن لەگـەڵ خـاڵم زۆر کـۆك نـەبووم لای مـن ئاسـایی بـوو بـەڵام ئـەو بابەتەکـەی بـە هەسـتیاری وەرگرتبـوو هـەموو ئـەم کێشـەیەش لەسـەر میراتـی یـەوە بـەجێما بۆمـان مـوڵکێکی کۆنمـان هـەبوو لـە لادێ یـەکی نزیـك شـار ئـەویش بـێ ئـەوەی بـە کەسـمان بڵـێ دەسـتی بەسـەردا گرتبـوو ئەیویسـت بیکـات بـەم فیلایانـەی کـە ئێستا بـاوە ، کـە نـازانم ئـەم فێلایـە جگـە لـە خـۆ نوانـدن و جێگایـەك بـۆ کـاری بەدرەوشـتی و قومـار و خواردنـەوە چ سـودێکی هەیـە ئـاخر مـرۆڤ ئەوەشـی شـێواندووە کـاتێ تـۆ ئەچیتـە دەرەوە بـۆ سـەیرانێ یـان گـەرانێ ئـەبێ تێکـەڵی سروشـت ببیـت ئەگـەر هـەر

مــاڵ بێـت چ سـودێکی هەیـە ، ئیتـر خاڵیشـم نــازانم ئەمــەی بـۆچی بــوو ئــەم کێشــە خێزانــی یــەی دروســت کردبــوو ئــەوە کێشــەی میراتــی یــەکانی باپیریشــم لــەولاوە بوەســتێ هــەمووی بــۆ خــۆی بـرد بـێ ئـەوەی خۆشـی سـوودی لـێ ببینـێ ئـەو بابەتـە لای مـن گرنگـی نــەبوو ، میراتــی وەك لاکــەی تۆپێـوی مانگایەکـە راسـتە گۆشــتەکەی زۆرە بــەڵام کــەس ســوودی لــێ نــابینێ نــازانم بــۆ ، بۆیـە لای مـن بابـەتێکی گرنـگ نـەبوو بـەڵاَم لـە هـەمان کـات دا مـن کەسـی درۆزنـم خـۆش نـاوێ تـا دوا جـار پـێم ووت بیـرت بێـت کـە تــۆش رۆژێــك دێــت و دەمــری ئــەوە بزانــە مــــردن پــۆرت شــکاندنێکی ئابــڕوو بەرە ، بـۆ ئەوانەی بـێ ویـژدان و خـۆ بـەزل زانــن و پێیــان وایە بەس خۆیــان لەســەر زەوی مـرۆڤن و هــەموو شـتێ مـافی خۆیانــە ببیــەن . ئـەو ئەمــەی زۆر لــە دڵ گـرت ئیتـر لـەو کاتـەوە چـارەی یـەکمان نـاوێ ، بۆیـە هەمیشـە کـە ئـەچووم بـۆ مـاڵی نـەنکم پـێش ئـەوە تەلـەفونێکم ئـەکرد تـا دڵنیـا بـم لـەوێ نـی یـە هـەروەها بـزانم نــەنکم پێویسـتی یـەکی نـی یـە بـۆی بـەرم لـە گـەڵ خۆمدا.

کــاردۆ : ئــەلوو نەنــەگیان کەســی لــێ یــە ئەمــەوێ بـێم ئەمشــەو لای تۆ بم .

ئــەویش لــە قســەکەم تــێ گەیشــت و ووتــی نــا بەســاقە ئێــوارە وەرە کفتەیەکی خۆشم کردووە بەس هیچ نەهێنی لەگەڵ خۆتا .

ئـای لـە پـاکی نـەنکم هـەموو شـتەکان ئـەزانێ پـێش ئـەوەی روو بـدا .

کاردۆ: باشە نەنە گیان ئێوارە دێم دەی خوات لەگەڵ .

وام بــە بــاش زانــی نیــوەڕۆش بچــم لــەدەرەوە شــتێ بخــۆم هەرچەنــە مـن زۆر حـەز بـە خـواردنی دەرەوە ناکـەم ئـاخر ماوەیـەك خـۆم لـە چێشــتخانەیەك کــارم ئــەکرد ئــەوەی لــەو چێشــتخانەیە بینــیم حــەزی خــواردنی لا نەهێشــتم . بــەڵام ووتــم تــازە فریــا ناکــەوم بــۆ نیــوەڕۆ خــواردن ئامــادە بکــەم ، بــەرێ کــەوتم بــۆ چێشــتخانەیەك و لــەوێ بـــرنج و فاســـۆلیایەکی بەلـــەزەتم خـــوارد ئـــاخر نەگبـــەتی ئـــەم خواردنانــە لەوەشــدایە کــە تامیــان زۆر خۆشــە جــا ئیتــر نــازانم هۆکاری خۆشی یەکەی چی یە .

کە چووم بۆ چایخانەکە رامیار لەوێ بوو ، سڵاوێکم لێ کرد .

کاردۆ : چۆنی رامیار دەنگ و باست ؟

رامیار : من باشم کاردۆ گیان ئەوە ماوەیەکە دیار نیت ؟

کاردۆ : وەڵا چوزانم لە دەوامم و ئیتر خۆ باران و سەرماش نەیەهێشت خەڵك زۆر بێتە دەرەوە .

رامیار : کاکە ئەوە بەهارە ئیتر مرۆڤ لە ماڵدا ئیدارە ناکات .

کاردۆ : راستەکەیت بەس بەخوا ئیشیش ماندووی کردوین .

رامیار خۆی هیچ ئیشێکی نەکرد ئەیوت مرۆڤ ئەبێت هەموو کاتەکەی بۆ خوا پەرستی تەرخان بکات بەڵام لە کوێوە ئەژیاو چی سەرف ئەکرد ئەوەم نەزانی ، ئیتر هەر کەسەو بۆچونێکی خۆشی هەیە لەم ژیانە .

رامیار : لەش ساخ بێت ، من ئەم سەری مانگە ئەچم بۆ عەمرە ، حەزەکەم پێش ئەوەی برۆم گەردن ئازای بکەین .

کاردۆ : لای منەوە هەزار جار گەردن ئازا بێت .

رامیار : خوا سەلامەت بکا براکەم ئیشەڵا دوعای خێر بو ئەکەم .

کاردۆ : مەمنونم برام .

رامیـــار : هیـــوام وایـــه رابـــردوت بـــه بیـــر بێتـــەوه لـــه داهاتوشـــدا بێیتـــەوه ســـەر رێگـــەی خـــواو پێغەمبـــەر پـــێش مردنـــت بێیتـــەوه بـــه هۆش خۆتدا چونکه دوای ئەوه پەشیمانی سوودی نی یه .

کـــاردۆ : کاکـــه رامیـــار ئێمـــه رابردومـــان تـــازه رۆشـــتووه ، داهاتووشـمان نادیـاره ، بۆیی بـۆ ئـەم ساته بـژی کـه ئێسـتا تێیـدایت هـاورێ ، بـەخوا بـرام مـن توانـام نـی یـه بـۆ داهـاتوو بـژیم کـه هیچـی لـێ نـەزانم پاشـان مـردن چـی یـه لای مـن هێنـده ترسـناك نـی یـه ئـەزانی بـۆ ؟ چونکـه بـۆ کەسـێك کـه ئـازاری زۆری چەشـتبێ ، مردن بۆ ئەو ڕوداوێکی کت و پڕ نییه له ژیاندا..

رامیـار : نـا مـرۆڤ ئـەبێت هـەموو کـاریکی بـۆ نـاو قـەبری بێـت تێشـووی دوا رۆژی بیـر نـەچێت ئـەبێ مـرۆڤ کارێـك بکـات کـه مرد دەرونی ئارام بێت .

بەراسـتی بـه قسـەکانی رامیـاردا بیـرم کەوتـەوه هـەواڵێکی لـەنیا بپرسـم دەمێکـه ئاگـام لـێ نـی یـه ، ئـاخر ئـەو هەمیشـه ئـەیوت هـەر تاکێـك پێویسـتی بـه کەسـێك هەیـه کـه هەسـت بـه ئـارامی بکـات لەگەڵیـدا و مـن هەمیشـه هەسـت بـه ئـارامی ئەکـەم لەگـەڵ تـۆ کـاردۆ ، ئـەی کەواتـه ئـەبێ ئێسـتا چـۆن بێـت کـه ماوەیەکـه مـن

هـەوڵی خـۆ دورخسـتنەوەم داوە لێـی کـە ناچـار بـووم وا بکـەم بۆیـە بـە باشـم زانـی برۆمـە دەروەی چایخانەکـەو تەلـەفونێکی بـۆ بکـەم بـۆی بابەتەکـەش بگـۆرم لەگـەڵ رامیـار بۆیـە بـە رامیـارم ووت ببـورە کاکـە رامیـار ئێسـتا دێمـەوە دەبـێ تەلـەفونێکی گرنـگ بکـەم . چوومــە دەرەوە و ژمارەکــەی لــەنیام لێــدا لــە یەکــەم زەنــگ وەڵامی دامەوە .

کاردۆ: ئەلو لەنیا چۆنی ؟

لـەنیا : هـەر باشـە ئـاواش لێمـان بپرسـی ، مـن خـراپ نـیم ئـەژیم ئەی تۆ باشی ؟

کـاردۆ : راسـتەکەی مـن کەمتـەر خـەم بـووم ببـورە بـەس بـەخوا ئـیش و کـار تـەواو سـەرقاڵیان کـردووم پـێم بڵـی تـۆ چـۆنی چیـت کرد .

لـەنیا : وەك تـۆ پێـت ووتـم رێگـەم بـەو کـورە دا بێتـە پێشـەوە و ماوەیەکـە یـەك ئـەبینین و قسـەمان لـە بـارەی زۆر شـتەوە کـردووە ، لـە روکەشـدا ئـەو کەسێکی باشـە خـراپ نـی یـە ئیتـر نـازانم دوای چی دەرەچێ .

کــاردۆ: دوای چـــی قابیلــه ؟ ئیتــر ئـــەوەش نســیبه وا نـــی یـــه بـــه پێکەنینەوە.

لـــەنیا : دوای ئـــەبین بـــەچی خـــۆ ئـــەم دنیایـــه وایـــه مـــرۆڤ ســـەرەتا خـــۆی بەدنیـــا نـــاگۆڕیتەوە کەچـــی لەپـــڕێکدا عاشـــقی خـــوێڕییەک دەبێـــت و ئەیکـــات بەکـــاڵایەکی هەرزان و پـــارچە شوشـــەیەکی شـــکاو ، ئیتـــر نـــازانم ئەمـــەی مـــن بـــه تـــەمام عاشـــقی بـــبم و ببـــێ بـــه مێردم پیاو دەرەچێ یا خوێری .

کـاردۆ: لـەنیا گیـان وا بیـر مەکـەرەوە ئیشـەڵا کەسـێکی بـاش ئـەبێت خەمت نەبێ و رێزیشت ئەگرێ .

لـەنیا : خـوا گەورەیـە ، ئیتـر ئەمـە ژیانـە مـەرج نـی یـە هـەموو خواســتەکانمان بێتــە دی گرنـــگ رێ بکـــەین و رۆژەکـــان بەینـــە دەست یەك و هەنگاو هەنگاو نزیکتر بینەوە لە پیری و مردن.

کـاردۆ : دەی هـەر سـەلامەت بیـت هـەر کـات پێویسـت بـە مـن بـوو بۆ هەر شتێ بەسەر چاوو دەی خوات لەگەڵ .

لـەنیا : چـاوت خـۆش بێـت ، ئیشـەڵا تـۆش ئاگـات لـە خـۆت بێـت خـوات لەگـەڵ تـازە هـەر وا ئەکـەم بـە خـوا هـەر بـە و هـەنگاوەتا

با شتێك بڵێم تا قیامەت هەنگاو بنێین بەیەک ناگەین، من و تۆ دوو هێڵی یەک قیتاڕین..دەی خوات لەگەڵ هاوڕێ .

کە چوومەوە چایخانەکە دانیشتم و رامیار ووتی کاردۆ تۆ بە تەمای چیت لە ژیانتا بۆ ژن ناهێنی ؟

کاردۆ : من ئەڵێت ، کورە وەڵا تۆشم لێ بویت بە نەنکم ئەوە ئەویش کە ئەمبینێ یەکسەر ئەڵێت ئەوە کەی ژن ئەهێنی ، ئاخر ژن هێنان وا ئاسان نی یە مرۆڤ ئەبێت ئامادە بێت خێزان دروست بکات ئامادە بێت مندالّ پەروەردە بکات ئەبێت ببێت بە بەخشندەو پێدەر ئێستا ئێمە وەرگرین کەی توانیمان خوڵقی پێدەر بین ئەو کات ژن هێنان گونجاوە کەی فێربووین لە یەك ببورین بە بێ هۆ ، ئازاری یەکتر نەدەین ، شتە بچوکەکان گەورە نەکەین ، فێربین پاروەکانی دەمی خۆمان بدەین بەرامبەرکەمان لەگەڵ ئەوەی کە خۆشمان برسین ، ئەبێ فێربین داوێن پیسی نەکەین خیانەت نەکەین راستگۆ بین .

رامیار :جا برام لەسەر سوونەتی خواو پێغمبەر ژن بێنە ئیتر هەموو ئەمانەی تێدایە .

کــاردۆ: لەوانەیــە لــەو ســوننەتانەدا کــە تــۆ باســی ئەکــەیت ئــەو شـتانە هـەبێت هەرچەنـدە دڵنیـاش نـیم ،بـەڵام ئایـا لـە نـاخی ئێمـەدا هەیــە ئــەم شــتە وا ئاســان نــی یــە ســەیرکە خــۆ هــەموو دینــەکان ئــەڵێن ئــەبێ مرۆڤــەکان داویــن پیســی نەکــەن بــەڵام ئــاخۆ هــەموو کەسێ داوین پیسی ناکا .

رامیار : بەڵێ زۆر کەس هەن نایکەن .

کــاردۆ : مەرج نــیە ئەوەی تائێســتا دوایــن پیســی نەکردبێــت ئیتــر پاک بێت

مــرۆڤ ئــەبێت رەگــی پــاکی لــە ناخیــدا بێــت ئــەو کــات چڵــەکانی داوین پاکی و راستی خۆیان سەر دەر ئەکەن لە روخساریا .

رامیار : ئاخر برام ژن هێنان تەواوکردنی نیوەی دینە .

کــاردۆ: جــا مــن نیوەکــەی تــریم زۆر هەیــە تــا لــەم نیوەیــەم نوقســان بێـت پاشـان خـۆ تـۆش ئـەو نیوەیـەت تـەواو نـەکردوە هێشـتا ئـەی خۆت بۆ تەواوی ناکەی براکەم .

بــاش بــوو بــانگی عەســری داو ئــەویش ووتــی ئــەبێ بــرۆم گــەردنم ئازا کە نەکا نەتبینمەوە .

کاردۆ: گەردنت ئازا بێت برام .خوات لەگەڵ .

مـــن لـــە چایخانەکـــە مامـــەوە رۆژنامەیـــەکم پـــێ بـــوو بابـــەتێکم خۆێنـدەوە زۆر کـاری لێکـردم و دڵگرانـی کـردم لەوێـدا بیـرم لـەوە ئـــەکردەوە ئـــەمووت باشـــە هەنـــدێك کـــەس دڵ تـــەنگ دەبێـــت بـــە نوسـینێك کـاتێ دەیخوێنێتـەوە ، ئـەی ئـەبێ دڵـی ئـەو کەسـە چـۆن بـووبێ کـــە نوســـیویەتی ئـــەبێ ئـــەو ئـــازاری چـــەن بـــێ وا ئـــەم ووشـانەی هێناوەتـە ئـەم دنیایـەو ئـەم وێنانـەی بـەم شـێوانە رەنـگ کــردووە . لــەو نوســینەدا دێرێکــی زۆر ســەنجی راکێشــام نوســرا بـــوو (مراوییـــەکی لاواز بیـــت لـــە حەوزێکـــدا چـــاکترە...لـــەوەی چۆلەکەیـەکی قەڵـەو بیـت لـە قەفەسـێکدا) ، سـەیرە مـرۆڤ چـەنێك تینـووی ئـازادی و سەربەسـتی یـە کـەچی ئـەوەتا ئێمـە ئـازادی و سەربەســتی یەکــەمان هەیــە بــەڵام خەریکــە برســێتی و نــەمانی متمانـە بـە سبەی هـەموو ژیانمـان لـێ تـاڵ دەکـا مـن پێم وایـە نـان لـە پـێش ئـازادی یـەوە یـە ، مـرۆڤ برسـی بێـت هـەرگیز ئـازادی بـۆ بەرجەســتە ناکرێــت ، پەیــدا کردنــی نــانیش عــەقڵی دەوێــت بیرکردنــەوەو هیلاکــی دەوێــت بــە بۆچــوونی مــن هــەر میلــەتێك بــووە خــاوەنی نــانی خــۆی ئــەوکات ئــازاد و سەربەســتی تــامی

خـۆی ئـەدات ، بـەس بـەخوا مـن دڵخۆشـی لـەم وڵاتـە بـەدی ناکـەم دڵتەنگیشی لێ نی یە ، ئێرە لە پلەیەکی مەترسیداتردایە ....

رۆژنامەکـــەم پێچایـــەوە و بـــەرەو دوکـــانی حەڵواکـــە بەرێکـــەوتم ووتـم تـا کـات درەنـگ نـەبووە دا نـەخراوە بـا بچـم حەڵواکـە بکـرم و بەرەو ماڵی نەنکم بەرێبکەوم .

لـــەوێ مەســـکەت و لـــە بزینـــەم بینـــی ئەوانیشـــم کـــری و کـــەمێ گوڵەبەرۆژەشم کری و بەرێ کەوتم .

هـــەر لـــە دوورەوە بـــۆنی کفتـــە بەلەزەتەکـــەی کۆلانەکـــەی پـــر کردبـوو ،بـە خـوا ئێمـە نـەوە بـە دوای نـەوە هـەر نەوسـن بـووین ئـەم میللەتـەی ئێمـە ئەوەنـدەی خـەریکی پرکردنـی ورگێتـی نیـو ئەونـدە مێشـکی پـر ناکـات هـەر بۆیـە حاڵمـان بـەم رۆژە گەیشـتووە ، کـورە ناحـەقیان نـی یـە مـرۆڤ کـە ئـەمرێ هـەر وورگـی ئـەبا لەگـەڵ خـۆی دوای ئـەوە ئـەو خواردنـە بەتامانـەی خۆمـان پیـاوی ئـەوێ نـەیخوا خـۆ بـەخوا ئێسـتا مـۆدی رێجـیم و کـەم و خـواردن و وەرزشـــە بـــۆی لـــەش و لاری خەڵکەکـــە جـــوان بێـــت هـــەزار رەحمــەت لــە گرانــی یەکــە نــەبوونی لــەش و لــەری خەڵکەکــەی کردبوو بە داری بنێشت .

نەنەگیان ئەوە لە کوێیت .

نـــەنکم : وەرە ژوری بەســـاقە و دەرگاکـــە دوای خـــۆت داخـــە ئـــەوەتام دەســـتنوێژ ئـــەگرم لـــە حەوشـــە بچوکەکـــە وەرە ژورەوە دانیشە با نوێژەکەم بکەم دێمە لات .

جـا کـە نـەنکم ووتــی بـا نوێژەکـەم کـەم دێمـە لات ئـەوا وەك ئـەوە وایـە لـە سـەفەر بێتـەوە لات سێ چـارەکی پـێ ئـەچێت نـازانم ئەمـە نوێژەکـانی سـاڵ ئەگێرێتـەوە یـان سـونەتی پـێش نـوێژو سـوننەتی دوای نـوۆێژو سـوننەنتی نـوێژە سـوننەتەکانی ئـەکا کـورە بـەخوا ئەمنـــە ئـــەکا بەشـــی هـــەموومان نـــوێژ ئـــەکا ، گرنـــگ دەرونـــی ئارامە بە نوێژەکانی و ئاراستەی خۆی ئەزانێ لە ژیانا .

کــە چوومــە ژورەوە وێنەیــەکی زۆر جــوانی دایکـم بینــی کــە تــا ئێسـتا نـــەمبینی بـــوو ، بەراسـتی سەرسـام بـــووم ئـــەوکات جلـــەکانی زۆر کەشـــخەو جـــوان بـــوو تەنانـــەت تەنورەکـــەی لەســـەر ئـــەژنۆ بـــوو قۆڵـــەکانی رووت بـــوون ســـەیر بـــوو لام لـــەو زەمەنـــەیا ئـــەوان ئـــاوا بـــوون ئێسـتا ئەوەنـدەی لـــەچك ئـــەبینی ئەونـده ســـەری قـــژاوی نـــابینی ، تێناگـــەم خـــۆ جـــاران دینـــیش هـــەبوو خەڵکەکـــە نوێژیشـــیان ئـــەکرد خـــوا پەرستیشـــیان ئـــەکرد بـــەڵام جـــل و پۆشاکیشـــیان جـــوان

بــوو ، بــەخوا وا بــزانم ئێمــە رۆژ لــە دوای رۆژ بــەرەو دواوە ئـەرۆین ئـەوەتا هـەرچی زەوی دەشـتەكانە كردمانــە فـیلا و خــانوو شـاخەكان بـوون بــە لــەوەرگای مــەرو ماڵــەتی نەگبــەت كــە یــەك لــەپی دەســت ســەوزایی تیــا نــی یــە ، یــەك بــەروبومی خۆمــان نــەماوە كــە ئەچیتــە دوكــانی بــەقاڵیك بــەس بەقاڵەكــە هــی خۆمانــە ئــەویش لــە زۆر دوكــان بەقاڵەكــەش خۆمانــە نــی یــە ، تەنانــەت پێخــەف و جێگــەی نوستنیشــمان هیچــی وەك خــۆی نــەما هــەمووی پــووچ بــوو ، جــاران بــە بیــرم دێ لەســەربانی مــاڵی نــەنكم نــانی ئێــوارەی دراوســێكان تێكــەڵ ئــەكراو پێكــەوە ئــەمانخوارد كــەچی ئێستا دراوسێكەی تەنیشت ناتناسێ .

لــە چــاوەروانی نەنكمــدا بیرێكــی قــوڵم بــۆ هــات كەوتمــە دنیایــەكی تــرەو ئــەو وێنانــە ی هەڵواســرابوون منێكــی تریــان خەبــەر كردەوە.

لە دوایـین كوچــە تاریكــەكانی خەیــاڵی خۆمــدا بــەدەم ســەیری وێنــە كۆنەكانــەوە ،هەنــدێك جــار تێكدەشــكێم هەنــدێك جــاریش هەســت بــە بــەزیوی دەكــەم هــەنێك جــاریش وا ئــەزانم تــەواو دۆراوم مــن وام كەســم لەگەڵ خۆمــدا نەبــردۆتە دیــار پەنجەرەكــانی شــەڕ ، نامــەی مــەرگم بــۆ كــەس نەهێناوەتــەوە زور جــار لــە م خــانووەدا

به تەنیـــا بـــوم به دزیەوه بـــارگەم بـــۆ كـــامەرانیم ســـاز كـــردوه بێـــئەوەی كەس پـــێم بزانـــێ دڵـــی هەمـــوو كۆترەكـــانی ئـــەمماڵـــەم راگرتـــوه ، هـــەرگیز دڵـــی پەپولەیـــەكی دەوری چراكـــەی نـــەنكم نەتۆرانـدووه ، قـەت نەمهێشـتوه لقـی داریَ لـە باخەكـەیا بشـكێ ، دەسـتم نـەبردووه بـۆ گـوڵێ نـەبا نـەنكم زیـز بـێ ، هەمیشـه نوقـڵ وخەنـدەبووم بـۆ منـاڵانی دراوسـێ لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆرجارهـەر خـۆم بـه تـەنها خـەمبار بـووم ، لەوانەیـه هـەر لـەم ماڵەشـدا هـەروا بێ دەنگ به هێمنی بمرم .

نـەنكم : ئـەوه رۆڵـە سـەعاتێكه بانـگ ئەكـەم بـۆ جـوابم نادەیتـەوه ، دەوره بەسـاقه وەر ئـەودیو نـانم تێكـردووه مـن بـەرۆژوو بـووم بـا نانەكه بخۆین .

باوەشـێكی تونـدم كـرد بــه نــەنكما هێنــده لاواز بــوو لــه جەســتەدا كـەچی ئەونـده پتـەو بـوو لـە خۆشەویسـتی خـوادا بـەو پیـری یـەوه نـان و ئـاوی لـە خـۆی حـەرام كردبـوو لەبـەر خـاتری خـوا ، ئەمـە خۆشەویسـتی خوایــه نــەك ئەوانــەی ئێســتا هــەر یەكــەو مەزهــەبێك و رێگەیـەك و ئـەوەی سـەلەفی یـه وەهـابی بـه موسـوڵمان نـازانێ ئـەوەی شـیعەیه سـوونی بـه موسـولمان نـازانێ ئـەوەی مەسـیحی

یــە ئیســلام بــە خــوا نــاس نــازانێ ئــەوەی جولەَکەیــە مەســیحی بــە خوا ناس نازانێ بەم جۆرە کەسیان دانی خێر بە یەکدا نانێن .

کــاردۆ: نەنــەگیان بــا بــرۆین نانەکــە بخــۆین .ئــەم شــتانە لــە کــوێ دانێم نەنە ؟

نــەنکم : ئەمانــە چــی یــە رۆڵــە چیــت هێنــاوە ؟ نــەمووت هــیچ نەهێنی .

کاردۆ : نەنە گیان هیچی وا نی یە .

نـــەنکم : دە بیهێنـــە موبەقەکـــە بەســـاقە هـــەر لـــەوێ نانەکـــەش ئەخۆین.

کە چوومە ژورەوە هەڵاوی کفتە مەستی کردم .

کــاردۆ: نەنــە گیــان ئــای دەســتەکان خــۆش بێــت بــۆ عــەزێت کێشــاوە ، لەش ساغ بێت .

نەنکم : دانیشە بەقوربان تێرو پر بخۆ .

کاردۆ: وای لێ ئەکەم .

نەنکم : کاردۆ کەی ژن ئەهێنی ؟

پرسیارە نەبراوەکەی نەنکم .

کـاردۆ: جـا نەنـەگیان کـەس هەیـە ئـەم کفتـە خۆشـەی تـۆ بزانـێ تـا بیهێنم هههههه.

نەنکم : هەیە کورم بۆ نی یە هەیە .

کاردۆ : ئەیهێنم نەنە گیان دڵنیا بە ئەیهێنم .

نــەنکم تــا ئیســتاش ئــەو راســتی یــە نــازانێ مــن ئەمــەوێ ژیــانی هاوســەری پێــك بهێــنم لەگــەڵ هێلــین بــەڵام خێزانەکــەی ئــەوان رازیـن نـین بـە مـن ئـەوان ئەیانـەوێت کچەکـەیان شـوو بکـات بـە کەسێکی بنەماڵەی دەوڵەمەندی خاوەن بروانامەی بەرز .

نــەنکم : کــاردۆ دوای کــە چاکــەمان خــواردەوە بیــرم بخــەرەوە شتێك بو بهێنم

کاردۆ : باشە نەنە گیان .

کفتەکــەی هێنــدە بــە تــام بــوون بــەو ئێوارەیــە ٤ کفتــەم خــوارد هەسـتم کـرد ئیتـر خەریکـە وورگـم ئەتـەقێ ووتـم بـەخوا ئـەبێ تـا سێ رۆژ هیچ نەخۆم تا وەك خۆم لێ دێتەوە .

کاردۆ : نەنەگیان ووت بیرم بخەرەوە شتێك بۆ بێنم .

نـەنکم : باشـە کـاردۆ گیـان بـا ئـەو شـیرینی و گوڵـە بەرۆژەیـە بێـنم خۆشە بە دەم چا خواردنەوە ئێستا شتەکەش بۆ ئەهێنم .

کـاردۆ: راسـتی هیچـی وا لـە خـەیاڵما نـەبوو کـە نـەنکم بمـداتێ ، بۆیە چاوەرێی شتێکی زۆر گرنگ نەبووم بۆ خۆم بێ .

نـەنکم : کـاردۆ گیـان ئـەم پارەیـت ئـەدەمێ کـە مـردم ئـەبێت ئەمـەم بـۆ بکـەی بـە قوربـانی ئەمـە چـەن سـاڵە فلـس فلـس کـۆم کردۆتـەوە قوربـانی یـەکم بـۆ بکـە بـا خـۆم و حـاجی و دایکـت و خاڵـە رزگارتی تێدا بێت .

ئـەم نەنکـەم چـەنێك سـەیرە هـەمو ژیـانی بـە خـەمی مردنـی یـەوە بردۆتـە سـەر وا بـزانم ئەوەنـدەی گرنگـی داوە بـە مردنـی نێـو هێنـدە گرنگـی بـە ژیـانی نـەداوە ، ئەمـە شـتێکم بیـر ئەخاتـەوە ، ئەگێرنـەوە ئـەڵێن کورێـك بـە سەرخۆشـی ئەچێتـەوە ماڵـەوە کـە ئـەبینێ بـاوکی لەسـەر بەرماڵـەو نـوێژ ئـەکا ، ئـەویش دەسـت ئـەکا بـەگریان ، بـاوکی کـە لـە نوێژەکـە تـەواو ئـەبێت ئەچێتـە لایـەوە ئـەڵی کـورم چـی بـووە بـۆ ئـەگریت ، ئـەویش ئـەڵێت وەڵای باوکـە نـازانم یـا بـۆ خـۆم ئـەگریم یـا بـۆ تـۆ ، ئـەویش ئـەڵێت بـۆ کـورم بـۆ

بۆ مـن ئـەی بـۆ خـۆت بـۆ ،ئـەڵێت سـەیرکە بابـە ئەگـەر ئـەو دنیـا هـەبێت و دیـن راسـت بـێ ئـەوە بـۆ خـۆم ئـەگریم وە مـن فـت ، ئەگـەر ئـەو دنیـاش نـەبێ و دین نـەبێ ئـەوا بۆ تـۆ ئـەگریم تـۆ فـت .جـا ئـەم نەنکـەی منـیش هـەر خـەمی قیامـەت و مردنێتـی بـەخوا ئـەو دنیـا هـەبێ مـن فـت نەشـبێ ئـەوە نـەنکم فت خـۆ ئـەو هـەر بـۆ ئەو دنیا ژیا .

کـاردۆ: نەنـە گیـان تەمـەن درێـژ بیـت بـۆ باسـی شـتی وا ئەکـەیت ئێستا ، بەسەر چاو نەنە گیان خەم نەبێ .

ئـەو شـەوە لەگـەڵ نـەنکم شـتی زۆرمـان ووت سەرگوشـتەی کـۆنی زۆری بـۆ گێرامـەوە . لـە یـەکێ لـە شـتەکانیا ووتـی : ئـەزانی کـاردۆ کـاتی خـۆی بـاپیر لەگـەڵ شـێخ بـوو ئـەو نیشـتیمان و خـاکی زۆر خۆشەویسـت تەنانـەت چاویشـی لـە شـەوێك لـەو شـەوانەی لەگـەڵ شیخ لـە سـەنگەر بـوو لـە سـەرما چـاوێکی کـوێر بـوو دوای ئـەوەش وازی نـەهێنا تـا ئیتـر مەلیکـە بچکـۆل نـەما ئـەو کـات ئەویش پیر بوو توانای نەبوو .

کـاردۆ: ئـەی نەنـە بـۆ شـێخ ئـەو هـەموو موڵـك و سـامانەی هەیـە کەچی ئێمە هیچمان نی یە .

نــەنکم : کــورم بــاپیر بــو خاکەکــەی کــرد ، ئــەوان بــۆ گیرفانیــان کــرد ، هــەر وەك ئەوانــەی ئێســتا ، ئــەزانی کــاردۆ دایــم بــاپیر ئەیوت هەتا ئێمە ساحیبی باگردێن بین نابین بە هیچ .

کاردۆ : بۆ باگردێن نەنە ؟

نــەنکم : ئــاخر ئــەیوت ئێمــە ئەوەتــەی هــەین هــەموو ســاڵێك کــە زســتانمان لــێ دێ ئــەبَی بــەو بارانــە دەبــێ بچینــە ســەربان و سـەربانەکە بمـاڵین بـەو باگردێنـە قورسـە و سـەرتاپا گیانمـان ببێـت بـە پەرەسـێلکە وا تـەر ئـەبین ، سـاڵێ نـەبوو عـەقڵمان بجـوڵێ بلێـین بـا چارەیـەکی تـر بدۆزینـەوە ئەمەنـە نەچینـە سـەربان لـە و بارانـەدا بــا چیتــر بــاگردێن فرێــدەین وچارەیــەکی تربدۆزینــەوە ، بــەخوا کـورم ئـەو راسـتی ئـەکرد ئێمـە هـەموو شـوێنیکمان ئـیش ئـەکا بـەس مێشکمان نەبێ .

کــاردۆ: نەنــە گیــان راســت ئەکــەیت بــەڵاَم ئێمــەش میللــەتێکین دوژمنمان زۆرە .

نــەنکم : کــورم دار کرمــی لــە خــۆی نــەبێ هــیچ نــایرزێنێ ئێمــە ئەوتــەی بــە بیــرم بــێ خۆمــان خــۆرەی خۆمــانین بۆیــە نــابین بــە هیچ.

قســەکانی نــەنکم ڕاســت بــوو زۆر دەمێکــە هــەموو ئــەوە ئــەزانین بــەڵام کەســمان غیرەتــی شۆڕشــێکی ترمــان نــی یــە یــان ئەترســین ئــەمجارەش شــۆڕش کــەین کۆمــەڵی بودەڵــەی تــر بەســە ڕپشــتی ئێمەوە بەرەو لوتکەی نەوت و پارەوە دەسەڵات سەرکەون .

نەنکم : کاردۆ گیان با جێگاکەت بۆ داخەم .

کاردۆ : باشە نەنە گیان .

نەنکم : دە برۆ پشتی یەکەی خۆت بێنە بەقوربان .

کاردۆ خەم نەبێ نەنە ئەو سەرینەم بە هەموو دنیا نادەم .

سەرم کردە سەر سەرینەکەم .

ئــای ســەرین، هــەموو لــە مــن تێگەیشــتن بــە س تــۆ نــا، هــەموو غــەریبیم ئەکــەن. بــەس تــۆ نــا هــەموان خۆشــیان ئــەوێم ،بــەس تــۆ نــا،ئــای لــە تــۆ مــن نــازانم تــۆ ســەرینی لۆکــەی یــا پــەڕی .. یــا بەردی ئەزانی سەرین من هەمیشە بیر ئەکەم .

بــەیانیش لەگــەڵ نــەنکم نــانی بــەیانیم خــوارد جــا لــە مــاڵی نــەنکم هــەر نــانی تیــری هەیــە ئــەو حــەز بــەو نــان و ســەموونانەی ئێســتا ناکــات لــە کــاتی نــان و ماســت خواردنەکــەمان دا ، هــەر هــەمان وەســێتی

دووبــارە کــردەوە ، ووتــم خــەم نــەبێ ئیتــر کــە هاتمــە دەروە ووتــی دە وەرە بــا باوەشــێك پیــا بکــەم نــەکا نەتبینمــەوە ووتــم دە وا مــەڵێ نەنە گیان تەمەن درێژ بیت ئیشەڵا.

بـــەرەو دەوامـــەکم بەرێکـــەوتم . وەك رۆژانـــی دی دەوامـــان بــەرێکرد کــە گەرامــەوە ماڵــەوە ئــەو رۆژە چیتــر نەچوومــە دەرەوە ســەرقاڵی خوێندنــەوە بــووم راســتی دەمێــك بــوو نەمخوێنــدبووەوە مـن زۆر جارکـە ئەمـەوێت ویسـتی خوێندنـەوەی کتێبـی جیـام هەیـە لـــەوەی خـــەڵك ئەیخوێنێتـــەوە چونکـــە ئەگـــەر هـــەر وەك ئـــەوان بخوێنمـــەوە ئـــەو کـــات وەك ئـــەوانیش بیـــر دەکەمـــەوە هەمیشـــە خوێندنــەوە ئەمباتــە ژیــانێکی تــر ئەچمــە جیهــانێکی تــرەوە ئاگــام لــە خــۆم نــامێنێ بۆیــە بــەیانی درەنــگ خەبــەرم بــووەوە کــە گەیشــتمە بەردەم دائیرەکەم نارێم بینی ئەویش ئەو کاتە ئەگەیشتە دەوام .

کاردۆ: بەیانیت باشی نارێ خان چۆنی باشی ؟

نــارێ : مــن باشــم ئــەی تــۆ باشــی ، ئــەوە تــۆش وەك مــن درەنــگ کەوتووی .

کــاردۆ: ئــەرەوەڵا چــی بکــەم درەنــگ خەبــەرم بــووەوە لــە مــاڵی تــەنیایم ئێشــکگر بــووم ئەمشــەو لەگــەڵ کتێــب و تــەنهایی پێکــەوە تــا

بــەیانی بەخەبــەر بــووین ئیتــر کــە چــاووم چــووە خــەو درەنــگ خەبــەرم بــووەوە .ئــەی تــۆ پــێم بڵــێ تــۆ چــۆنی ؟ کێشــەکان چارەسەر بوون ؟

نــاریێ : کێشــەی چــی ، شــکور لــە خــوا بــەزیاد بێــت هــیچ کیشــەم نــی یە ، کوا کێشەی چی ؟

کاردۆ: ئەوەی هاوسەرەکەت ئەڵێم .

نــاریێ : بڵــی لەگــەڵ دڵەکــەت ، نــا شــکور لــە خــوا بــەزیاد بێــت هــیچ کێشەیەکمان نی یە و یەکمان زۆر خۆشەوێت ، بەساقەی بم .

هــەر کــات مــرۆڤ بــەم جــۆرەی ئــەم بیــرەی کــردەوە ئــەوا یــان درۆ لەگــەڵ خــۆی دەکــا یــان لەگــەڵ هاوســەرەکەی یــان لەگــەڵ تــۆ ، گرنــگ کەســەکە دەرونــی نەخۆشــە دەنــا ئــەوەی ئــەو رۆژە ئــەو ئــەیوت زۆر جیایــە لەمــەی ئێســتای ئەمــە نیشــانەی خــۆ نەناســینە نیشانەی ونبونە .

کاردۆ: دەی لە خوا بەزیاد بێت گرنگ تۆ خۆشبەخت بیت .

ئەونـدەم زانــی مـن بــێ مێشـکم کـە کـاتی خـۆم و بیـری خـۆم بــە مرۆڤــی لــەو جـۆرە بەســەر ئەبــەم ، ئــاخر بۆیــە نــابین بــە هــیچ کاتەکانمان لە سەرابدا وون دەکەین .

کــە چوومــە ســەرەوە هێلـین لــەوێ بـوو ، راسـتی یەکـەی سـەرم سورما ووتم ئەوە چی ئەکەی لێرە .

هێلـین : کـاردۆ ببـورە کـە وا هـاتم بـەس بـەخوا پێویسـت بـوو روو بــە روو قســەت لەگــەڵ بکــەم ، شــتێکی گــرنگم هەیــە ، زۆر بێتاقـەتم نـەم ئـەزانی چـی بکـەم پـێم بـاش بـوو خـۆت ببیـنم ببـورە تکایە .

کـاردۆ: قـەینا ئاسـایی یـە ، چـی بـوە پـێم بڵـێ بـۆ وا چاوەکـان سـوور بوون ؟ هەستە با بچینە کافتریاکە باشترە .

هێلـین : کـاردۆ گیـان ئێمـە بـە تـەماین هـەمووومان سـەفەر بکـەین بـۆ دەروەی وڵات وە نەگەرێینــەوە ئەمــە بریــاری بــاوکم نــازانم چــی بکەم خەریکە شێت ئەبم .

کاردۆ : بۆ کوێ ؟

هێلــین : بــۆ دەروەی وڵات ، بــاوکم ئــەڵی ئێــرە کــەڵکی نــەماوە تــەواو ئــەبێ بــرۆین لێــرە ئیتــر ئــەوان بریاریــان داوە تــەواو ئێســتا لە خۆ ئامادەکردندان ماوەیەکی کە م و ئیتر ئەبێ برۆین .

کــاردۆ : باشــە ئاســانە ،مــن جــاریکی کــە هێمــەوە داوات ئــەو کــات تۆ نارۆیت بروا ناکەم ئەمجارەش نارازی بن .

ئــەم کۆچــە نەگریســە چــەن دڵــی ئــاوارە کــردووەو چــەن رۆحــی تۆرانـدووە چـەن منـاڵی بێنـاز کـردووەو چـەن جـەرگی بریـوە ئـاخر ئەگــەر ئێمــەش نیشــتیمانێکی جوانمــان هەبوایــە ئــەم خەڵکــە بــۆ ئــەرۆی بــۆ غــەریبی بــۆ ئەمەنــە ئاســانە مــرۆڤ لــەو پێگەیــەی خــۆی هەڵکــەنرێ کــاتێ لــە لانــەی خــۆت نــەمێنی  زۆر شــت ئـەدۆرێنی راسـتە کۆمـەڵی شـتی نـوێ ئـەبینێ بـەڵام زۆرێکـیش لـە دەست ئەدات غەریبی .

هێلــین : بــەڵام مــن ئەترســم زۆر ، ئەترســم ئــەمجارەش رازی نـەبن ، چـی بکـەم ئەگـەر رازی نـەبن شـێت ئـەبم بـە خـوا ئـەمرم پێم بڵێ چی بکەم ؟.

کــاردۆ: باشـــە مــن تێناگــەم ئــەم باوکـــەی تــۆ چـــی ئــەوێت ؟ مــن هەوڵئــەدەم خــەم نــەبێ ئــەمجارە خــۆم ئــەچم قســەی لەگــەڵ ئەکــەم هەوڵ ئەدەم هەموو شتێکی بە شێوەیەکی باش تێبگەیەنم .

ئــەوەی کــە هەمیشــە لێــی ئەترســام کــە جــارێکی تــر پارچــە پارچــە ببمـــەوە ســـاڵانێکی زۆر تـــا خـــۆم کـــۆکردەوە ، مـــن نەمەویســـت هــەرگیز ئیتــر وا بەســتەی کەســێکی تــر بــم نەمەویســت هــۆگری هــیچ خۆشەویســتی یــەك بــبم لــە لێــدانی دڵــم ئەترســام ، ئــازاری جــودایی زۆرە و برینەکەشــی قــەت ســارێژ نــابێ ، نــازانم بــۆ خــۆم خستەوە ئــەم گێــژاوە ، هــەرچی پیــا تێپــەر ئــەبم لــە ژیانــدا وام لــێ دەکات تەنیایم لا شیرینتر بێت .

هێلــین : باشــە کــاردۆ گیــان مــن ئــەبێ بــرۆم دوای قســە ئەکەینــەوە بەس تکایە بیر بکەرەوە هەوڵ بدە شتێك بکەیت .

کــاردۆ : باشــە مــن قســە لەگــەڵ باوکــت ئەکــەم بــزانم چــی ئــەبێت ئــەچم بــۆ لای بــۆ زانکــۆ دڵنیــام گــوێم بــۆ ئــەگرێ تــۆ بــێ خــەم بــە هەموو شتێ باش ئەبێ دڵنیا بە .

نــازانم چــی بکــەم بەهــەر حــاڵ ئــەبێ هــەوڵ بــدەم ئــەم شــتەش هــەر وا نــامێنی هــەر شــتێ ســەرەتایی هــەبوو بــە دڵنیــایی کۆتــایی هەیــە

.ئــێ خــۆ ئــەم شــتەی ئێمــەش نــابێ لــەم دۆخــەیا بمێنێتــەوە بــەڵام کێشــەی ئــەوەمان هەیــە ئــەبێ بــە چ لایەکــدا بکــەوێ ویســتی خۆمــان چــی یــەو و چیمــان دەوێ و ئــاخۆ ئــەوەی ئێمــە بمانــەوێ بێتــە دی راســتی یەکــەی بێتاقــەت بــووم بــە وەزعەکــە بۆیــە هــەموو ئــەو رۆژە ئاکــام لــێ نــەبوو چــی ئــەگوزەرێ هــەر بیــرم ئــەکردەوە لــەکوێ وە دەســت پــێ بکــەم چــی بکــەم تەنانــەت ئەمویســت دەســت بەمــە تەلەفونەکــەم و قســەیەك لەگــەڵ هێلــین بکــەم ئەوەشــم نــەتوانی ویســتی چوونــە دەروەشــم نــەما بــوو لەگــەڵ تــەنیایم باوەشــمان کردبــوو بــە یــەکا مێشــکم تێــك ترنجــا بــوو لــە لایــەك ویســت و لــە لایەك ترس تیامدا کۆبونەوە .

منێـك كـە هـەموو خەونـەكانم ئـەوەبوون بگـەم بـە هێلـین یـان بگـەم بـە هێمنـی و خێـزان ، ئێسـتا كـە گەیشـتم پـێم بڵـێ چـی بكـەم ئـەی كـە نەگەیشـتم چـی بكـەم ئـای لـەم داهـاتووە چـۆن تـویغی ئێسـتای بردوین وامام لێ هاتووە تامی هیچی ئێستام بۆ ناكرێ .

لە ماڵی تەنیایم ، خەفەتبارانە ئەمشەو."

مـن بەراسـتی هـەنێك جـار عاشـقی نوسـتن ئـەبم لەبەرئـەوەی جیـام ئەكاتەوە لە هەموو ئازارێك .

ئـەمرۆ نـاچم بـۆ دەوام تاقـەتی بینینـی کەسـم نـی یـە ئەمـەوێ لـەناو جێگاکەم نەیەمە دەرێ حەزەکەم هەر لێرەدا بمرم .

حەزدەکـەم ئێسـتا پـر بـە گـەروم هـاوار بکـەم و بـەو عالەمـە بڵـێم جـێم بـێڵن لـەم سـەرابە جوانـەدا مـن تینوێتیـەکانی ئێـرەم لـە کانیـاو رووبارەکانی ئێوە پێ چاککترە .

جێم بێڵن بـا تـەنیا بمـرم تـەنیا سـەفەر کـەم تـەنیا لـە نـاو ئـەم ئـاگرەدا مـن ئـەم جەهەننەمـەم لـە بەهەشـتەکانی ئێـوە پـێ خۆشـترەهێندە بـۆ رووناکیتـان رۆشـتم تـا بنـی پێکـانم هـەمووی سـوتاهێندە چـاوەرێی باوەشـێکی پـر میهرتـان بـووم تـا وام لێهـات لـە خۆشـم وون بـووم تـەنیا جـێم بـێلن ، تـەنیایی بـێ منتـرین شـتە کـە مـرۆڤ بـە دەسـتی بێنیـت لەبـەر ئـەوەی پێویسـتی بـە کـەس نـی یـە بـۆ بـەدی هێنـانی ، ئـاخر لێـرە هێنـدە ئـەتکوژن هێنـدە دڵـت دەردێـنن و ئـەتمرێنن خـۆت مردنی خۆت پێ خۆشترە ...

تـەواو بێـزار بـووم ئـاخۆ هـی ئـەوە بـێ کـە ئەترسم لـە داهـاتوو یـان ئەترسم لە لەدەست دانی هێلین یان لە دەست دانی خۆم .

لـــەم ئـــازارە زۆرە مـــدا بیـــری شـــارام دەکەوێتـــەوە هێنـــدەی تـــر ئازارەکـانم زیـا ئـەکا مـن ئەبوایـە کـە کـاتی خـۆی دەسـتم سـووتا

جــارێکی تــر دەســت بــۆ ئــاگر نەبــەم ، لەوانەشــە ئەمــە تۆڵــەی هــەموو ئــەو شــۆخانە بــێ کــە مــن دڵــم شــکاندبن ، ئــەی بــە بیــر نایــە گوڵالــە چــەنێکی خۆشەویســتی بــێ ئــەوەی پێــی بڵێــی مــاڵ ئــەوا لــە دوای دوو مـــاچ رۆیشــتیت و ئاورێکــت لــێ نــەداوە ئــەی نەشــمیل چـــەنێك حـــەزی ئـــەکرد پێکـــەوە هاوســـەرگیری بکـــەن تـــۆ هـــەر ئــەتووت نــا مــن پــارەم نــی یــە ئــەی روونــاك ئــەی ئەوانــەی تــر ، ئــەی بــۆ تــۆ وا ئــەزانی ئــەو دڵانــە ترپــەیان نــی یــە ، وا ئــەزانی ئەوانـــە هێلانـــە چۆلەکـــە لـــە ناخیانـــا بەچکـــەی خۆشەویســـتی نــەکردووە ، تــۆ نــازانی ئەوانــە چــەن ناســك بــوون تــۆ چــەنێك ئــازارت دان نــەت ئــەزانی هــەر شــۆخێ دڵــێ بشــکێ تــازە چــاك نابێتەوە .

بــەڵام خــۆ ئــەوەش بــە تــەنها تــاوانی مــن نــی یــە ئــەی مــن پـــەروەردەی ئـــەم کۆمـــەڵگاو ئـــەم دایـــك بـــاوك و قوتابخانانـــەم ، منـیش وەچـەی ئـەم نیشـتیمانەم بـاش بـم یـان خـراپ بـم تـاوانی خـۆم نــی یــە بــە تــەنها ، ئــەی خــۆ کــە مــن هاتمــە ئــەم دنیایــەوە کەســێ نــەبوو پرســم پــێ بکــا کەســێ نــەبوو رێگایــەکی راســتم نیشــان بــدا ، بــۆ ئــەبێ پــەتی سـێدارە ئامـادە بـێ بـۆ مـن بـەڵام هـەموو ئەوانـەی منیــان بــەم جــۆرە خــەڵق کــرد تەماشــاکەری مــردنم بــن بــۆ ئــەبێ

پەروەردەکـەرانی مـن لەسـەر هـەورەکان سـەما بکـەن و منـیش لێرەوە بە شەلاق لێم بدرێ .

بچمـە دەروە بـەم تـاریکی یـە بـە تـەنیا کـەمێ پیاسـە بکـەم باشـترە خەریکـە دڵـم لـەناو سـنگما دەردێ ، وام لێهـاتووە خـۆم لـێ بۆتـە کەسێکی تر هێندەم قسە لەگەڵ خۆم کرد خەریکە خۆم ناناسم .

ئـای چـەنێك گـەرام بـەم کوچـە تاریکانـەدا بـە تـەنیایی چـەنێك گـوزەرم کـرد لـەم کۆڵانـە تەسـکانە ، چـەنێك شـەوانی پـر تـەنهایم بـەرێکرد چـەنێك رۆژانـی پـر مانـدوێتی و حەسـرەتم دایـە دەسـتی زەمانـە ، چـەنێك ئەسـتێرە جێیـان هێشـتم تاریـك وتـەنهایان کـردم چەنـد هێشـووە تـرێ بوونـە مێـوژو فریـای نەکـەوتم گـازێکی لـی بگـرم لـەناو ئـەم رووبـارە سـازگارانەدا ئەمەنـدەم ماسـی لـێ جێمـا تـا تـۆر لـێم زیـز بـوو ، ئـەو پۆرانـەی ئەهاتنـە لام ئەیویسـت بریسـێتیم بشـکێنێ بـەڵام مـن هەمیشـە بـە بـەزەی بـووم ئـازادم ئـەکردن بـە ژمـارەی هـەموو نێرگزەکـان گـوڵم بینـی و پەنجـەم پـەی پـێ نـەبرد پـر پـر بـەم مشـتەکانم وەنەوشـەو یاسـمین و لاولاوم جێهێشـت بـە خـوا مـن بـزانم ئـەم پێکـەنین و گریـان و حەزو عەشقەی من لە هیچ مەملەکەتێ جێگەی نابێ .

نــازانم چــی بکــەم ســر بــووم مــات بــووم ، هــیچ شــوێنێکی مێشــکم ئیش ناکات .

هــەر بــەدەم بیرکردنــەوەوە بــەرەو گۆرســتانەکە بــەرێ کــەوتم ، زۆر جــار هاورێکــانم پێیــان ئــەووتم تــۆ ناترســی بــە شــەو بــە نــاو گۆرســتانا گــوزەر ئەکــەی ، منــیش هــەموو جــار پێیــان ئــەڵێم بــۆ هــیچ شــوێنێك هەیــە هێنــدەی گۆرســتان ئــارامی و دڵنیــایی تێــدا بــێ ئــەوەی لــەوێ یــە قســە ناکــا ســەیر ناکــا هــیچ نــاڵێ تەنانــەت تەماشاش ناکا لەوێ پر ئەبی لە تەنیایی و خەیال .

لەســـەر گۆرەکـــەی دایکـــم وەك هـــەموو جـــار دانیشـــتم بـــەڵام ئــەمجارەش دایکــم هــەر لــە تــەم دەچــێ دێــت و دەروا .. دەروا و دێ تارمــایی ئــەو ئــەو لــە نێــو چاوەکانمایــە ، نەخشــی دەکــەم رەنگــی دەکــەم کــەچی ... هــەر وێنــەی ئــەوم پــێ ناکێشــرێ مــن ئێسـتا دایکـم لـێ بۆتـە خـەون .. لـێم بۆتـە هـەور .. بـاران .. خـۆر دایکــم وەك بــەفرە وەك نــان وەك ئــاوە هــەموو شــتەکانم بــەرن .. بەس جارێك دایکم بەنێ ...

هــیچم پــێ نــەماوە ووشــەکانم نــەبێ ئــەوانیش هــیچ ســودێکیان نــەماوە ، ئــای ووشــە بــێ بۆنــەکانم تەمــەن وا جێمــان دێڵــی و

ئێـوەش نەتاندوانـدم  تاڵـە کـانی قـژم هـەمووی سـپی کـرد بـە دیـار رەشـــی ئێـــوەوە  نە ئێـــوە ...شـــیعرێکی نوێتـــان بـــۆ چنـــیم  نە منـیش...عاشـقانە هەڵـوەریم بۆتـان   پـێ ئـەچێ ئەمشـەو ئێـوەش بـۆ ئـــازاردانی مـــن هـــاتبن خۆتـــان و  یادگاریـــەکانتان ئـــازارم ئـــەدەن ئێـوە هێشـتا نـازانن لـەم وڵاتـەی منـدا خۆشەویسـتەکان هەمیشـە ئـاودانی گوڵـەکانیان بیـر ئـەچێ ، لـەم وڵاتـەدا لەگـەڵ ئـەم خەڵکـەدا چیتر ووشە سوودی نەما ...

دایکـە وا رۆژ بـووەوە .دایکـە دە بڵـێ بـەیانیت بـاش  بڵـێ بـەیانیت خراپ  بلێ دەرد شتێك بَڵێ  تا بزانم  ماوم و نەمردووم  ....

ئـاوا بـروا ئیتـر ژیـانم بـۆ بـەرێ نـاکرێ لاوازی ئـەمکوژێت . ئـای دایکـە گیـان ئـەو ئـەو دەمـەی منـیش دەمـرم کەسـێک نییـە چـاوەڕێم بێـت ، ڕێگایـەک نـامێنێ ئاشـنابێت بـە هـەنگاوەکانم ، تروسـکایەك نی یە لای تۆم نیشان بدات .

ئـەم بیرکردنـەوەو خـەم هەڵگرتنانـە سـوودی نـی یـە ئـەبێ بـەیانی بچمـە لای بـاوکی هێلـین ئـەمجارە ئەمـەوێ خـۆم قسـەی لەگـەڵ بکـەم مـن تێناگـەم بـۆ کـاتێ ئـەبێ تـۆ بچیتـە داخـوازی کچـێ بـاوك و مام بەری ئێ خۆ ئەبێ ئەوان تۆ بناسن نەك باوك و مام .

کــە رۆژ هاتــە دەرو زەردەی دا بــە ســەر باخەکــەدا لــە کڵــەو رۆژنەکانــەوە پرچــەکانی هــەتاو ئەهاتــە خــواری هاتمــە دەرەوە لــە مــاڵ و بــەرێ کــەوتم بــەرەو زانکــۆ کــە بــاوکی هێلــین لــەوێ مامۆستای زانکۆ بوو .

سـەرەتا کـە چوومـە ژورەوە زۆر رێـزی لێگـرتم نـەی ئـەزانی مـن کــێم و بــۆچی هــاتووم ، چوومــە ژورەکــەی و لەســە کورســی بەردەم مێزەکەی دانیشتم .

کـاردۆ: ببـورە لـە کـاتی بەرێزیشـت ئـەگرم جـەنابت مـن ناناسـی بـە دڵنیایی ؟

باوکی هێلین : بەخێربێت نەخێر ، فەرموو دانیشە .

کـاردۆ: راسـتی یەکـەی مـن کـوری کـاك ئەحمـەدم ئـەوەی تەکسـی یەکــەی پــێ یــە ، ئەگــەر بــە بیــرت بێــت پارهاتینــە داواوی هێلــین خانی کچت .

کــە وام ووت ئیتــر روخســارەکەی تــری دەرکــەوت ئــەتووت بــە کۆنترۆڵ ئـەم دەم و چـاوە پـر میهـر و رێـز و بـەزەیی یـە گـۆرا بـۆ رق و کینەو بوخز گەر پێشتر ئاو بمدیایە هەر نەچوومە لای.

باوکی هێلین : ئەی جەناب بۆ هاتووی بۆ ئێرە بۆ لای من ئێمە نەمانووت نایدەین ، وەڵامی کۆتاییمان نەدانێ باوکەکەم .

کاردۆ: راستی یەکەی ، ووتم نەکا باوکم نەیتوانیبێ من باش بناسێنێ بە جەناب ئەو کابرایەکی سادەو ساکارە لە سادەیی خۆیەوە بۆ شتەکان ئەروانێت ، ووتم با خۆم بێم قسەت لەگەڵ بکەم تا زیاتر بمناسیت و بتوانین لەسەر بابەتی هاوسەرگیری من و هێلین قسە بکەین ئەگەر بەرێزت کاتت هەبێت .

باوکی هێلین هەستایە سەر پێ و بە دەم و چاوێکی تێك ترشاوی تورەوە رو کرد بەو دیوودا ووتی : من هیچ قسەیەکم نی یە بیڵێم لەسەر ئەو مەوزعە ئەو بابەتە لای ئێمە کۆتایی پێهاتووە وە نامەوێ گوێم لەو شتە بێتەوە ئەگەر ئیشَیك نەماوە من وانەم هەیە ئەبێ برۆم .

کاردۆ : راستی نەخێر هەر تەنها بۆ ئەوە هاتووم بەڵام تکایە من ئەمەوێت تێ بگەم بۆ بەم شێوەیە جەنابتان رقتان لێمە خۆ ئێوە من ناناسن نازانن باشم یا خراپ ، تۆ تەنانەت نازانی من چی ئەکەم و کێم و کێ نیم .

دانیشـتەوەو زانــی ئـاوا سـوودی نــی یـە روی یـەکی تـری خسـتەکار دەمامکەکــەی گــۆری بــە دەمــامکێکی رێــوی ئاســا و رووی هێــنم کــردەوەو و وەك ئــەوەی فریشــتەکان لای ئــەم میــوان بــن دانیشــت و بــەهێمنی پــێ ی ووتــم : گــویێ بگــرە کــورم ، ئێمــە دوو خێزانــی زۆر جیــاوازین لــە یــەك ، پلــەو پایــەمان جیــاوازی زۆری هەیــە بــــاری ئــــابوری و کۆمەڵایــــەتیمان جیــــاوازە تەنانــــەت شــــوێنی هەســـتان و خەوتنیشـــمان جیـــاوازە ، ئەســـتەمە ئـــەم دوو خێزانـــە پێکــەوە کــۆ ببنــەوە تەنانــەت دوو جــۆر پــەروەردەی جیــاواز ، بــروا بکــە مــن زیــاتر دنیــام بینیــوە زەواج تــەنها قســەی خــۆش و نــان خـــواردن نـــی یـــە ئێمـــە ش مانـــدوو ئەکـــەن بـــە خۆتانـــەوە ، ئـــەو دۆخــەی ئێســتا هێلینیــی تیــدا دەژی زۆر ئەســتەمە تــۆ بتــوانی بــۆی دابـین بکـەی ، خێزانــی ئێمــە تــەنها تێکــەڵی خــاوەن بروانامــە بــەرز و دەوڵەمەنــدەکانین تــۆ چــووزانی ئەتــەکێتی ئــەم ژیانــە چۆنــە ،مــن نامــەوێ کچەکــەم بخەمــە دۆخێکــی قورســەوە ئــەو کــات تــۆ یــان هەســـت بـــە کـــەمی دەکـــەی یـــان هـــیلاك دەبـــی لـــە راگرتنـــی مامەڵەکانـدا ، سـەیرکە مـرۆڤ کـاتێ زەواج دەکـا بـە تـەنها کچەکـە گرنــگ نــی یــە دەبــێ خێزانــەکانیش نزیــك ئاســتی یــەك بــن تــا بتــوانن ئاســایی مامەڵــە بکــەن پێکــەوە تەنانــەت جــل و بەرگەکانیشــمان زۆر دوورن لە یەکەوە .

كــاردۆ : ئەمانــەی تــۆ ئــەیڵێیت راســتە بــۆ كەسـێكی نــەفامی بــێ روشــنبیری ، بــۆ كەســی دەرون لاواز ئەمانــە راســتن بــۆ كەســی تێنەگەیشــتوو لــە ژیــان و هاوســەرگیری راســتن ، ئەمانــەی تــۆ ئــەیڵێیت هــەموو دروســت كــراوی وەهمــی مێشـكی ئێوەیــە دەنــا لای ئێمــە جیــاوازی نــی یــە لــە نێــوان مرۆڤــەكان وە مــن كاتێـك هێلیـنم خــۆش ویسـتووە بــە بــێ عــەقڵی ئــەوەم نــەكردوە مــن هــەرزەكار نــیم بــەڵام مــن خــۆم بــە مرۆڤێكــی بەرەوشــت و رۆشــنبیر و عاقــل دانــاوە كــە ئــەتوانم بەختــەوەری ببەخشــم بــە هێلـین دڵنیـا بــە قوربــان بەختــەوەری پــارەو پلــەی خوێنــدن و پلــەی كۆمەڵایــەتی نــی یــە ئــەوەی بــۆ تــۆ هەڵكــەوتووە لــە ژیانتــا ئــەوە ژیــان ئــەو چانســەی پێـداویت دەنـا تـۆش هـەر وەك مـن دەرەچویـت ئیتـر ئەمـە ئازایـەتی یـە ك نـی یـە خـۆت پچرانـدبێت لـە ژیانتـا لەگـەڵ ئەوەشـدا هـەموو ئەمانــەی تــۆ ئــەیڵێیت لای مــن قســەی بــەتاڵن ، مــن و هێلــین یــەكمان خــۆش ئــەوێت ئــەوەش هــەموو ئــەو شـتانەی تـۆ ئــەیڵێت بــەتاڵی دەكاتــەوە ، كــاتێ مــن لــە خۆشەویســتی هێلــین ئــازار بچێـژم ئـەوە خۆشـبەختی یـە بـۆ مـن نـەك ئـازار بـەڵكو ئـازاری مـن ئـەو كـات دەسـت پـێ ئـەكات كـە دوور بـم لـە هێلـین ، مـن ئـەوەی ئەمــەوێ لــە هێلــین نــاخی پــاكێتی دوای ئــەوە پلــەو پایــەو پــارە لای تــۆ گرنگــە لای مــن ئەوانــە هــەمووی دروســت كــراوی دەســتی

مـرۆڤن ئەوانــە خــەیاڵیکی پـوچی دۆراون ، مـرۆڤ بــە نــاخی پـاکی یـەوە جوانــە ئــەو شـتانەی تـۆ ئــەیڵێت من لێیـان ناترسم ئــەزانی بـۆ ، چونکــە مــن ناترســم ئێــوە چـــی ئـــەڵێن بـــاش بزانـــە ئەگـــەر نەترسـیت لــەوەی کــە خــەڵکی دەیڵـێن، ئــەوا تــۆ قۆنــاغی یەکــەمی ســەرکەوتنت بریـوە منـیش قـەت ئـەم شـتانەی تـۆ ئـەیڵێیت گرفـت نــەبوون لام ،دوای ئــەوە قوربــان مــەرج نــی یــە مـن هــەموو ئــەو سـیفەتانەم هــەبێت کــە جــەنابتان بــە دڵتــان بێـت ، مــەرج نـــی یــە مـرۆڤ هــەمووی باشــی بێـت پاشــان کەسـێك لەبەر باشـیەکانم منــی بـــــوێ مـــــن هەر نامەوێـــــت ، مـــــن کەســـــێکم دەوێـــــت، بەخراپیەکانیشــەوە منــی بوێـت ، کەسـێکم ئــەوێت منــی بوێـت وەك ئەوەی کە هەم نەك وەك ئەوەی ئەو دەیەوێت .

ئەمــەی مـن داوای ئەکــەم لــە جــەنابتان هاوســەرگیری یــە پێکــەوە نــانی ژیــانی دوو کەســە ئەمــە دروســت کردنــی بەرژەوەنـدی نــی یـە تــا تـۆ بیـر لـەو شـتانە بکەیتـەوە لــە هاوسـەرگیری کچەکەتــەوە ســـوود بـــە تـــۆ و کچەکـــەت بگەیـــەنێت دوای ئـــەوە بـــروا بکـــە گەنــدەڵترین کەســـانێک لە نـــاو کۆمەڵگـــادا هەرئەوانەن کە بیــر لەو بەرژەوەنــدیانە دەکەنەوە کە تەنهـــا ســـوود بە خۆیـــان دەگەیەنێــت و ئەوانــی تـر لێـی زەرەرمەنـد دەبـن تـۆش لات گرنـگ نـی یـە مـن و

هێلـین زەرەمەنـد بـین بـەڵام تـۆ ئەتـەوێت تـەنها تـۆ سـوود مەنـد بیـت من تێناگەم لەم بیرکردنەوانەی تۆ ببورە لێم.

ئیتـــر لـــەوە ئـــەچوو ئـــەو دەمامکـــە ســـوودی نـــەبوبێ رووە راســـتەقینەکەی دەرخســـتو بـــە تـــورەیی یـــەکی زۆرەوە  بـــە یـــەك ووشە ووتی برۆ دەرەوە جارێکی تریش نەیەیتەوە بەردەمم .

کـاردۆ: مـن ئـەرۆم بـەڵام دڵنیابـە کـۆڵ نـادەم حەزەکـەم شـتێکیش پـێ بڵـیم تـۆ زۆر حەزەکـەی رێنمـوینی خـەڵك بکـەی چـۆن بـژی بـەڵام ئـەوە بزانـە لە هەر کەسـێکەوە دەسـت پێبکەیـت، فکرەیەکـی پێیە بۆ ئەوەی پێت بڵیت تۆ چۆن بژیت..!، بەڵام تۆ خۆت هیچ بیرۆکەیـەکی باشـت پـێ نـی یە بـۆ ئەوەی بزانـی خـۆت چـۆن بژیت لە ژیاندا..!؟

بەراسـتی  پێویسـتە لەگـەڵ مرۆڤـەکان بـە هێنـدێك میهرەبـان بیـت لـە پاشـان تەمـەنێك نەبەیتـە سـەر تـا تـێ بگەیـەنی تـۆ گێـل نیـت منـیش ئەبوایـە بـەو شـێوەیە وەڵامـی بـاوکی هێلـین بەمـەوە تـا تێبگـات مـرۆڤ هـەر مرۆڤـە جیاوازی نـی یـە لـە نێـوان مرۆڤـەکان .

هاتمـــــە دەروە زۆر بیتاقـــەت بـــووم ، تەلـــەفونیکم بـــۆ هـــات ، ژمارەکـەی خـالّم بـوو ، وەڵام نەدایـەوە زۆر بێتاقـەت بـووم ووتـم کـەی وەختـی ئـەم بەشـەرەیە ، دواتـر سـێ جـاری تـر کـردی ، ناچـار هـەڵمگرت ، بریـا هەڵمنەگرتایـە نـازانم بـۆ ئـەبێ هـەموو نەگبەتی یەکان پێکەوە کۆ ببنەوە .

خـالمَ : کـاردۆ ئـەوە بـۆ جـواب نایەیتـەوە ؟ هـەر ئێسـتا وەرە بـۆ مزگەوتەکەی لای ماڵی دایکم .

کاردۆ : بۆ چی بووە ؟ خێرە خاڵە چی یە تۆ پێم بڵێ .

زۆر بـێ هەسـت و بـێ قیمەتانـە یەکسـەر ووتـی دایکـم مـردووە ئێستا ئەیشۆین ، خیرا وەر ئەوێ .

ئیتـر نـازانم ، کامیـان هـەڵبژێرم خـەمی مردنـی نـەنکم یـان وەڵامـە قێزەونەکانی مامۆستای زانکۆ یان بێ هەستی یەکەی خاڵم .

بەرێکـەوتم بـۆ مزگـەوت بـەڵام بـە دڵیکـی پـر لـە حەسـرەت و چـاوێکی پـر لـە گریـان ، لـەو کاتـەدا بـوو هێلـین تەلـەفونی بـۆ کـردم نـەمتوانی وەڵامـی بدەمـەوە ئەترسـام لـە لەدەسـت دانـی ئەترسـام لـە نەبینینـــەوەی ئـــەوەتا ئیتـــر نەنکیشـــم نابینمـــەوە دوای ئـــەوە بـــا

نـــەزانێ دڵ تـــەنگم چونکـــە کاتێـــک کەدڵ تەنـــگە دەبـــم ئـــەو هـــۆی دڵتەنگـیەکەم لـێ بپرسـێ هێنـدەی تـر دڵتـەنگی یەکـەم زیـاد دەکـات کاتێک نەتوانم هۆی دڵتەنگیەکەمی پێ بلێم .

ئـــای دنیـــا هەنـــدێک لـــەو کەســـانەی کـــە خۆشـــتەوێن لەژیانتـــا دەڕۆن و جێـــت دەهـــێلن .. تـــەنها بـــۆ ئـــەوەی بـــۆت بســـەلمێنن کەهەمیشە شتێک هەیە بۆئەوەی لەدەستی بدەی .

کـە گەیشـتمە مزگەوتەکـە سـەرم کـردە سـەر تابوتەکـەی نـەنکم و پـێم ووت نەنـە گیـان رۆشـتنەکەت ئەوەنـدە بـە پەلـەبوو ...خۆتـت لـــەبیرچوو لـــەدڵی منـــدا ، بـــۆنی مێخـــەك و گوڵاوەکـــەت نـــاو سـنگیان پـر کـردم بـۆنی دایکیشـم لـەتۆدا ئـەکرد ئەمویسـت منـیش لەگەڵتا بمرم .

نەنـــە گیـــان ئـــەزانی تـــۆ بـــۆ مـــن چـــی بـــووی ، دایـــك و بـــاوك و خوشـك و بـرا تـۆ هـەموو وێنـەو یادگـاری و تامـە راستە قینـەکانی من بووی .

بـــەرەو گۆرســـتان بـــۆ لای هـــاورێ هەمیشـــەیی یـــەکانم بـــەرێ کـــەوتین لـــە تەنیشـــت گـــۆری دایکـــم شـــوێنێکیان حـــازر کردبـــوو

رووم کـــردە گۆرەکـــەی دایکـــم و پـــێم ووت دایـــە گیـــان .. لـــە سەفەرتا میوانێك دیتە لات  شێوەی لە خۆت ئەچێ  ...

رەنگـە بۆنیشـی وەك مـن بـێ ...رەنگـە سۆزیشـی بـۆ تـۆ لـە مـن زیاتر بێ  ...

باوەشـێکی گـەرمی بـەرێ ..  بـا تـەنیا نـەبێ ...پێکـەنینێنکی بـۆ بکـە دیـاری بـا غـەمگین نـەبێ ....دایـە گیـان .. لـە وەنـەوزا .. لای لایـەت لـە بیـر بـێ ..لـە سـەحەردا توێشـوی ئـەو لـە بیـر نـەچێ..ئـەو میوانـە ...رەنگـی بارانـە لای تـۆ ئـەبارێ ..ئـەو میوانـە .. بـۆنی هـەورە بـەلاتا تێپـەر دەبـێ ...ئـەو میوانـە دەنگـی دەریایـە لـە کەنارتا لەنگەر دەگرێ .

دایـە گیـان لـە بیـرت بـێ ...لـە باوەشـی کـەی تـا هـەرگیز بـێ نـاز نەبێ ...

ئـەزانی دایـە ئـەو میوانـە کـێ یـە ...ئـەوە نەنکمـە ئێسـتا  بـۆنی منـی لێ دێ

.... هەرچـەن سـەیری گۆرەکـەیم  ئـەکرد مـرۆڤم زیـاتر لەبـەر چـاو ئەکـەوت سـەیرکە ئـەم هـەموو فیـزوو خـۆ بـەزڵ زانینـەی

مـرۆڤ لـە کۆتایشـدا لـە نێـو ئـەم مـەترە گڵـەدا دانـرێ کـە نـاتوانی بـە ئاسـانیش سـەر پشـت بکـەوێ ، ئەبوایـە گـۆر زۆر فـراوان و خـۆش بوایـە خـۆ مـرۆڤ زۆرتـری بـوونی لـە گـۆردا بەسـەر ئـەبا کەچی نازانم بۆ وا سامناك و تەسکی دەکەن .

وەك هەمیشـە مـن حـەزم ئـەکرد بـە لاشـەش بـێ نـەنکم لام بمێنـێ بـەڵام هـەمان شـێوەی بـە جێهیشـتنی خۆشەویسـتان ئـەیانووت رەحمـەتی خواتـان لـێ بێـت زوو بیخەنـە گـۆرەوە ، وەك ئـەوەی نـەنکم بێـت ئـەم سـەر زەمینـەی کـاول کردبـێ ئـاخر کـەی ئەمـە راسـتە مـن ئەمویسـت بـە ئـاوازێکی کـۆن و وێنەیـەکی دەسـتی خـۆم لەگـەڵ بـۆن و بـەرامی میخـەك و گـوڵاو نـەنکم بـەرێ بکـەم ئەمویسـت دوو ووشـەی بـۆ بنوسسـم بیباتـە گۆرەکەیـەوە تـا لـە تەنهاییدا بیخوێنێتەوە .

ناشـتمان بـەڵی ئـەویش جێیهێشـتم و تـەنیایی زیـاتر بـووە هـاورێم زیـاتر لـێم نزیـك بـوەوە فرمێسـك سـەر گۆناکـانی جێناهێشـتم ئێسـتاش بـۆنی سەرپۆشـەکەی لـە نـاو مێشـك و سـنگمدایە بـەلکۆ بـەو جێگەیـە گەیشـتبێ کـە ئـاواتی پـێ ئەخواسـت ئێسـتا ئـەزانم ئەو ئەروات و پێمان ئەڵێت :

جـێم بـێلن لــەم گـۆرە تاریکــەدا ، مــن ... تینوێتیــەکانی ئێــرەم لــە کانیـاو رووبارەکـانی ئێـوە پـێ چـاکترە جـێم بـێڵن بـا تــەنیا بمـرم تـەنیا سـەفەر کـەم جێم بێڵن بـا تـەنیا بم... لـە نـاو ئـەم تـاریکی یـەدا مـن ئـەم جەهەننەمـەم لـە بەهەشـتەکانی ئێـوە پـێ خۆشـترە هێنـدە بـۆ رووناکیتـان رۆشـتم تـا بنـی پێکـانم هـەمووی سـوتا هێنـدە چـاوەرێی باوەشـێکی پـر میهرتـان بـووم تـا وام لێهـات لـە خۆشـم وون بـووم تـــەنیا جـێم بـێلن ، لێـرە هێنــدە ئــەتکوژن هێنــدە دڵــت دەردێــنن و ئەتمرێنن خۆت مردنی خۆت پێ خۆشترە.

منـیش بـە تـەنیا بـە پـێ بـەرەو مـاڵ بەرێکەوتمـەوە بـە دڵێکـی هـەم شـکاو هـەم رەنجـاو هـەم تـۆراو سـەیرکە چ عەزابـێکە ئێـواران پیاســەیەکی تەنیــایی بەخـــە یــاڵی کەســێکەوە کە چیتــر بــوونی نــامێنێ لــەهیچ ســوچێکی ئــەم گەردونــە گەورەیــەدا ، وە ترســی جێهێشتنی کەسیکی تریش کە بەرەو وڵاتێکی تر ئەروا !!

چ سـەیرێکە دنیـا نـە بەویسـتی خۆمـان دێینـە دنیـاوە نـە بەویسـتی خۆشـمان دەمـرین ، ئـەبێ بـە هەمووشـی خـەم بخـۆین خـەمێك بـۆ ئـــەوەی دێینـــە ئێـــرە خـــەمێکیش بـــۆ رۆیشـــتنمان ، گـــەورەترین خەمیش مانەوەی خۆت و جێهێشتنی ئازیزەکانتە .

ئێستا لە نێوان دوو خەمدا نازانم کامیان هەزم کەم مردنی نەنکم یان وونکردنی هێلین .

ئەبێ تەلەفونێکی بۆ بکەم ئەویش ئێستا دڵی خەریکە ئەتەقێ نازانێ چی بووە ئێستا ئەویش ئازار ئەچێژێ ، ئەویش ئێستا تەنیایە لە گەڵ خەمەکانیا بۆیە تەلەفونم بۆ کردوو پێم ووت : ئەلو هێلین گیان باشیت ؟

هێلین : من باش نیم نەخێر تۆ لە کوێیت بۆ وەڵام نادەیتەوە ؟ من خەریکە شێت ئەبم تۆ لە کوێیت چی ئەکەی پێم ناڵێ ی من پەنجا جار تەلەفونم بۆ کردی بۆ وەڵام نەدامەوە .

کاردۆ: ببورە هێلین گیان زۆر سەرقاڵ بووم بروا بکە نەم ئەتوانی وەڵام بدەمەوە ئەمرۆ توشی کارەساتێکی زۆر ناخۆش بووم . ( بەدەم گریانەوە ) ئەمرۆ عەزیزترین کەسم لێرۆیشت ئەمرۆ نیوەی بوونم نەما ئەمرۆ نەنکم عەمری خوای کرد .

هێلین : وای کاردۆ گیان ئەی بۆ قسەت نەکرد خوا عەفوی بکات بەساقە . خودا سەبوریتان بدات ، وەڵا نەمزانیوە ببورە توخوا بەخوا نەمزانی ئەگینا وام نەوت ئەی بۆ پێت نەوتم

بەساقە ئەمە کەی ؟ ئەی لە کوێ بۆی دائەنیشن نازانم چی بڵێم بە خوا زۆر زۆرم پێ ناخۆش بوو .

کاردۆ : خوا ناخۆشیت نەداتێ وەڵا ژنان لە ماڵی خاڵم هەر تەنیشت خۆیانە ، بەس پێویست ناکا تۆ بچێت و ئەرك بکێشی لەبەر ئەوەی کەسیان ناناسی ، لێم ببورە ئێستا ناتوانم هیچ قسە بکەم هێلین گیان .لێم ببورە زۆر ماندوم ئەبێ بەیانیش زوو هەستم بچم بۆ تەعزیەکە ئەبێ برۆم بنووم ئێستا بروا بکە توانای هیچم نی یە خوا بکا خەویشم لێ بکەوێ ماندوێتی جەستەم و مێشکم خەریکە ئەمکوژن هێندە زۆرن ببورە توخوا.

هێلین : باشە بەقوربان برۆ ئیسراحەت بکە راستەکەی بەیانی قسە ئەکەینەوە ئاگات لە خۆت بێت من دڵم لاتە بیری لێ مەکەرەوە بە قوربان ئیتر ئەوە ژیانەو کۆتایی هەموومانە خوا لێ ی خۆش بێت جێگەی بەهەشت بێت .

راستی یەکەی پێویستیم بەوە بوو بە تەنیا بم ، ئەمویست لەگەڵ خەمەکانی خۆما باوەش بە یەکدا بکەین و پێکەوە بگرین ، گریانێکی جوان ئەو گریانەی دەرونم پاك ئەکاتەوە ئەو گریانەی رقم تیا ناهێڵێ ، ئەو گریانەی رۆشنایی یەکم ئەداتێ

بۆ سبەینی ، من راناکەم لە هیچ بەڵام زۆر جار ماندوو ئەبم و پێویستم بە پشووە ، زۆر جار دڵم پڕ ئەبێت و پێویستم بە گریانە ، ئێستا لەو جارانەیە کە پێویستیم بە گریان و پشووە .

سەیری مرۆڤ لەوەدایە لەوپەری ئازارەکانی ئێستایدا هەموو ئازارەکانی رابردوشی بیر دەکەوێتەوە هەرچەنە من هەمیشە ئەڵێم ئەگەر ئەتەوێت بە شەلە شەل رێنەکەیت و نەکەویت ئەوا ئاور مەدەرەوە و هەموو رابردوو لە یاد کە .بەڵام لە و کاتانەی خۆت لاواز دەبی ئەویش وەك میکرۆب رێگەی خۆی دەدۆزیتەوە لە دەرگات دەدات وەك ئەوەی خۆت کێشانەی خەمەکان کەم بن .

لەوانەشە ئەوەی کە دەڵێن پاداشت و سزای مرۆڤ هەر لەسەر ئەم زەمینەیە کە تێیدا دەژی ئەوە بێت هەموو دەرگاکانی من بەیەکەوە دا ئەخا ،بەڵام کام تاوان ئەگەر ئێستا بە پەرە کۆنەکانمدا بچمەوە لە کامەوە دەست پێبکەم بە بیرم نایە پولێکی کەسم بردبێ بە بیرم نایەم زلەیەکم لە کەس دابێ بە بیرم نایە دزیم لە کەس کردبێ ئازاری دڵی چۆلەکەیەکم نەداوە لەوانەیە دڵی هەندێك شۆخم شکاندبێ یان چەن پەیمانێکم شکاندبێ ، بەڵام ئەوانەش بە تەنها من خەتابار نەبووم من

نەمویستووە هەرگیز کەس ئازار بدەم تەنانەت ئەوەی ئازاریشم دابێ هەزار جار داوای لێخشبوونم لێکردوون ، تکام لێکردوون تا لێم خۆش ببن ، ئەوانیش لێم خۆش بوون ، منیش لە هەموو هەڵەکانی خۆم پەشیمانم هەمیشە ئازاری ئەو برینانەی ئەوان لە ناخی منیشدا بووە ، ئەوان نازانن من تا ئێستاش ئەو برینانەی ئەوانم لەسەر دڵم داناوە تا ئەمرم ئازار ئەچێژم پێوەی بۆیە من تاوانبار نیم من گوناحبار نیم ، مرۆڤ هەر سەردەمەوە گیرۆدەی کۆمەڵێ بێ مێشکی خۆیەتی کە پەروەردەی سەقەتی ئەم کۆمەڵگا پڕ دەرون نەخۆشانەیە دەنا کەسێك نی یە خاوەنی عەقڵێکی کراوە بێت بە جوانی پەروەردە کرابێ ئەو کەسە ویژدانی نەبێ ، کێ هەیە ناخی منالی رێگەی تاوانی پێ بدات ئەگەر دەوروبەرەکەی ئامادەیان نەکردبێ بۆ تاوانسازی ، ئێمە هەموو نێچیری بەر دەستی کۆمەڵگاین ، کۆمەڵگایەك خۆی یاساکان دا ئەنێت خۆشی فێری یاسا شکێنیت دەکات ، ئیتر ئەبێت مرۆڤیش لەم وڵاتەیا فێری تاوان وخراپەکاری بێت لە پاش ئەوەش دەرونی نەیەڵێت تام لە یەك هەنگاوی ژیانی بکات ، ئەمە کاتێکیش ئەم دەروونەی وای لێ دێت کاتێك مێشکی بکرێتەوەو ویژدانی ئیش بکا جا تا تێ ئەگات کە هەرچی ئازارێکی کەسێکی دابێت

تــاوانی ئــەم نــی یــە لــە بنەرەتــدا ، تــا ئەگاتــە ئــەوە خــۆی پارچــە پارچــە بــووە و زمــانی رۆحــی هەســتەوەری تــامی ژیانیــان پێــوە نــەماوە ، چاوەکــانی کــز بــوون جــوانی یــەکان نــابینن چــی دی ، ئیتــر ســوودی نــامێنێ ژیــان بــە ویژدانێکــی پــاك و نــاخێکی ئارامــەوە ، چونکــە تــا ئــەو ســاتەی ئەگەینــە ئــەو ناخــە ئارامــە هەمیشــە ترســمان وەك ســەگێ لــە دەرەوەی ســبەینێمان دانــاوە وەك ئــەوەی بمانــەوێ خۆمــان ئــازار بــەین ، یــان ئــەو ســەگەش هــەر کۆمەڵگایــە لــە پشــت هزرمــان داینــاوە تــا ئــەو ســاتەی دوا هەناســە ئــەدەین هــەر بــە ترســەوە بــژین ، ئــەم ترســەیان بــۆ بەرجەســتە کــردووین لــە دیــن و خــواو و کۆمــەڵگاو نەریتــەکان و ویژدانــە دروســت کراوەکــانی کۆمەڵگــە خــۆی ، خــۆ ئەگــەر کــەمێ بــە عــەقڵ بیــر بکەیتــەوە ئــەبینی ئەمانــە هــەمووی ئــەو وەهمــەن کــە ســەرەتاکەی دەوروبەرەکــەت دروســتیان کــردووە خۆشــت ئیتــر ســوتەمەنی هەمیشــەی ئــەو وەهمــەیت ، ئەگــەر بێــت و عــەقڵت نــەجوڵێنی و درك بــەو وەهمــە نەکــەی جــا ئــەوەی کێشەشــە ئــاخۆ کاتێك تــۆ درك بــەو وەهمــە ئەکــەیت ئــاخۆ ئــەو کەســەی هەســت بــە برینــداربوونی ئــەکات لــە تــۆوە ئــەو وەك تــۆ لــە قــوڵی ئــەم وەهمــە هاتۆتــە دەرەوە  یــان ئــەو هێشــتا لــەناو فــەزای ئازارەکــانی ئــەو وەهمــەدا ئــەژی چونکــە گــەر ئــەو هــەر لــە نــاو ئــەو وەهمــەدا بــژی

نیـوە گەیشـتن بــە حەقیقەتەکـەی تـۆ سـفر دەبێتــەوە  سـوودی نابێـت بۆیــە ناچـار ئــەوەی ئــەتمێنێت یـا ئــەبێ لــەوەدا ســەرفی بکــەی کــە ئــەو لــەو وەهمــە بێنیتــە دەرەوە ، ئــەو کــات تــێ دەگــات و تــۆش دەرون ئـارام دەبـێ بـەڵام خـۆت هـیچ پێـوە نامێنێتـەوە گـوزەری پـێ بکـــەی بـــە بەختـــەوەری  ، یـــان ئـــەبێ تەســـلیم بیـــت بـــە تێگەیشـتنەکەی ئـەو لـە سـەر چـۆك لێـی بپارێیتـەوە کـە لێـت ببـورێ ، ئـەو کـات کـە بـورا تـۆ گـەر نەشـتوانی بێـت هیمنـی و ئـارامی تــەواو بــدەیت بــە خــۆت هــیچ نــەبێت توانیوتــە بەختــەوەری و ئارامی ببەخشی بەو .

ئـای ئەمــە هــەمووی بــۆ چــی یــە ئــاخر منێـك ئێسـتا هـیچم لــە دەســەَڵاتدا نــی یــە ئــەبێ چــی بکــەم ، ئــەوە نــەنکم ســەفەرێکی کـردو ناگەرێتــەوە خــۆ شــەمەندەفەری ســەفەرەکەی ئــەو کلیلەکــەی لــە دەسـت مـن نـی یـە تـا نـەهێڵم سـەفەر بکـا ، ئـیِ ئـەوەش باوکـە بـێ دەماخەکــەی هێڵــین ە نــازانم چــی تێبگەیــەنم ، ئــاخر ئەوانــە رۆڵــەکانی ئــەم وڵاتــە پــەروەردە ئەکــەن بۆیــە ئــەمرۆمان بەمــە گەیشتووە کە تێیداین  .

ئــەزانی ئێســتا حــەزدەکم ژیــانم وەك ســویچی ســەیارەیەك بــدەم دەسـت کەسێکی تـر و پـێ بڵـێم ئیتـر مـن وزەم پـێ نـەما تـۆ بـرۆ بـۆ

خــۆت لێبخــوره ، ئــاخر خــۆ ئەگــەر لــە ســەرەتاکانی بوونمــەوه هێنــده مانــدوو نەبوومایــە ئێســتا زۆر بــاکم بــەم حاڵــەی خــۆم نــە ئــەبوو ، مــن بــە بیــرم نایــەت لــە کەیــەوه خــەمی نــان گیــرۆدەی کــردووم خــەمی ژیــان خــەمی گــەوره بــوون پێگەیشــتن فێــر بــوون ،هــەموو ئــەو خەمانــەی کــە نــاهێلن بــە نــەرمی گوێــت لــە نــاوی خۆت بێت .

وەڵای ئــەم دڵــەم یــەك بــەفرو بەســتەڵەکی تــەواوی ئــەوێ تــا کــەمێ ســارد بێتــەوه ، دەریایــەك ئــاوی دەوێ تــا هــێمن بــێ ، ئاســمانێ ئەستێرەی ئەوێ تا بتوانێ بنوێ .

لێــره رۆژ .. شــەو .. ژیــان .. هــەور .. بــاران هــەمووی کۆتــای دێ .. کــەچی خــەم هــەر ئــەمێنێ ، لێــره لەســەر هــەموو خــەمێ رادێیین .. بە مردویش گوزەر ئەکەین

چ چاوەروانیـــەکی ســـەیره هـــەمووان چـــاوەروانی ئەکـــەین کەســـمان جورئـــەت ناکـــەین .. پەنجـــە بـــۆ حەقیقـــەت ببـــەین هەمیشــە ئەمانــەوێ دڵــی کــەس نەشــکێنین کــەچی لــە کۆتــا رێگــا .. هـــەوومان پارچـــە پارچـــە بـــووین . گەیشـــتۆتیە ئەو قۆنـــاغەی مانەوەت باشتر نابێ لە ئێستا،قۆناغێک ئومێد کۆتایی دێ،

گەیشــتن بە جێگــایەک بــتەوێ خــۆت فریــو بــدەی و دڵــت خــۆش بـــکەی، گەیشـــتن بە شـــوێنێک هەر ڕابـــردووت لا جـــوانترە لە ئێســتا و داهــاتوو...مــن ئێســتا لەو جێگــایەم کــە ئیتــر هیــوا تــەنها ناوی ئەمێنێ .

گـوێم لـە تەقـە تەقێکـە وا بـزانم دەنگـی دەرگایـە و منـیش تـا ئێسـتاش هــیچ نـــانم نـــەخواردووە نـــازانم بـــەم برســـێتی یـــە ش چـــی بکـــەم ئەمشەو، کێشەیەك نی یە با بزانم کێ یە سەرەتا.

کــە دەرگاکــەم کــردەوە جــوانرۆی هــاورێم بــوو یەکســەر باوەشــی پیـاکردم و ووتــی : ببـورە کـاردۆ گیـان بـە خـوا ئێسـتا زانـیم نـەنکت عــەمری خــوای کــردووە بــۆ خۆتــان خــۆش بــن ئــەی بــۆ قســەت نــەکردووە ماڵــت ئــاوا بــێ بــرادەرە لــە دوو شــتی وا لەگــەڵ نــەبن سوودی چی یە .

کـاردۆ : ببـورە جـوانرۆ گیـان بـروا بکـە ئاگـام لـە خـۆم نـەبووە هـەر نـازانم کـەی بـوو هێنـدە سـەرقاڵ بـووم خۆشـم نەمـەزانی چـی بکـەم ، دووبارە ببورە وەرە ژورەوە .

جـوانرۆ : کاکـە گیـان ئەبوایـە قسـەت بکردایـە ، ئـەی چیـت ئـەوێت من بۆت بکەم ؟

کاردۆ: دانیشە کاکە هیچم ناوێت تۆ پێم بڵێ نانت خواردووە ؟

جوانرۆ : نەوەڵا ئەی تۆش دیارە نەتخواردووە ؟ دە دانیشە ئێستا ئەچم خواردنێك ئەهێنم لە دەرەوە ، حەزت لە چی یە با بۆت بێنم ؟

کاردۆ: نا پێویست ناکا تۆ ماندوو کەم پاشان ئێستا لە ماڵەوە شتێ ئامادە ئەکەم دانیشە تۆ .

جوانرۆ: کورە بابە تۆ هیلاکی نابێت دەی برۆ پێکەوە ئەچینە دەرەوە نان ئەخۆین .

کاردۆ: بە خوا ماندووم توانای چوونە دەرەوەم نی یە ئەگەر تۆ پێت خۆش بێت چایەك لێ ئەنێم و نان و ماستێك ئەخۆین .

جوانرۆ : ئاسایی یە منیش حەزەکم شتی قورس نەخۆم .

بەدەم حازرکردنی نانی ئێوارەوە بیرێکم لای جوانرۆ و قسەکانی بوو بیرێکیشم لای یادگاری یەکانی نەنکم ، بیرێکی تریشم لای ووشەکانی باوکی هۆنیا ، بیرێکیشم لای هۆنیا خۆی بوو ، هەستم ئەکرد پارچە پارچە بووبوم ، ئەمویست خۆم کۆ بکەمەوەو خۆم رێکبخەمەوە نەم ئەتوانی لاواز بووبوم زۆر

تەنانـــەت هەناســـەکانم نـــارێکی یـــەکی زۆریـــان تـــێ کـــەوتبوو نەمـــەزانی لەســـەر کـــام کـــەنارەیان لەنگـــەر بگـــرم ، ئەمـــە ئیتـــر ئەوپـــەری بەدبـــەختی یـــە تـــۆ لـــە ناســـینی و ئاشـــنا بـــوون بـــە خـــۆت راهـاتبی بـەڵام لـەدەروە لـەت لـەت بکـەن و بـە خـۆت نـامۆت بکـەن ،هەسـتم ئـەکرد جـوانرۆ باسـی شـتێکم بـۆ ئـەکات بـەس نەمـەزانی چی ئەڵێت .

جـوانرۆ: مـن هەمیشـە لەمـە ترسـاوم بمـرم و بـە تـەنها جـێم بـێڵن تەنانـەت لـەوە ئەترسـم بـە شـەودا بمـرم ، شـەوزۆر تاریکـە ئـەزانی لەوانەیـە شـتێك بـۆ دابنـێن روونـاك بیتـەوە کـەمێك باشـتر بێـت بـەس بـە خـوا بـە کارەبـا جوانـەکی ئێرەیـا بێـت قـەت ئـەویش کارەبـای نابێـت ، کـاردۆ مـن ئـەزانم تـۆ زۆر پـێ نـاخۆش بـوو کـە نـەنك عـەمری خـوای کـرد بـەڵاَم ئیتـر ئـەوە کۆتـایی هەموومانـە بروا بکە مردنیش نەبوایە ژیان مانای نەبوو .

جـوانرۆ پرسـیارێکی سـەیری کـرد لێـی پرسـیم پێـت نـاخۆش بـوو نەنکت مرد ؟ .

بـە کـەمێ تێرامانـەوە سـەیرم کـردو پـێم ووت : پـێم نـاخۆش بـوو پێشـم خـۆش بـوو ، پـێم نـاخۆش بـوو لەبـەر ئـەوەی لێـرە تـەنیاتری

کــردم و بــێ بــۆن و بەرامــەی گــوڵاو مێخەکــە خۆشــەکەی کــردم ئــەو تروســکە نــازەم مــابوو لــە دنیــا ئــەویش رۆیشــت مــرۆڤ بــێ نــان نــامرێ بــروا بکــە بــەڵام بــێ نــاز هەمیشــە وەك مــردووە ، ئــەو قاچانــە نــەما کــە یــەك پارچــە ئێســقانێك بــوو کــەچی لــە پشــتی یــە لۆکەکــەی خــۆم نــەرمتر بــوو ، ئــەو دەســت و پەنجانــەی وەك چیلکــەی گــەلامێویان لــێ هــاتبوو کــەچی لــە پرچــەکانی منــا وەك دەریــا گوزەریــان ئــەکرد ، ئێســتاش بــۆنی چێشــتە خۆشــەکانی تێــرم ئــەکا ، چیرۆکــەکانی شــەوانی ... هێنــدە جــوان باســی شــەولەبان و گورگانــە شــەوێ ی بــۆ ئــەکردم وەك منداڵــەکانی کــە نــەبووم بترســم بــە پێچەوانــەوە وام لێهــاتبوو لــە هێمنــی و گێرانــەوەی ئــەوەوە جنۆکەکانیشــم خۆشەویســت و حــەزم بــە دیــداریان ئــەکرد . پــێم نــاخۆش بــوو دەنگــێ نــەما لــە نــاخی دڵــی یــەوە بــانگم بکــا بڵــی وەرە بــە قوربــان نەنــە لــە دەوری ســەر گــەرێ .... لــە هــەمان کاتــدا پێشــم خــۆش بــوو کــە مــرد لەبــەر ئــەوەی لــەم وڵاتــەدا ئــەوەی دەیــان بەخشــیە ئــەو بــەس ئــازاردان و ئەشــکەنجەدان بــوو ئەبوایــە وەك کرێکــاری خەباتــە لــە پێنجــی بــەیانی برۆیشــتایە ســەرەی بگرتایــە تــا دوو فلســی بێوەژنانــەی وەرگرتایــە ، ئەبوایــە بــە چاویلکەیــەکی شــکاوەوەو بــە گۆچــانێکی چــەماوە رۆژی ســی جــار جــۆزەی موەلیــدە هەڵباتــەوە ، ئەبوایــە شــەوان لــە جــێ ی خــەوی هــێمن

ئێشــکگری دوو قــوم ئــاو بوایــە تــا بیکردایەتــە تــانکی ســەربانەوە ئــاخر کــەی تەمــەنی ئــەو هــی ئــەوە بــوو چــاوەڕێ ی وەرەقــەی نــەوت بــێ تــا خــۆی گــەرم بکاتــەوە ، کــەی ئــەو هێــزو توانــای ئــەم هــەموو تــاریکی یــەی مــابوو ، پــێم خــۆش بــوو چوونکــە کــەس نــەما بــوو گــوێ بــۆ چیرۆکــەکانی بگــرێ کــەس نــەما بــوو چێشــتە چــەورەکانی بخــوا هــەمووی خــۆی لاواز ئــەکرد پــێم خــۆش بــوو چونکــە کــەس نــەبوو بزانــێ ئــەو چ میهرەبانێکــە لــەم مەملەکەتــە وێرانە .

جــوانرۆ : بەراســتی ســرت کــردم ، مــن تێناگــەم تــۆ هەمیشــە وا بیــر ئەکەیتــەوە چــۆن ئــەتوانی ئــاوا بــژی ؟ کــاردۆ تــۆ چــۆن ئــەتوانی ئــاوا گــوزەر بکــەی ؟ لــە نــاو ئــەم میللەتــەو ئــەم خەڵکــەی ئێــرە بەراســـتی قورســـە درکـــت ئـــاوا بێـــت و ئاســـایی بژیـــت لـــەم وێرانەیەدا .

کــاردۆ: مــن ... مــن جــوانرۆ ئەمەنــدە دۆرام لــە ژیانــدا تــا فێــری بردنەوە بووم .

جوانرۆ : دۆرانی چی ؟

کــاردۆ: دۆرانــی خــۆم . وونکردنــی خــۆم ، مانــدوو کردنــی خــۆم هێنــدەم کـۆلانی غوربــەتی لــە نــاو خۆمـدا کـرد تـا فێـری هــەموو نەخشـــەکانی رۆیشـــتن بـــووم هێنـــدەش دۆرام تـــا فێـــری هـــەموو قومارەکانی ژیان بووم .

جوانرۆ : ئەتوانم پرسیارێکی تریش بکەم ؟

کاردۆ : بەڵی فەرموو .

جوانرۆ : تۆ قەت کەس حەزت بە مردن کردووە ؟

کــاردۆ: هــەنێ جـار بــەڵی ، لەبــەر ئــەوەی زۆر مانـدوو بـوو بـووم ، شــەکەت بــوو بــووم ، حــەزم ئــەکرد ئیتـر ئێـرە جێبـێلم ، بــەڵام ئێســتا هــەردووکی لام ئاســایی یــە بمێـنم یــا بمــرم ، گرنــگ ئــەو ساتەی ئـەژیم کـەس ئـازار نـەدەم ، کـە مردیشـم ئـازارم بـۆ کـەس جێنەهێشـتبێ ئـەزانی جـوانرۆ مـن ئێسـتا بروایـەکم هەیـە هەرچـی دەیـــکەی بـــیکە ، چـــۆن دەتەوێ بـــژی بـــرۆ بـــژی، بەڵام بـــۆ پێکەنینــت هــیچ کەسـێک مەگـرییێنە ، وە بـۆ دەسـکەوتەکانت هـیچ کەسێک مەفرۆشە .

جـوانرۆ : جـا ئـەوا توانیـت کـە خـۆت مـاوی کـەس ئـازار نـەدەی ئـەی چـۆن کـە نـەمای رێگـە لـە ئـازاردانی کەسـانی تـر دەگـری ، بـۆ نمونـــە ئەگـــەر تـــۆ بمـــری مـــن ئەوپـــەری ئـــازار ئـــەچێژم ، خەتاکەشی ئەوەیە کە تۆ ئەمری .

کـاردۆ : جـوانرۆ گیـان مرۆڤـی بـاش ئـەو کەسـەیە کەس گیـرۆدە نـەکات بـە بەدبـەختی یـەکانی خۆیـە ، کـەس پەیوەسـت نـەکات بـە ژیانی یەوە ، وا بەستەنەی بوونی کەسیش نەبێت .

کـاردۆ: راسـتەکەی مـن زۆر جـار هەوڵمـداوە کـە کـەس خۆشـی نـەوێم بـەو رادەیـە بـۆی دوای مـردنم کەسـێك نـەبێت پێویسـتی بـە مـن بێـت تەنانـەت زۆر جـار ئـەوەش وای لێکـردووم کـە نامـەوێ منداڵێـك بێنمـە ئـەم دنیایـە نـەکا مـن بمـرم و ئـەویش گیـرۆدە بێـت وەك خـــۆم چـــۆن هـــەتا ئـــەو ســـاتەی ئـــەمرم گیـــرۆدەی دەســـتی نەمانی دایکمم .

جـــوانرۆ : بـــەڵام منـــاڵ جـــوانی ژیانـــە هەناســـەکانێتی بـــۆنی گوڵـەکانێتی ، تـامی میوەکـانێتی ، چـۆن مـرۆڤ ئـەتوانێ حـەز بـە بوونی مناڵ نەکات .؟

کــاردۆ: نــا مــن نــاڵێم حــەزم لــە منــاڵ نــی یــە بــە پێچەوانــەوە خۆشەویســتی زۆرم بــۆ منــاڵ وام لــێ ئــەکات نامــەوێ بیهێنمــە دنیــاوە و گیــرۆدەی ئــەم هەموونەهامەتیانــەی بکــەم و لــە پاشــانیش بــە نــەمانی مــن ئەوەنــدەی تــر ســەرگەردان بێــت ، هەرچەنــە زۆر جـــار حـــەزەکانی خۆمـــان زاڵ ئـــەبێت بەســـەر لـــۆژیکی بیرکردنەومانــدا ئــەبینی لــە کۆتــایی دا منــیش ســێ چــوار منــداڵم هەیــە و ژیــانیش ئاســایی بەردەوامــە بــەڵام لــە هــەنێ جاریشــدا نــا بــە مردنــی مــن هــەمووی تێــك ئــەچێت ، بۆیــە خــۆی وا باشــترە مــرۆڤ بــەو قــوڵی و قورســی یــە بیــر لەوانــە نەکاتــەوە ئەشــێ ئــەوەی مــن ئاســایی نــەبێت کــە بــەو شــێوەیە بیــر ئەکەمــەوە لەوانەیــە هۆکــاری نــەمانی دایکــی خــۆم بێــت لــە ســەرتاوە ، بــەڵام راســتیەکەی منــاڵ وەك ترپــەی لێدانــەکانی دڵــن بــا شــتێکیش پــێ بلــێم هــەر کاتێــك مناڵێــك لــە دایــك بــوو بزانــە کــە خــوا لــە مــرۆڤ زویر نی یەو هێشتا ئومێدی پێیان هەیە .

جــوانرۆ : بــەخوا کاکــە تــۆ شــتەکان زۆر قــورس ئەکــەی ، دنیــاش بــەو شــێوەیە بــەرێوە نــاروات زۆرێــك لــە خــەڵکی هــەموو ژیانیــان بەڕێ دەکەن و ناشزانن چیان دەوێت.

کـــاردۆ: بـــەڵێ هەیـــە ئـــەژی و ئـــەمرێ و هێـــت و ئـــەروات لـــە هیچـیش تـێ ناگـات ، مـروڤیش هەیـە یـەك هـەنگاو نانێـت لـە ژیانـدا تـــا هـــەنگاوی دواتـــری نـــەبینێ و تـــێ ی نـــەگات ، مـــرۆڤ هەیـــە وەك دەریـــا وایـــە قوڵـــە و هێمنـــە مـــروڤیش هەیـــە وەك رووبـــارە تەنکـەو هەڵەشـەیە گرنـگ تـۆ کەسـێکی بـاش بیـت ئـازارت بـۆ کـەس نـەبێت ، شـاد بـە بـەڵام لەسـەر حسـابی خـۆت ، بـە واتـای شـــادیەک بەغەمبـــار کردنـــی کەســـانی تـــربەدی هاتبێـــت تـــاوانە ! بۆیـە هـەوڵ بـدە شـاد بیت بـەڵام لـە سـەر حسـابی خـەڵکی تـر نـا ئیتـر ژیان هەر ئەمەندەیەو بەس .

جوانرۆ : سەیری من کە ژیانم سادەیە بۆ تۆش وا نابیت ؟

کـــاردۆ : ئێمـــە وەك کتێـــب ســـەیری خـــەڵکی ئەکـــەین، ئەگـــەر بـــەرگی دەرەوەیمـــان بـــەدڵ نـــەبوو ئیتـــر تاقـــەتی خوێندنـــەوەی ناخیمـان نییـە ، بـە بـڕوای مـن تـا ئێسـتاش بـە تـەواوی نـاخی مـن نەناسـیت ، تـۆ ژیـانی خـۆت لەگەڵ مـن بەراورد مەکە تـۆ هیچ لـە رابـردو پـەروەردەو رێگاکـانی مـن نـازانی ! تـۆ نـازانی مـن لـە ئـازاری مرۆڤێکـەوە چـی دە چێـژم . مـن لـەو لانکەیـەی تـۆدا گـەورە نـەبووم و بـەو رێگایەنشـدا نەرۆیشـتووم کـە تـۆی پیـادا

رۆیشـتووی ئـەو ئازارانــەی مـن چەشـتومە ئەسـتەمە تـۆ بتـوانی بەرگەی بگری.

جـوانرۆ : باشـە تـۆ مەبەسـت ئەوەیـە کـە مـن گـەمژەم یـان بیـر ناکەمــەوە بـروا بکـە مـن وا نـیم منـیش هەسـتم هەیـە بـەڵام بـە و قورسی و قوڵی یەی تۆ نا .

کـاردۆ: نـا گـەمژە نیـت بـە پێچەوانـەوە تـۆ سـادەیت ئەمـەش جـوانی تۆیــە ، ببــورە هەرچەنــدە هــەنێك جــار گەمژەیــەتی جۆریکــە لــە بلیمــەتی . بــەڵام تــۆ ســادەتر ژیــاوی تاقیکردنــەوەت کــە متــرە قورسـیت کــەمتر چەشـتووە بـروا بکــە مــن سـاتی وام بینیـوە لــە ژیانمــا ژیــانی تــاڵ و پــڕ ئــازاری وەهــام بینیـوە کە مــردن بــۆم بەخــتەوری بــووە لــەو کاتــەدا ! .جــوانرۆ گیــان ژیــانی مــن مامۆسـتایەکی دڵـرەق بـوو ، سـەرەتا تاقیـت ئەکاتـەوە پـاش ئـەوە فێـرت ئـەکات ، منـیش لەوانـە بـووم کـە یەکـەم جـار تاقیکرامـەوەو و دوای وانەکانی ژیانم پێ ووترا .

جوانرۆ : بەڵام سودیشی بۆت هەبووە بە دڵنیایی وا نی یە ؟

کاردۆ: بەڵێ هەیبوەو ئێستاش سوودی هەیە .

جوانرۆ :تۆ کەسێکی پاکی کاردۆ .

کاردۆ : سوپاس تۆش هەمان شێوە .

راستی ئەو شەوە لەگەڵ جوانرۆ زۆرمان قسە کرد ئەوەش وای لێکردم زۆر توانای بیرکردنەوەم نەبێ لە کێشەکەی هێلین.

ئەو شەوە ویستم شتێ بنوسم بۆ جوانرۆ بۆیە پێنوسەکەم گرتە دەستم و بۆم نوسی هاورێکەم ... لەم هێمنی و تا ریکیەی شەودا .. پینوسەکەم گرتۆتە دەستم و ئەمەوێت هۆنراوەیەکت بۆ بنوسم .. بەلام وێنەکان یارمەتیان نەدام .. ویستم پەخشانیکت بۆ بنوسم ... بەلام ووشەکان جێیان هیشتم ... زۆرم ویست گۆرانیەکت بۆ بڵێم ... ئاوازەکان هیچ هاوکارم نەبوون ... ئەمشەو هەموویم بیر کرد .. ووشەم نەما رستەکانم لە بیر چونەوە .. وێنەکانم وون کرد .

ئەو شەوە جوانرۆ منی بردە جیهانێکی تر هەموو خەمەکانی بۆ کردمە تۆزی خۆلەمێشیکی بە با چوو تەنانەت خودی خۆشم بیر نەما لە ناخەوە سوپاس هاورێ . بۆ یە رۆژی دوای ئەوە بە تەنها خۆم لە ماڵەوە مامەوە تەنها خەریکی نوستن بووم تا

كــاتی پرســەكە پــاش ئــەوە چوومــە پرســەكەو ئــەو رۆژەشــم بــە مانــدوێتی بــەرێكرد بــە دیــار بیركردنــی یادگــاری یــەكانی نــەنكی خۆشەویســتم پاشــان چوومــەوە ماڵــەو چونكــە توانــام لەبــەر بــرا یــوو لــە كۆتــایی شــەودا بیــرم كەوتــەوە كــە ئــەبێ لەگــەڵ هێلــین بگەمــە بریــارێكی كۆتــایی بــەم جــۆرە ژیــان نــاگوزەرێ بۆیــە بریــارم دا بــۆ كــە بــەیانی ببیــنم وە ئــەم بابەتــە یــەك لای بكەمــەوە ســــەرەنجام تەلـــــەفونم بـــــۆ كـــــردوو پـــــێم ووت كـــــە دوای ســـەرقەبرانەكەی نـــەنكم ئەمـــەوێ بتبیـــنم ، ئـــەویش رازی بـــوو ، هــەرچۆنێك بــوو ئــەو شــەوەم بــەرێ كــرد ، بــەیانی كــە لەگۆرســتان و خــەتم تــەواو بــووم چوومــە كــافی یــەك و ئــەویش هاتــە ئــەوێ چاوەكـــانی ئـــەوت گـــۆمی خـــوێنن پـــێ ئـــەچوو ئـــەویش هـــەموو شتێكی تێگەیەندرا بێ .

هێلـــین : چـــۆنی كـــاردۆ گیـــان ببـــورە بـــەخوا نـــەمتوانی بـــێم بـــۆ پرســـەكە توخـــوا ببـــورە ، بـــۆ خۆتـــان خـــۆش بـــن ، كۆتـــا نـــا خۆشـــیتان بێت .

كاردۆ : نا ئاسایی یە سوپاست دەكەم ، فەرموو دانیشە .

هێلـین : هەرچەنــە کــاتی ئــەوە نــی یــە بــەس چــی بکــەم بــەخوا خەریکە تێك ئەچم ، پێم بڵێ بە تەمایت چی بکەیت تکایە ؟

کـاردۆ : راسـتی منـیش ئـەمرۆ تـۆم بـۆ ئـەو بابەتـە بانـگ کـردووە ، مـن نـازانم باوکـت قسـەی لەگـەڵ کـردی یـان نـا ، مـن ئـەو رۆژە چوومــــە لای و خــــوا هــــەڵناگرێ ســــەرەتا زۆر رێــــزی گــــرتم خــەریبوو لــە خــۆم بــایی ئــەبووم تەســەورم ئــەکرد یەکســە ر بڵــێ ئەتـدەمێ بـە کراسـی بـەری خۆیـەوە هێنـدە بـە دەمـامێکی رێـزەوە پێشـوازی لێکـردم تـا زانـی کـێم پـاش ئـەوە بـە قـودرەتی قـادر هــەموو باشــی یەکــەی گــۆرا و بــوو بــە ئەهریمــەن بــە یــەك کەلیمەی جوان کردمیە دەرەوە .

هێلـین : چـۆن ؟ کـەی ؟ ئەترسـم تـۆ بـە شـێوەیەکی ناشـیرین قسـەت لەگــەڵ کردبــێ راســتی یەکــەی ئــەو شــتێکی ووت بــەس بــەوو شـێوەیە نـا ئـەو هـەر ووتـی ئـەو کـورە لـە مێشـکت دەربێنـە بمریـت ناتـدەم بـەو بـاش بزانـە وە پـاش یـەك مـانگی کـە سـەفەر ئەکـەین جـارێکی کـە گـوێم لـە نـاوی ئـەو کـورە نـەبێت . مـن نـازانم بـاوکم مرۆڤێکــی باشــە نــازانم بــۆ وای ووت ، ئەترســم خــەتای تــۆ بوبێــت .

لێـرەدا شـتێکی سـەیرم بـۆ دەرکـەوت مـرۆڤ بونـەورێکی سـەیرە ، ئەیـەوێت هەمیشـە وێناکـانی لـە مێشـکی خۆیـدا دروسـتی کـردووە تێکـی نەشـکێنێت ئەگـەر وێنەکـە خۆشـی شـکاو بێـت ئـەو هەمیشـە بـە رێکـی و پـوختی ئـەیبینێ بۆیـە ئامادەیـە چـاوی خـۆی بـە درۆ بخاتـەوە بـەڵام ئـەو بنـەما سـەقەتەی لەسـەری گـەورە بـووە دەسـتکاری نـەکات ، ئـاخر باشـە تـۆ کەسـێکت خـۆش بوێـت و سـەردەمێکیش لەگەڵیـدا ژیانـت بـەرێ کردبـێ ، چوبیتـە نـاخی یـەوە هەسـتەکانی تێگەیشـتبی چـۆن ئـەبێ تـا ئێسـتا نەیناسـی یـان ئەمە خۆ هەڵخەڵتاندنە لە بری دان پێدانانی دۆران .

بۆیـە ویسـتم بـە رێگەیـەك بـۆی روون بکەمـەوە کـە تـێ بگـات مـن کێم و چیم .

کـاردۆ: هێلـین گیـان مـن راسـتە لـە ژیانمـا بـە گـوزەری خـراپ و ناخۆشـدا تێپـەریووم راسـتە دڵـی کەسـانێکم شـکاندووە و داوای لێبوردنیـان لـێ دەکـەم راسـتە تـا ئـەم تەمەنـەم نەشـمتوانیوە لـە هـەموو کۆڵانـەکانی ژیانـا بـە سـاکاری پیاسـە بکـەم گـرژی و پشـێوی شـتی لـێ تێکـداوم بـەڵام فێـری مرۆڤایـەتی بـووم فێـر بـووم کـە بـزانم کـۆتر دڵـی هەیـە وەك ئێمـە لـێ ئـەدات ، فێربـووم بـزانم کـە پشـیلە بێچووەکـانی لـە ئێمـە زیـاتر خـۆش دەوێ ، زۆر جـار

لەئــازارە قوڵــە کــانی ناونــاخم خــۆم گێــل کــردووە و ووتومــە ئیتــرئەمە ژیــانە !!، تەنانــەت ئــەوەش فێربــووم کــە هــەنێك کــەس هــەن هیچیــان نــی یــە بــەڵام مــرۆڤن ئامــادە نــین ئــازاری چۆلەکەیــەکیش بــەن کەســانێکیش هــەن ئەگەر ســامان و شــەهادە و ڕووتــبە و نەجــمەکەی لــێ وەرگــریتەوە ئەمێنێــتەوە "هــیچ" ئــاخر هەنــدێ کەس ناوبانــگ و پیشــە کردونــی بەپیــاو. ئەگەرنــا خۆیــان لە بــنەڕەتەوە بــریتین لە "هــیچ ، مــەرج نــی یــە ئــەوەی ئــەیبینی لــە روکەشــدا هـــەمان نـــاخ بێـــت یـــان ئـــەو پـــاکی یـــەی نـــاخی رەنگدانــەوەی هــەبێت لــە ناخیــا ئەخــلاق و ئەدەب و مــرۆڤ بــوون پەیوەنـــدیان بە پـــلەو پـــایەوە نـــیە ، زۆرن ئەوانەی پـــلەو پایەیـــان بەرزە ، بەڵام هێشتا زۆریان ماوە ببن بە مرۆڤ .

هێلین : تێناگەم باسی چی دەکەی .

کــاردۆ : ســەیرکە هێلــین گیــان مــن چوومــە لای باوکــت (هــەمان ئــەو شــێوەیەی مامەڵــەی لەگــەڵ کــردم لــە ســەرەتاوە تــا کۆتایــە بــوم گێرایــەوە ) ئیتــر بــەم شــێوەیە وە مــن ئەمــە ســەرەی سـێهەم جــارە دێم و تۆش هیچ هەڵوێستێکت نی یە ، منیش نازانم چی بکەم .

هێلـــین : ئـــاخر مـــن چـــی بکـــەم خوایـــە ، خـــۆ مـــن نـــاتوانم بـــێ ڕەزامەندی دایك وباوکم هاوسەر گیری بکەم ئەمە چۆن ئەبێ .

کاردۆ: ئەی من چی بکەم پێم ناڵێیت ؟

هێلین : باشە چی بکەین ، واز بێنین دیارە تۆ ئەوەت ئەوێت ؟

کـــاردۆ: ســـەیرکە هێلـــین مـــن ئـــەوەم نـــاوێ مـــن تەنانـــەت ئامـــادەم ئێســـتا بچـــین پێکـــەوە هاوســـەرگیری بکـــەین وە ئامـــادەم هـــەموو بارەکـــان بگرمـــە ئەســـتۆ چیشـــت ئـــەوێت ئەیکـــەم مـــن لـــەوە زیـــاتر نـــازانم چـــی بڵـــێم ، مـــن خۆشـــم ئـــەوێیت درۆت لەگـــەڵ ناکـــەم بـــەڵام لـــە کارێکـــدا کـــە دەســـەڵاتی مـــن نـــەبێت و هـــی تـــۆ بێـــت ئـــەبێ مـــن چـــی بکـــەم دەی تـــۆ پـــێم بڵـــێ مـــن ئێســـتا دەســـەڵاتم چـــی یـــە تـــۆ شـــتێك بڵێ با من بیکەم بۆت .

هێلـین : مـن نـازانم ، مـن عاشـقی تـۆم بـەڵام خـۆ ئێـرە ئـەوروپا نـی یـە وا هاوســەرگیری بکــەم مــن هــەوڵ ئــەدەم لەگــەڵ دایکــم بــەڵکو بتوانێ قەناعەت بە باوکم بکات .

کــاردۆ: باشــە مــن چــاوەڕێ ی وەڵامــی تــۆم ، هەوڵبــدە هــەر کــات پێویســت بــە مــن بــوو مــن هەمیشــە ئامــادەم تــۆ چــی بڵێیــت مــن ئەیکەم من بەڵێن ئەدەم هەموو شتێك بگرمە ئەستۆم .

وا بــزانم ئــەوە دوا ووشــە بــوو لــە نێوانمــادا ڕوو بــە ڕوو چوونکــە لــە دوای ئــەوە هێلیــنم نەدییــەوە تــەنها تەلــەفۆنێکی کــردوو ووتــی ببــورە کــاردۆ هــیچم بــۆ نــاکری ، تــۆ سەربەســتی چــۆن ئــەژیت مــن نــاتوانم دەســت بــەرداری خێزانەکــەم بــم قســەی تــرم بــۆ نــاکرێ خوات لە گەڵ.

کــاردۆ : مانــای چــی هیچــت بــۆ نــاکرێ ئــەزانی ئەگــەر وا بڵێیــت منیش بریار ئەدەم .

هێلین : بریاری چی ؟

کــاردۆ :بریــار ئــەدەم ئەگــەر چــی دی دەســتم نــەگری پەنجــەرە شکاوەکانم بۆ نەکەیتەوە

ســیمام نەســری وەختــی دەگــریم ئیتــر منــیش نــەگریم بریارئــەدەم چیتــر ئــەم ترپــە ترپانــەی دڵــم ئــازاد نەکــەم ئــەم شــیش بەنــدە وەنەوشــەیانەی خــۆم چیتــر نەکەمــەوە تــۆ ئەتــەوێت ئیتــر بــە

دەنـوکی کـۆترێ عەشـق نەکەیتـە ئـەم باخانـە ی ناخمـەوە بـە مشـتی نێرگـز خەنـدەم نـەدەیتێ ئـەی ئەگـەر تـۆ هیچـت بـۆ نـەکرێ مـن لــەم شــەقامە تاریکانــە چــۆن گــوزەر بکــەم کــە هەمیشــە لــە ئـاوابوون دەچـێ .ئـەزانی هێلـین دڵـی تـۆ وەك بیابانـە لـە هـیچ سـەرابێکتا تینـوێتیم ناشـکێنێ چاوەکـانی تـۆ دوو کـوتری سـرکن لانە ناکەن و لای من ماڵی نابن هەمیشە لە من تەرە ئەبن .

هێلـین دوای ئـەم ووشـانەی تـۆ مـن ئێسـتا وەك گـەڵای پـایزم زەرد زەرد وەریـوم و لـە ووشـکی ووشـکترم ، تـازە لـە دوای خـۆت چـی لـە مـن جێمـا تـۆ بەنـە وەکـانی گـوڵی ببەخشـە ، مـن دەمویسـت میراتـی ماسـیەکان بـە تـۆ بـدەم ئەمویسـت هێلکـەی چۆلەکـەکان بـۆ تـۆ رەنـگ بکـەم مـن ئەمویسـت لـەناو خەیاڵـەکانی تـۆدا وەك شـێت سـەما بکـەم ، وەك گـورگ هـاوار بکـەم . مـن دەمویسـت تـۆ ئەمەنـدە ببارێـت بـە سـەرما تـا هـەمومێژووم تـەر بکـەم ، بریـارم دا چیتر نەگریم ئاخر ئیتر فرمێسك ووشك ئەکا .

لــەم ســەفەرەی تــۆدا و لــەم بەلەمانــەی پــێ ی ئــەرۆیت لــەم دارسـتانەو لـەم فرۆکانـەدا مەگـەر مـن هـەر بـە دواتـا را بکـەم ... هـەر بـۆنی تـەری تـۆ بکـەم ئـاخر تـۆ بـرۆی بـۆنی منـیش لـە بـی تـۆی لـە بـۆنی بـرین ئـەچی لـە بـۆنی ئـازار زیـاتر هیچ بـۆنیکی تـرم

لـێ نایـەت . مەگـەر چیتـر مـن تـا مـاوم لـە باوەشـما خـۆم ژێـر بکـەم ، تـا بـەم حوزنـە پەتـەکانی دلـم نـەپچڕێ بڕیارئـەدەم ئیتـر تەواو خۆم لە بیر بکەم .

هێلـین : بەسـە تکایـە مـن نـازانم خـۆم چـی بکـەم تـۆش ئـەم قسـانەم بـۆ ئەکـەی ، مـن نـاخی خـۆم خەریکـە ئەمسـوتێنێ تـۆش ئـاگری زیاتر بەر ئەدەیتە رۆحم .

راسـتی نـاخم تـەواو پـڕە لـە گریـان بـوو بـۆ سـەفەری هێلـین و بـۆ شکسـتی ئـەمجارەی عەشـقی خۆشـم ، ئەمـە چەنـدەم جـارە مـن ئـاوا لــە عەشــقا ئــەدۆڕێم ، پــێ ئــەچێت عەشــق هەمیشــە نــەك قــازانج مایەشـی نـەبێ هـەر دۆراو بیـت ، بـەڵام چـی بکـەم مـرۆڤ جـاری وایـە هێنـدە بـێ دەسـەڵاتە رقـی لـە بـوونی خۆشـی ئـەبێ تـف لـە هــەموو تواناکــانی ئــەکات کــە نــەتوانێ پەرەیــەك بــە جــوانی هەڵباتەوە کە نەتوانێ بە مەرکەبێ چارەنوسێکی دۆراو بنوسێ.

هێلـین : کـاردۆ گیـان لـە بـوونی خـۆم زیـاتر خۆشـم ئـەوێیت بـەڵام نـازانم چـی بکـەم ، بـڕوا بکـە ئێسـتا مردنـی خـۆم پـێ خۆشـترە لـەم بێ دەسەڵاتیەم .

کــاردۆ : هــیچ مەکــە و هــیچ مــەڵی تکایــە ، بــەکورتی تــۆ وەك پەنجــەی بــا لــەژێکانی دەنگــم دەدەی وەك یاریــەکانی منــداڵی تــێکم دەدەیت و درووستم دەکەیتەوە .

وەك گــــــرێ کـــــوێرەی فەقیانـــــەکانی نـــــەنکم دام دەخــــــەیت و دەمکەیتــەوە، وەك هێڵــەکانی ســەر دەســتم ئــەودیو نهێنیــەکانم نیشــان دەدەیــت. ئەمــدیوی ڕوناکیــە کانیشــم لــێ دەشــاریتەوە ! بەســە هــیچ مەڵێ تکایە ئیتر لێرە بە دوا ووشە سوودی نی یە .

مــن تــازە چــی لــە پێکــی عەشــق بکــەم وەختــێ دەشــکێ چــی لــە تــابلۆی حــەزێك بکــەم وەختــێ رەنگــی لەســەر نــامێنێ چــی لــە کتێبــێ ئەبەدیــەت بکــەم وەختــێ ووشــەی تیــا نــامێنێ تــازە کــە گوڵاکــان وەریــن بــەچی خونچــە ئەکەنــەوە ئــاخر کــە دارتوویــەك ووشــکی کــرد چــۆن تــازە نــەمام ئەکاتــەوە کــە منــیش هێنــدە ئــازار درام بــە چــی ئاشــت ئەبمــەوە ،ئــاخر میهرەبــانی کــەی وا ئــەبێ تــۆ لەگــەڵ خــۆت هــەموو شــتێکت بــرد تــۆ تەنیایــەکانم تــەنیاتر کــرد ، ئــەی پــێم نــاڵی ی ئــەو دڵــە گەورەیــەت بــۆچی یــە کــە پەرەســێلکەیەك نــەتوانێ هێلانــەی تیــا بکــات، ئــەی ئــەو چــاوە پــر شــیلانە چــی لــێ دەکــەی کــە پەپولەیــەك نــەتوانێ بــۆن بــە بیلبیلەکانیــەوە بکــات ، ئــەها ســەیرکە ئەیناسیتەوە ئەمــە دڵــی منــە بەهارانێکــە لــە دڵــێ تــۆدا گــوڵ ئــەروێنێ

بــە پایزێــك هــەموو ئــەم باخانــەم ووشــك مەكــە تكایــە شــتێ بكــە تكایە.

هێلــین : ببــورە ئیتــر نــاتوانم هــیچ قســە بكــەم ، توانــای ووتــنم نــەما بروا بكە ، قورگم پڕ پڕە لە مەرگ .

هەستم كرد ئیتر گریان قورگی ئاوساندووە هیچی پێ ناوترێ .

ئــەی ئــەم هــەموو خۆشەویستی و عەشــقە چــی لێهــات نــازانم ئــاخۆ مــن نــەمتوانیبێ هێلــین بناســم هەرچەنــە ئــەو كەســەی ئــەڵێت لــە ئــافرت گەیشــتوم گەمژەیــە چونكــە هــەرگیز پیــاو نــاتوانێ لــە هــیچ ئــافرەتێ بگــات ، بــەس مــن بەراســتی هەســت بــە تێكشــكانی ڕۆحــم ئەكـــەم ئـــەمجارەش باوەشـــێكی تونـــدم كـــردەوە بـــە تـــەنیایی دا لەوانەیــە ســەیر بێــت وا بــە ئاســانی هــەموو شــتێ تــەواو بــوو ، بــەڵام ئــەم هەڵوێســتە كەســێكی ئــازای ئەویســت ئــەبێ زۆر جــار مــرۆڤ فیــدا بــدات تەنانــەت ڕۆح ببەخشــێ تــا بگاتــە ئامــانجێكی مــەزن وە عەشــق بــە تــەنها بــە بــاڵی نــافرێ ، بــەڵام ئــەبێ مــرۆڤ پــێش عەشــق كــردن بیــر بكاتــەوە خــۆ هــەر وا ئاســان نــی یــە بــاڵی پەپولەیــەك لــی بكەیتــەوە ئــاخر ئــەو پەپولەیــە تــا مــاوە بــە مــەراقی فرینــەوە ئــەژی ، ئاســان نــەبوو هیچــی ئاســان نــەبوو گیــان كێشــان

ئـــازاری زۆره رۆح كێشـــانیش ئـــازاری زیـــاتر بـــەڵام عەشـــق كێشـــانه هـــەم رۆح كێشـــانه هـــەم گیـــان كێشـــان ، مـــن ئـــەمجاره كەتمـــەوه بـــەر بارداشـــی ئـــەزموون و هـــەنجن هـــەنجن كرامـــەوه ئـــەمجارەش گوشـــرام ئـــەوەی مـــابوو پێكـــەنین تیامـــدا ئەویشـــم لـــێ چۆڕایەوەو و تەواو لە عەشقدا ووشكم كرد .

ئێستاش پـر بـە دڵ حەزئـەكم بۆ یـەك جاریش بێت گـوێم لـە دەنگـی بێـت ، دەنگێـك .. هەسـت بكـەی بـە دیـار شـەپۆلی دەریـاوەی یـان .. ســـاتی گمـــە گمـــەی كـــۆترێ ، یـــان .. ســـاتی نیشـــتنەوه ی چۆلەكەیـەك یـان .. سـاتی خواردنـەوەی پـەرداخێك ئـاو ، یـان .. سـاتێ هەسـت بكـەی ئیدی تـۆ لەگـەڵ ئـەو دەنگـەدا بـە شـەپۆلەكانی ئـەودا ئـەرۆی تـا هـەرچی ویسـتگەی جـوانی و ویسـتگەی باخچـەو ویســـتگەی شـــەمەنەفەری بـــەری بەیانـــە ، ئیـــدی ئـــەو دەنگـــە ئـــەوبات ئـــەرۆی ، بـــروا بكـــە لـــە دوری ئـــەو لـــە بـــەره كۆنـــە دراوەكـان ئـەچم موشـتەری خـۆی نـەبێ كەسـێ لام لـێ ناكاتـەوه نـازانم بـۆ وا ئـەنجن ئـەنجن بـوم ئەمویسـت وەك مـۆمێ هەمیشـه بـۆ ئـەو بسـوتێم تـا رونـاكی كەمـەوه لـە كۆتاشـدا .. هـەر مـن توامەوەو بوومه دووكەڵێكی وون .

هێلین گیان ئای.. چەنێك لە چاوەروانی تۆدا چاوەروان بووم تا وام لێهات لەگەڵ چاوەروانی ژیانم پێك هێنا . هێندە بە زووی دیار نەمایی تا چاوەکانم لە تروکان وەستان ، ئای .. لەو شەوەی کە مانگ دیار نەما کەس لەوێ نەبوو تا بە دوایدا بگەرێ ئەو شەوەی دەریا ئەگریا و کەس شینی ئەوی نەبیست ، چەنێك هەور هاورای کردو کەس چاوی لە سوتانی نەبوو . ئای .. ئەبێ جارێکی دی کە باران باری من وتۆ پێکەوە تەڕ ببین . وا هەست دەکەم ئەم رووباری بیرو عەشقانەی من بە خورت و خۆڕایی شەپۆل دەدا ئەم بای بانگ کردنەت لە زیا لورەی دێ ، رێگاکانی گەیشتن بە تۆ بێ هودە خۆیان ماندوو ئەکەن خۆ من و تۆ چیتر پێکەوە پیاسەی پیا ناکەین .

لە دوایین کوچە تاریکەکانی خەیاڵمدا ، هەندێك جار. من تیایدا تێکدەشکێم هەندێك جاریش من تێیدا دەبەزم و زۆر جاری دیکەش تەواو دۆڕاوم !

من وابووم، کەسم لەگەڵ خۆمدا نەبردۆتە دیار پەنجەرەکانی شەڕ ، نامەی مەرگم بۆ کەس نەهێناوەتەوە زور جار لەو کۆڵانانەدا بە تەنیا بوم..!! بە دزیەوە بارگەم بۆ کامەرانیم ساز کردوە بێ ئەوەی کەس پێم بزانێ.! دڵی هەموو کۆترەکانم

راگرتـــوه ،هـــەرگیز دڵـــی پەپولەیـــەکم نەتۆرانـــدووه ، قـــەت نەمهێشـتوه لقـی داریٚ بشـکیٚ دەسـتم نـەبردووه بـۆ گـوڵیٚ نـەبا زیـز بـیٚ ، هەمیشـە نوقـڵ وخەنـدەی منـداڵان بـووم لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆرجـار هـەر خـۆم بـە تـەنها خـەمبار بـووم لەوانەیـە لـەو کۆلانـە تاریکانەشدا هەروا بیٚ دەنگ بمرم.

.....ئـــای چ چاوەڕوانییـــەکی ســـەیرە ئـــەزانی چـــەن وەرز مـــن چـاوەرێم کـردی چـەن بـەهار هـات و گـەڵای سـەوز کـرد چـەن پـایز رەنگـی زەردی بـە درەخـت بەخشـی چـەن زسـتان بـەفری دابـاران چـەن هاوینـە تـریٚ هـەڵوەری مەگـەر هـەر خـوا بزانـیٚ چـەنێك بـە شـوێنتا سـەرگەردان بـووم چـەن ووشـەم نووسـی ... لـە خۆمـەوە بـۆ خـۆم چـەنێك لـە شـەقامەکاندا بـە دواتـا وێـڵ بـووم ئێـوارە نـەما چـاوو بـۆ هەڵنەخـەم بـەیانی نـەما بـە دواتـا نەگـەرێم ئـەزانی چـەن وەرزە مـن عاشـقی تـۆم هـەر چـاوەریٚ بـووم و.... هـەر چـاوەرێم ، چـاوەروانی لـە نـاخ و دڵـی منـدا نیشـتووە ، مـن .. هەمیشە چاوەڕوانم و تۆش هەمیشە وونیت .

زۆر جـار دڵـم بـۆ تـۆ هێنـدە تـەنگ دەبـیٚ خـۆ ئەگەر خـۆت هەسـت بەمە بکـەی دەیـان جـار ئـەگریت !هێنـدە دڵـم تـەنگ دەبـیٚ .. گریـان لـە گـەروما سـر دەبـیٚ و دەمـریٚ ، مـن ... لە شـەقامە ساردەکانی

شــەودا جــگە لە بیــرو .. خــەیاڵ هــیچ دەنگێکــی تــر نابیســتم جگــە لـــە هەنســـك و چـــاوەروانی ئەســـتێرەیەکی دی نـــابینم وایـــی چ کارەســتێکە ،هەرچەنــد ئەکەم ..دڵــم نــایەتەوە لای خــۆم...تــازە لــە مـن تــەرە بـووە...ناگەرێتــەوە وام دەزانــی لەبیرکردنــی تـۆ کـاتێکی زیـاتری دەوێ بـەڵام نـەمزانی دڵێکـی رەقـی دەوێـت ...ئـەو دڵـەی ئـەوێت کـە لەلای تـۆیە..! ئـا پێم بڵـێ ئەبێت چەنێـک مـن شـەو بـم ، تـا تـۆ مانـگ بـی ئـەبێ چـەنێك مـن دەریـا بـم تـا تـۆ نەورەسێکی ئـازا بـی ئەگـەر بتـەوێ مـن تـۆ لـە بیـر بکـەم ئـەبێ هـەتا مـاوم شـەر لـە گەڵ مەحاڵدا بکەم یا ملم لە پەتی سێدارە مارە بکەم .

تـۆ ئێسـتا لـە کوێیـت .... لـە نـاو منـدا کلـو کلـو بـەفر دێتـە خـوارێ ئیســتا تــو وەك توپەڵــە بــەفرێ نــاخم ســپی دەکــەی ئێســتا مێــژووی هــەموو ئەفســانەکان میــوانی تــۆن لــە ناومنــدا دەتوێنــەوە .. کوچــە کوچەی ئەم وڵاتە بریندارەم سارێژ دەکەن ....

منــیش هــەر لــە گەرانــدام ... مــن پــەری ئــەو باڵدارانــەم کــە ئەیانــەوێت تــۆ بــۆ ئــەو دیوهــەورەکان بفــرینن ... مــن تــەری ئــەو بارانــەم کــە دەنکــە گەنمــەکانی تــۆ گــەورە دەکــەن هێلــین .. ئــەم ژیانـــە ســـەفەرێکی دوری دەوێ ئـــەم ســـەفەرە عەشـــقێکی وەك تــۆی دەوێ خۆشەویســتەکەم لــەو ســاتانەی هەڵوێســت نــامێنی ...

ئــەو ســاتانەی کــە ویســتگەیەك نــامێنی بــۆ عەشــق ئــەو ســاتانەی شــەمەندەفەریك نــامێنی بــۆ رق ... بــۆ بیرکــردن ... بــۆ بروســکە ... بـۆ بـاران .. ئـەو سـاتانەی کـە مـن بـە دوای تـۆدا سـەفەردەکەم هـــەموو فرۆکـــە خانـــەکان دەگـــەرێم ... هـــەموو میوانخانـــەکان دەگـەرێم بـەڵکو تـۆی تیـدا بـی .. لـە هـەموو ئـەم جەنگانـەدا تـا بـە هێمنــی بــژیم و بــە هێمنــی بمــرم تــەنها عەشــقی تــۆم دەویَ تــۆش ئاوا بە ئاسانی جێم دێڵی.

ژیــری وعـــەقل کاتێــك ئەگاتــە لامـــان پارچـــەی کـــەممان مـــاوە گـــوزەر کـــەین پێـــوەی بـــەڵام هـــەرچۆنێك بێـــت باشـــترە لـــەوەی ســەردان نــەکات ، مــن ئێســتا تــەواو گەیشــتومەتە ئــەو قەناعەتــەی کــە عەشــق خــۆی یــاری یــەکی دۆراوە ، کێشــەی عەشــق ئەوەیــە کـە عـەقڵ ئەوەستێنیَ بۆیـە عـەقڵ ئـیش ناکـات لـەو سـاتە وەختانـەی مـرۆڤ عاشـقە ، لـە عەشـقدا خۆشـبەختی نـی یـە ، گـەمژەیی یـە عەشــق بکــەیت بــۆ گەیشــتن بــە بەختــەوەری زۆردەرگــا هــەن لــە ژیاندا داخستنیان باشترە یەکێك لەو دەرگایانە دەرگای عەشقە .

ماوەیــەکی زۆر تێپــەری بەســەر دورکەوتنــەوەی هێلــین ئــەویش وەك ئــەوانی تــر هێــدی هێــدی بیــر چوونــەوەو تــەنها یادگــاری یەکانیان لە ناو مێشکم و ئەلبومی رۆژانەمدا مابوون .

بەراستی هەستانی ئەم بەیانی یەم جیا لە رۆژەکانی ترە هەستەکەم تێر خەو بووم تێر ئیسراحەت بووم ، راستی یەکەی ئەمرۆ ویستم سەردانی نارێ بکەم لە دائیرە بزانم چۆنە ماوەیەکی زۆر بوو ئاگام لەویش نەبوو ئاخر ئەم ماوەیە مۆڵەتی منداڵ بوون بوو .

لە دائیرە سەرەتا کە چوومە ژورەکە وەك رۆژانی تر کاك محمود لەوێ بوو بەڵام ئەم بەیانی یە روی گەش و مورتاح بوو ، یەکسەر ئەو ووتی .

محمود: ئەك بەخێر بێت کاکە کاردۆ .

کاردۆ: سوپاس کاك محمود لە خوا بە زیاد بێت ئەم بەیانی یە زۆر باش ئەتبینم .

محمود : ئەو دڵت پاکە بۆیە ، راستی یەکەی لەگەڵ دایکی مناڵەکان چووینەوە لای یەك ، بە راستی ئێستا هەست ئەکەم کە هەردوکمان هەڵەیەکی گەورەمان کرد کە ئاوا جیا بووینەوە.

کــاردۆ: نــا کــاك محمــود هەڵــە نــەبوون ، بــە پێچەوانــەوەو کــارێکی باشــتان کــرد چونکــە کۆمــەڵی شــتی زۆر باشــتان بــۆ روون بــووەوە ، زۆر جــار کەســەکان ئــەبێت دور کەونــەوە لــە یــەك تــا تێبگــەن چەنــدێك پێویســتیان بــە یــەك هەیــە تــا بــزانن بــە بــێ یــەك چــۆن هەڵدەکــەن تــا بــزانن راســتی هەڵــەکانیان کامانــەن شــتی باشــتان بــۆ دەردەکەوێ .

محمود : شتی چی ؟

کــاردۆ: هــەم تــۆش هــەم خێزانەکــەش توانیتــان بــزانن پێویســتی یــەکانتنان چــی یــە ، بــزانن ئێــوە لــە چــی یــەك دڵگــرانن ، توانیتــان بــزان ئایــا ئەوانــەی کــە بــەڵێنی خۆشــگوزەرانی و بەختــەوەری یــان پێدا بــوون راســت بــوون یــان نــا ، توانیتــان تێبگــەن کــە ژیــان چــی یــە و چــی ئــەوێ ، بــزانن منــداڵ ئاســان نــی یــە جێهێشــتنی ، کــاك محمــود ، خــەڵکی ئێســتای ئێمــە قەناعــەتی بــە ژیانەکــەی نــەماوە ئێــوە توانیتــان ئــەو قەناعەتــە بگێرنــەوە بــۆ خۆتــام ئێمــەی مــرۆڤیش واین تا شتێك لە دەست نەدەین قیمەتی نازانین .

گرنــگ ئێســتا بزانیــت خۆشــحاڵی و بەختــەوەری مــرۆڤ چــی یــە زۆر ئەســتەمە تــۆ نــەزانی بەختــەوەری چــی یــەو بچــی بــە دوایــدا

بگــەرێت ئــەبَی ســەرەتا تــۆ بەختــەوەری خــۆت زانیبــێ پاشــان گەران بە دوایدا ئاسانە . کاتی ئەوێ کات .

محمــود: بــەخوا تــەنیایی ناخۆشــە کــاردۆ ، مــن نــازانم تــۆ چــۆن ئەتوانیت بە تەنیا بژیت .

کــاردۆ: تــەنیایی ســاتە وەختــێ ناخۆشــە کــە کەســانێ هــەبن پێویســتیان بــە بــوونی تــۆ بێــت لەگــەڵیان دەنــا گــەر کەسێك نــەبێت بــوونی تــۆی لا گرنــگ بێــت ئــەو کــات بــەس خــۆتی کــە خــۆت ئــەوێت ، راســتی منداڵــەکانی تــۆ پێویســتیان بــە بــوونی تــۆ هەیــە تەنانــەت خێزانەکــەش پێویســتی بــە تــۆ هەیــە وە خۆشــت پێویســتیت بەوانــە بۆیــە تــەنیایی بــۆ تــۆ قورســە دەنــا تــەنیایی تــام و لــەزەتی خۆی هەیە کاك محمود .

محمــود : راســتەکەیت کــاردۆ گیــان منــیش هەســتم بــەوە کــرد بۆیــە ووتــم وا باشــتر کــەمێك واز لــە کەلــە رەقــی و قــورس کردنــی بابەتــەکان بیــنم ، وا باشــترە لــەم وڵاتــە بــاری شــانی لاوەکــی فرێــدەی تــا بــار ســووك بــێ ، دەنــا بــاری ئێــرە بــە ئێســترێکیش هەڵناگیرێ .

مــن زۆر بــروام بــە خــۆ هەڵخەڵتانــدن نــی یــە ، مــرۆڤ ئــەبێت دوای راســتی بکــەوێت ئەگــەر زەرەر مەنــدیش بێــت ئــەبێت لــە رێگــەی راســتی یــەوە چارەســەری کێــەکان بکــات ، چوونکــە لــە کۆتاییدا هەر ئەگەیتە ئەو ئەنجامەی کە راستی یەکە ئەیەوێت .

لــەم قســانەدا بــووین و کــاك ئــاری هاتــە ژوورەوە ووتــی بــەیانیتان بــاش ببــورن ئــەمرۆ هــاتووم تــا مــاڵ ئاوایتــان لــێ بکــەم راژەکــەم گواستۆتەوە بۆ دائیرەیەکی کە .

کاردۆ : باشە بۆ کاك ئاری لەوە ئەچێ لێمان بێزار بووبی .

ئــای : نــاوەڵا بــەس بــەخوا ئێــرە بــۆ مــن دووره خۆشــتان ئــەزانن مــن نەخۆشــم توانــای ئــەو هــەموو ســەیارە لێخورینــەم نــی یــە ئیتــر چوومە شوێنێك نزیکە لای ماڵی خۆمان .

هەڵبەتــە مــن پەرۆشــی ئــەوە بــووم بچــم بــۆ لای نــارێ نــازانم بــۆ بەڵام حەزم ئەکرد بیبینم تا بزانم ئەو بە چ دۆخێك گەیشتووه .

کــە چوومــە لای زۆر بــە پەرۆشــەوە هەســتا و ووتــی چــۆنی کــاك کــاردۆ ئــەوە بــۆ هــیچ هــەواڵم ناپرســی بــۆ دەنــگ نــی یــە لــە کوێیــت چیت لێهاتووه .

کـاردۆ: راسـتەکەی بـەس بـەخوا ئـەم ماوەیـە زۆر مەشـغول بـووم چـی بکـەم ئیتـر رۆژگارێـك تێکـەوتووین کـەس ئاگـای لـە کـەس نەماوە ، ئەی پێم بڵێ تۆ چۆنی بەبەکەت چۆنە ؟

ناریێ : وەڵا هیچ باش نیم ، ئەویش باش نی یە دایم نەخۆشە .

هـەنێ کـەس هـەر لـە لـە دایـك بوونیانـەوە هەمیشـە رەشـبین و و بـە گلـەیین و رازی نـین لـە هـیچ شـتێ نەگبـەتی منـیش لەودایـە حـەز بـە بینینـی ئـەم کەسـە ئەکـەم ئـاخر بڵـێ شـووت کـردووە بـە حسـاب و کتـابی خـۆت میردەکـەت خـۆش ئـەوێت ، منـداڵێکی نـازداری جوانـت هەیـە ئـاخر ئـەم هـەموو نـارەزایی دەربرینـە چـی یـە تێناگـەم ئەمانـە چـۆن بیـر ئەکەنـەوە چییـان ئـەوێت لـە ژیانیانـا ، مـن وای بۆ ئەچم خۆشیان نەزانن چیان دەوێ .

کـاردۆ: دەی گـوێ مـەدەرێ ، ئیتـر منـالێش ئـەو شـتانەی هەیـە ئەی پیاوەکەت باشە .

نـاری: نـا وەڵا فـەقیرە زۆر هیلاکـە ئیسـتا دوو ئـیش ئـەکات و فریا ناکەوێت .

بێگومــان ئــەو ئــەزانێ چــی ئــەکات گرنــگ تۆیــت بزانــی چــی ئەکـەی مـن هەسـتم ئـەکرد لەوانەیـە کـە نـارێ ببینـم کـەمێك هەسـت بـە ئـارامی بکـەم بـەڵام بـەو خوایـە بـە پێچەوانـەوە هـەموو رۆژە رەشـەکانی ژیـانمی بـۆ هێنامـەوە بـەر چـاووم هـەر مانـدووی کـردم ، بۆیە تۆبەم کرد بریارم دا جارێکی تر سەردانی نەکەم .

زۆر کـەس تـەنها سـەر ئێشـەت بـۆ ئـەهێنن نـەك بـۆت چـارە کـەن جـا کــە مــرۆڤ ســەری نەئێشــیت بــۆ بــەزۆر خــۆی پــەرۆی تێوەپێچێــت لــە هــەمان کاتتــدا زۆر ناخۆشــە واهەســت بکەیــت کەوەك دەرمــان وایــت، تەنهــا لەکــاتی پێویســتدا بەکــارت بهێــنن، بۆیـە پـێم باشـترە مـن لـەم جـۆرە مرۆڤانـە دوور کەومـەوە کـە تـەنها بــۆ پێویســتی یــەکانی خۆیــان تۆیــان دەوێــت یــان ئەوانــەی کــە تێناگەیت لێیان بۆچی تۆیان دەوێت .

کـاردۆ : دەی لەشـی سـاخ بێـت مـن ئـەبێت بـرۆم هـەر حـەزم کـرد هــەواڵێکت بپرســم ئێشــەڵا هــەموو شــتەکان بــاش دەبــن ، دەی خۆات لەگەڵ .

راســتی یەکــەی ئەمویســت لــەوێ را بکــەم تــا زوتــر بــرۆم هەســـــتەکەم بەراســـــتی هەســـــتەکانم هـــــەمووی گـــــۆراوون

بیرکردنــەوەم هــەمووی گــۆڕاوە تەنانــەت هەســتم ئــەکرد حەزیشــم بۆ خواردنەکان گۆڕا بوو .

مـرۆڤ پێویسـتە بگۆڕێـت مـن بـڕوام بـەو یاسـا کۆنـە نـی یـە کـە دەڵێـت مــرۆڤ پەیوەســت بێــت بــە کلتــورە کۆنــەکان و حــەزە کۆنــەکانی بــە پێچەوانــەوە پێویســتە هەمیشــە لــە تــاقی کردنــەوەی بابـەتی تـازە بیـت تـا بتوانیـت چێژێـك بـدەیت بـە ژیـان وە وات لـێ نەیـەت بێـزار و بێهـودە بیـت لـە دووبـارە بوونـەوەی شـتەکان ، مـن بـە راسـتی بـۆم دەرکـەت کەسـانی زۆری وەك نـارێ هـەن ئـەوەی ئەیکـەن لــە ژیانــدا دروســت کردنــی ماســکێك بــۆ خۆیــان و خــۆ حەشــاردانەوەیان لــە نــاو ئــەو ماســکە بــە جۆریــك کــە خۆشــیان بروایــان بــە ماســکەکە هەیــە و لــەو دیــو ماســکەکەوە خۆیــان کوشــتووە و تــەنها ئەمــدیوی ماســکەکە مــاوە بــە جۆرێکــە ئــەو ماسـکە هـەموو بابەتـە جوانـەکانی کۆمـەڵگای لـێ داواکـراوە تێدایـە لەگـەڵ ویسـتە کۆنخوازەکـانی پلـەی بـێ پایـە ئـەدات بـە مـرۆڤ ، نــارێ و زۆرێــك لەوانــەی وەك ئــەو ئــەژین تــەنها ئەوەندەیــە لــە قۆزاخەیـەکی ترۆهـات دا قەسـرێکی وەهمیـان بـۆ خۆیـان دروسـت کــردووەو تێیــدا دەژیــن درەنــگ یــا زوو هــەم قۆزاخەکــە ئەشــکێ هــەم قەســرەکە ئــەرۆخێ ئــەو کــات تــێ ئــەگات بــە زیــادە چــوو

هـەموو ژیـانی ئـەم بـەڵام کـاتێ ژیـری ئـەگاتێ ئیتـر تەمـەن ئـەوەی ناداتێ سوود لەو ژیری یە وەربگرێ .

کــە گەرامــەوە ژورەکــەی خــۆم کــاك محمــود ووتــی کــاردۆ حەزئـەکم رۆژێـك لـە مـاڵی ئێمـە دەعـوەت بیـت منـیش بـە سوپاسـەو پێم ووت بە خۆشحالی یەوە .

ئــەم ماوەیــە بــە هــۆی بیتاقــەتی و بێــزاری خــۆم لــە هــەموو کەســەکان دوور کەوتبوومــەوە تەنانــەت لــە بــرادەرە نزیکەکانیشــم زۆر دەمێـك بـوو ئاگـام لـە هـەواڵی رامیـار نـەبوو بۆیـە بریـارم دا ئەمرۆ بچم بۆ ماڵی باوکی هەواڵی بپرسم .

لــە گەرانــەوە م دا کێلۆیــەك شــیرینیم کــری و بــەرەو مــاڵی بــاوکی رامیار بەرێ کەوتم .

کـە گەیشـتمە ئـەوێ لـە دەرگـام دا ، ژنێکـی جـل رەش دەرگـا کـەی کـردەوە دەم و چـاوی پـر بـوو لـە ئەسـرین و خەفـەت و خـەم کـە منی بینی ووتی بەڵی فەرموو .

کــاردۆ: ببــورە دایــە گیــان مــن هــاورێی رامیــارم هــاتووم بــۆ هەواڵپرسی ئەو .

باوەشـێکی هێنـدە تونـدی پیـاکردم دایکـی خۆشـم بمایـە هـەر ئەونـدە باوەشــی پێـدا دەکـردم و تــا پەراســووەکانی دەنگــی شـکاندنیان لێـوە دەهــات ، پــێ ووتــم بەســاقەی تــۆش و رامیــاریش بــم کــورم دە وەرە ژورەوە بەساقە .

هەســتم کــرد ئــەم بیــرە زۆرەی ئــەم بــۆ رامیــارە پێویســت بــەوە ئــەکات بچمــە ژورەوە تــا بتــوانم کــەمێ دڵــی شــاد بکــەم و لــە خەمەکانی هەڵگرم .

کــاردۆ: باشــە دایــە گیــان ئــەی پــێم بڵــی رامیــار لــە کــوی یــە گەرایـەوە لـە عەمرەکـەی هـیچ ئاگـام لـە دەنـگ و باسـی نـی یـە ئێستا چی ئەکات ؟

قسـەی نـەکرد تـا چوومـە ژورەوە کـە بینـیم پیـاوێکی پیـر کـەوتوە لـە جێگایەکدا توانای قسە کردنی نی یە .

دایکــی رامیــار : دانیشــە کــورم ئــەوە بــاوکی رامیــارە مــاوەی پێــنج ســاڵە بــەم شــێوەیە لــە جێگــادا کــەوتووە ئــەو لــە کرێکــاری کەوتۆتــە خــوارەوە ئیتــر دکتۆرەکــان ئــەڵێن نیــوەی لەشــی ئــیش ناکــات و شــتەکانیش بیــر نایەتــەوە ، خۆزگــەم بــە خــۆی کــە دور کەوتۆتــەوە لە مەینەتی یەکانی ژیان .

کــاردۆ: باشــە بــۆ رامیــار قــەت باســی ئەمــەی نــەکردوە مــن نەمزانیوە بەراستی زۆرم پێناخۆشە .

دایکی رامیار : تۆ دایکت ماوە کورم ؟

کــاردۆ : نــەوەڵا دایــە گیــان ، تەمــەنی درێــژی بــۆ تــۆ جێهێشــت ، دەمێکە عەمری خوای کردووە .

دایکــی رامیــار : دەی خــوا عــەفوی کــات رۆڵــە گیــان ، ئــەزانی جــەرگی دایـك چــی یــە ، جــەرگی دایـك ، ئــەو تەنورەیــە کــە نــانی بەیانیان ئەبرژێنێ بۆ رۆڵەکەی .

ئــەوە بــە زمانــە ســادەکەی خــۆی کەوتــە باســکردنی هەســتی دایکایــەتی خــۆی بــەڵام ئــەوەی مــن هەســتم پێکــردو لــێ تێگەیشــتم زۆر لەوەزیاتر بو .

دایکــی رامیــار : دەمــەوێ کــەمێك باســی خــۆم بــۆ بکــەم رۆڵــە گیــان مــن ڕوونــاکیم لــەچرای دراوســێکان دەفــڕان ئــەمکرد بەبــەری منــاڵی رامیــاردا تــا هەمیشــە رێگاکــانی رونــاك بــێ ،مــن ...ووردە نــانی کۆڵانــەکانم کــۆ دەکــردەوە تــا تریتــی پێکــەنینی بــۆ بکــەم و پــێ ببەخشم

رۆڵــە گیــان مــن کــە لــە رامیــار تــورە ئــەبووم  پــێش ئــەو خــۆم ئــەگریام  پــێش ئــەوەی چــەپۆکێکی پیــا بکێشــم  ،ئازارەکــان زوتــر بەخۆم دەگەیشت .

کورەکــەم کەخەنــدەش ســەر لێوەکــانی ئــەوی دەگــرت دوای ئــەو ئەو کات من  پێ دەکەنیم .

رۆڵــە گیــان مــن ئێســتا مــردن لام گرنــگ نــی یــە بەهەشــت و جەهەنــەمم نــاوێ ، تــەنها ئەمــەوێ بــۆ جــارێکیش بــێ تێــر تێــر بــۆنی کــەم ئەمــەوێ تێــر ســەیری بــەژن و بــاڵای کــەم  ، تــەنها جارێــك ئیتر دوای ئەو بشمرم قەیناکە .

راســـتی چاوەکـــانم تـــەواو تـــەر بـــوون توانـــام نـــەما نـــەگریم ئەشمویســت ئەوەنــدەی تــر دەرونــی ئــەو ئــازار نــەدەم بۆیــە ویســتم بابەتەکە بگۆرم ووتم ئەی باشە تۆ پێم بڵێ ئێستا لە کوێ یە ؟

دایکـــی رامیـــار : وەڵای رۆڵـــە گیـــان نـــازانم خوشـــکەکەی ئـــەڵی ســـەفەری کـــردووە نـــازانم بـــۆ کـــوێ .، خۆزگـــە دەرمانێـــك هەبوایـــە بمانتوانیایـــە لـــە بیریـــان کـــەین تـــا ئەوەنـــدە ئـــازاری دوریانمـــان نەچەشــتایە بــە خــوا رۆڵــە هــەموو رۆژێ کــە لــە خــەو خەبــەرم ئەبێتــەوە ئــەو لــە ماڵەکــەدا نــی یــە ئــەڵێم بــەڵکو ئیتــر ســبەینێ بــە

خەبەر نەیەم یا ئەو بێتەوە ، نازانم بە خوا وەك شێتم لێ هاتووە ئۆقرەم نەماوە ناو جەرگم رەش بووە .

کاردۆ : دایە گیان خەم نەبێ من هەواڵێت بۆ ئەهێنم بەڵێن پێ ئەدەمە نەیەمەوە تا هەوالێکیت بۆ نەهێنم .

دایکی رامیار : ئەی بەساقەت بم بە خوا چیت بوێت بۆت ئەکەم بە قوربانە دوو عانە شك ئەبەم بیبە و بگەرێ بە شوێنیا بڵێ دایك ئەڵی وەررەوە تا نەمردووم بۆ یەك جار گازێ لە لەپی دەستم بگرە وەك منالّی با منیش تێر تێر بگریم لە خۆشیانا .

کاردۆ: بەسەر چاو دایە گیان سەرت لێ ئەدەمەوە . هاتمە دەرەوە بەڵام چۆن بە شکاوی بە روخاوی بە کۆڵەپشتێ خەفەت و گریانەوە بە باوەشێك ئازارەوە نازانم بریا نەچووبام ، یان باشتر کە چووم تێناگەم چۆن مرۆڤ ئەتوانێ ئاوا بکات ، کام دین کام فەلسەفە کام کلتور کام رەوشت رێگا ئەدات بە مرۆڤ ئاوا بکات ئەمە چ ویژدانێکە .

ماوەیەکی زۆر گەرام بە دوای سۆراخی رامیاردا زۆرم پرسی لە هاورێ کانی یەوە لە کەسە نزیکەکانی راستی یەکەی

ماندوو بووم هێندە گەرام خەریبو ئیتر کۆڵم ئەدا هەرچەنە فرمێسکی چاوەکانی دایکیشم بیر ئەکەوتەوە ووزەیەکم پیا ئەهاتەوە دەستم ئەکر بە سۆراخ کردنی تا لە کۆتایا پێیان ووتم سەردانی ئەو مزگەوتە بکەم کە گوایە لە رێگەی ئەوانەوە چووە بۆ عەمرە ، بۆیە رووم کردە مزگەوتەکەو چوومە ژورەوە ، راستی مزگەوتەکە زۆر بێ دەنگ و سامناك بوو چوومە بە دوای ژوری مجەورەکەدا گەرام کە بینینم لە پشتی ژوری مردوو شۆرەکان بوو ، لە دەرگام دا کەس وەڵامی نەبوو ، دوو سێ جاری تر لە دەرگاکەم دا ئەمجارە کەمێ قایم تر ، لە دوورەوە لای تەوالیتەکانەوە دەنگێ هاورای لێ هەستاو ووتی رەحمەتی خوات لێ بێت کەمێ تەحەمول بکە وا هاتم ، منیش هەر لەویدا نزیکەی پێنج دەقە وەستام ، پاشان بە پرتاو کابرایەکی ریش درێژی بێ سمێڵ گەیشتە لام ووتی سلام علیکم ، ووتم علیکم السلام ، ووتی فەرموو برام چیت ئەوێت ، منیش پێم ووت راستی یەکەی برایەکی خۆشەویستم ماوەیەکە دیار نی یە ووتیان لە رێگەی ئێوەوە چووە بۆ عەمرە ووتم بزانم ئەتوانیت ناونیشانێکم بدەیتێ راستی یەکەی دایك و باوکی زۆر بە دوایدا وێڵن ، پرسی کێ یە ؟ پێم ووت کورێکی تەمەن سی وپێنج سال ئەبێت ناوی رامیارە ، یەکسەر ناسی

ووتــی بــەڵێ بــەڵی ئەیناســم ، راســتی ئــەو لــە رێگــەی ئێمــەوە نــەچووە بــۆ عــەمرە مــن ناونیشــان کەســێك ئــەدەمێ لەگــەڵ ئــەو ســەفەری کردبــوو ئێســتا ئــەو هاتۆتــەوە ئــەتوانیت بچیتــە لای بپرســی ، منــیش بــە سوپاســەوە ناونیشــانەکەم لــێ وەرگــرت ، کــە چوومــە لای ئــەو کەســەی لــە ناونیشــانەکەدا بــوو ، ئــەویش کــورێکی لــە تەمــەنی رامیــار ئــەبوو کــە دەرگاکــەی کــردەوە دەم و چــاوی زۆر تــۆرە و مــۆن دیــار بــوو منــیش یەکســەر هــەواڵی رامیــارم لــێ پرســی ، ووتــی بــەڵێ لەگــەڵ مــن بــووە لــە شــوێنێك بــووین بــەس ببــورە مــن نــاتوانم ناونیشــانی شــوێنەکەت پــێ بڵــێم بــەڵام ئــەتوانم پــێ بڵــێم بــزانم رازی یــە ژمــارە تەلەفونەکــەت بــەمێ ووتــم باشــە چــاوەرێ ئەکــەم ، لــە پــاش چــارەکێ هاتــەوە دەرەوە ووتــی بگــرە ئــەوە ژمارەکەیــەتی بــەس ووتویــەتی مەیــدە بــە کــەس تکایە بەس تەنها خۆی ئەتوانێ پەیوەندیم پێوە بکات .

منــیش لــە خۆشــیا پێکــانم زەوی یــان نــەگرت خێــرا رۆشــتم ، بــە پەلە تەلەفونەکەم دەرهێناو تەلەفونم بۆ کرد .

کاردۆ: ئەلو رامیار چۆنی براکەم ؟

رامیار : سەلامی خوات لێ بێت کاك کاردۆ .

کــاردۆ: کاکــە گیــان ئــەوە تــۆ لــە کوێیــت ، براکــەم دایکــت تــەواو سەرگەردان بووە بۆت ئاخر چۆن ئاوا ئبێت .

رامیــار : تــۆ چــوزانی دایکــم حــاڵی چۆنــە بــرام هــیچ بــووە بەراست؟

کـاردۆ:نـا بـرام هیچـی وا نـی یـە بـەس مـن ویسـتم هـەواڵی تـۆ بـزانم لەبــەر ئــەوەی چــووم ســەردانم کــردن تــا بــزانم لــە کوێیــت و دەنــگ و بــاس بپرسـم بــەڵام حــاڵێکم بینــی تــەواو نیگــەرانی کــردم ، براکـەم تـۆ بـۆ دایکـت و باوکـت ئـاوا جێهشـتوە ئـاخر خـۆ دینەکـەی تـۆ ئـەڵێت بەهەشـت لـە ژێـر پێـی دایکدایـە ئـەی ئەمـە کـوا رەحـم کـوا خۆشەویسـتی دایـك و بـاوك براکـەم ، راسـتە مـن حـەقی ئـەوەم نــی یــە تــۆ محاســەبە بکــەم بــەڵام وەڵا ویــژدانم قبــوڵی ناکــات بێـدەنگ بـم ، بـروا بکـە دایکـت زۆر پەرێشـان بـوون فـەقیرە نـەی ئـەزانی بڵـێ چـی بـاوکیش ئـەوە خـۆ خـۆت حاڵەکـەی ئـەزانی بـروا بکـە ئـەو خوشـکەت نەبوایـە خـەڵك خێریـان پـێ ئـەکردن بـراکم بـۆ ئاوا جێتهێشتوون .

رامیــار : کــاك کــاردۆ ، مــن وەڵامــی هــیچم پــێ نــی یــە ، کاکــە کاردۆئــەوە بزانــە هــیچ کەسـێك لــە پرێکـدا بریــاری قــورس نــادات

بـروا بکــە ئــەوەی کــە ئــەروات و هــەموو میــژوو بــوونی خــۆی جێـدێڵێت دڵنیـا بــە یـا ئامــانجێکی پیـرۆزی هەیــە یـان ئــەوتا ئیتـر تــەواو مانــدوو بــووە ، براکــەم کــاتێ کەســێ ئەگاتــە تینــی و کاریـك ئـەکات دڵنیـا بـە زۆر پـێش ئـەوە پـر پـر بـووە جـا یـا لـە رق یـا لـە حـەزە ئـەو کـات بریـاری ئـەو شـتە ئـەدات ، ئـەوەش بزانــە براکـەم کــە مــن درێخـیم نــەکردووە پـارە ئەنێرمــەوە بـۆ دایکـم و بــاوکم بــە برایانما .

کــاردۆ : پـــارە هـــەموو شـــتێ نـــی یـــە خـــۆ نـــازانم ئــاخۆ ئـــەو پارەیەشــی بــە دەســت گەیشــتووە یــان نــا بــەڵام دایکــت ئەیــەوێت تــۆ ببینــێ دایکــت ســۆز و خۆشەویســتی و گرنگــی تــۆی ئــەوێت دایـك پــارەی بــۆ چــی یــە ئــەو بــۆنی کورەکــەی ئــەوێ دەنگــی ئــەوێ بوونی ئەوێت لە ماڵەکەدا .

رامیـــار : مـــن نـــاتوانم بـــرام ، ئیشــی زۆر لـــە دایـــك و بـــاوك گــەوەرەترم هەیــە پێویسـت ناکــا بـۆ تـۆی شـی بکەمــەوە ، وە مـن بۆیـــە وەڵامـــی تەلەفونەکەشـــم دایتـــەوە لـــە بیـــرم دێـــت رۆژێکیـــان خۆت شتێکت پـێ ووتـم نـازانم خـۆت لـە بیـرت مـاوە یـان نـا بیـرت دێـت کـە پێـت ووتـم زۆر جـار ئـەو رێگەیـەی قـەدەر بـۆی دانـاوین و پێیـــدا دەرۆیـــن . نشـــێوی و روبـــار و پەرینـــەوەی زۆرە ،

کەســانێك هــەن هیچــی ئیمــەش نــین لەوانەیــە نەشــیان ناســین یــان هەستیان پــێ نەکــەین بــەڵاَم ئــەوان خۆیــان دەکەنــە پردێـك تـا ئێمـە بەســەریدا بپەڕێنــەوە بــێ ئــەوەی ئێمــە ئاورێکیشــیان لــێ بەینــەوە ئــەو کەســانە بــە دڵنیــایی خۆشــیان دەوێــین ، بــێ ئــەوەی ئێمــە هەسـت بکـەین ئـەوان بـۆ ئێمـە وەك مـۆم ئەسـوتین ، تکایـە ئەگـەر لـە ژیـانی تۆشـدا مۆمێـك یـان چـەن مۆمێـك هەیـە رێگـەی بـە بـە جــوانی بســوتێ لــە پاشــان فــرێ ی مــەدە کــە گەیشــتیتە رۆخــی دەریاکـە بـەڵکو بتوانـە قوتویـەکی جـوانی لـێ دروسـت کـە تـا هـەر هـیچ نـەبێ بەشـێ لـە خەمـەکان هـەڵگرێ ، تـۆش ئـەو مۆمـە بـووی بۆیــە نامــەوێت قــەت دور کەومــەوە لــە هــاورێ یــەتیت ، مــن وەك برایــەك داوات لــێ ئەکــەم ســەردانی مــاڵی بــاوکم بکــەی چییــان ئــەوێت بۆیــان بکــە مــن پــارەت بــۆ ئــەنێرم ، ئیتــر لــەوە زیــاتر نــاتوانم هــیچ بکــەم رەنگــە بتــوانم بــە تەلــەفون قســە لەگــەڵ تــۆ بکــەم ماوە ماوە تا هەواڵیان بزانم .

کــاردۆ: بەســەر چــاو مــن وا دەکــەم بــەڵام داواکاریەکــەم هەیــە لێــت کە چوومە ماڵی باوکت قسەیان لەگەڵ بکەی بە تەلەفون .

رامیــار : ببــورە نــاتوانم ، لەبــەر ئــەوەی نامــەوێ بکەومــە ژێــر کاریگــەری گریــان و ســۆزی دایکمــەوە بگەرێمــەوە براکــانی

ئێـــرەم زۆریـــان ئـــاوا رێگـــەی بەهەشـــتیان لـــە خۆیـــان فـــەوتان و کەوتنـــە ژێـــر کاریگـــەری سـۆزو خۆشەویســتی دایــك و خێــزان و منداڵیان و لاواز بوون و گەرانەوە من نامەوێ وام لێ بێت .

کـــاردۆ: کـــورە کاکـــە بەهەشـــتی تـــۆ لێرەیـــە لـــە باوەشـــی دایکتـــا بەهەشـتی ئـەولاش بـوێ هـەر لـە ژێـر پێـی دایکتایـە ، تـۆ بـۆ وا ئەکـەی براکـەم ، بـە هـەر حـاڵ مـن زۆرم لـە سـەر نـی یـە بـەڵام ئـەچم پێیـان ئـەڵێم هـەواڵی ئـەزانم ، راسـتی مـن بەرگـەی ئـەوە ناگرم هەواڵت نەدەم بە دایك وە من هەر ئێستا ئەچمە لایان .

رامیار : زۆر مەمنونی تۆم بە راستی خوا پاداشت بداتەوە .

کـــاردۆ: دەی خـــوا ئاگـــای لێـــت بێـــت ، هیـــوادارم ئـــەمجارە خـــوا هیدایـــەتی تـــۆ بـــدات و بـــە خۆتـــا بچیتـــەوە بزانیـــت چـــی ئەکەیـــەت بەڵام بە خەو خەیاڵ نا بەڵکو بە عەقڵ و راستی .

بـــەرەو مـــاڵی رامیـــار بەرێکـــەوتم کـــە گەیشـــتمە ئـــەوێ چوومـــە بەردەرگاکـــە لـــە دەرگـــام دا کـــەس وەڵامـــی نەدامـــەوە زۆرێکـــم لـــە دەرگـــا دایـــەوەو هـــەر وەڵام نـــەبوو راســـتی یەکـــەی ماوەیـــەکی زۆری پێچـــوو تـــا رامیـــارم دۆزی یـــەوە . دراوســـێ یـــەکیان هاتـــە دەرەوە پـــێ ی ووتـــم کـــە لعلـــی خـــان ئێســـتا لـــە و خـــانووە نـــەماوە

لای کچەکــەی ئــەژی لەبــەر ئــەوەی مێردەکــەی لــە خەســتەخانە خســـتویانەوە دکتـــۆر ئیزنـــی داوە ، منـــیش ناونیشـــانی مـــاڵی کچەکــەیم وەرگــرت و بــەرەو ئــەوێ بەرێکــەوتم ، کــە گەیشــتم ، بینیمــی نەیناسـیمەوە سـەرەتا پاشـان کـە پـێم ووت کـێم باوەشـی پیـا کــردم وو ووتـــی ئـــەی توخـــوا هـــەواڵی رامیـــار ، ئـــەوەی کـــە پێویسـتی کـرد پـێم ووت بــەس بەراسـتی درۆی ئــەوەم کـرد کــە ووتـم ئــەخوێنێ توانــای نــی یــە بێتــەوە بــەڵام چییــان بوێـت بۆتــان ئــەنێرێ ، ووتــی پــێ ی بڵــێ هــیچم نــاوی خــۆیم ئــەوێت لــە کــوی بێت ئەچم بۆ لای .

راسـتی یەکــەی کــە زانـیم وەزعەکــە وایــە تەلــەفونم کـردەوە بــۆ رامیـار و تـێم گــەیان ووتــی باشــە رێگایــەك ئەدۆزمــەوە ئــەیهێنم بـۆ لای خـــۆم ،ئیتـــر ئـــەو ماوەیـــە ســـەرقاڵی رێگـــەو شـــوێنی رەوانــەکردنی دایکــی بــووم بــۆ لای تــا تــوانیم بیگەیەنمــە لای ئیتــر بەراسـتی ئیسـراحەتم کـرد ئـەو رۆژەی دایکـی بـەرێ کـەوت بـۆ لای رامیـــار ماوەیـــەك دوای ئـــەوە باوکیشـــی کـــۆچی دوای کـــردو ئەویشـــمان ناشـــت ، دنیایـــەکی ســـەیرە کەســـیان نـــەما لـــە ناکـــاوێ ئەمــە ئــاخۆ چ نسـیبێ بێـت ئـاوا لــە مـرۆڤ ئـەکات ، بــەس گرنــگ دایکـــی پـــێش مردنـــی رامیـــاری بینـــی یـــەوە راســـتی دوای ئـــەوە

نـــازانم رامیـــار چـــی بەســـەر  هـــات چونکـــە دوو جـــار تەلـــەفونم بـــۆ کرد داخرابوو ئیتر دەنگیم نەبیستەوە لە دوای ئەوە .

لـــە دوای ئـــەو  هـــەموو کێشـــانەو ئـــەو  هـــەموو نەهامەتیانـــەی بینـــیم تـــەواو مانـــدوو تـــەنیا بـــو بـــوم لـــە نـــاخی خۆمـــدا بریـــاری ئـــەوەم دا بـــوو کـــە چیتـــر بیـــر نەکەمـــەوە ، هەســـتەکەم گەیشـــتومەتە ویســـتگەیەك ئیتـــر حەوســـەڵەی موجـــامەلەو قســـەم نـــەماوە نـــە تاقـــەتی کەســـم هەیـــە بـــۆی بـــژیم و نەپێویستشـــم بـــە کەســـە بـــۆم بـــژی گەیشـــتومەتە پێگەیـــەك تاقـــەتی خـــەو بینیشـــم نـــەماوە ، نـــازانم ئەمـــە ئـــەبێ ژیـــری بێـــت ، باشـــە ئەمـــە ژیـــری بێـــت جـــا خـــۆ کـــاتێ بـــە مـــن گەیشـــتووە ئیتـــر سـوودی نـــی یـــە ژیـــر بـــم یـــان گـــەمژە ، نـــازانم بـــەڵام  بـــەخوا کـــە لـــە پـــارە و عەشـــق و دیـــن نزیـــك کەوتیتـــەوە نیـــوەی مێشـــکت ئەفـــەوتێنی ، جـــا هـــەر یـــەکێکیش لـــە ئێمـــە بەشـــێکی بـــاش لـــە نـــاو  هەموویانـــدا ژیـــاوە ئیتـــر ئـــەبێ چیمـــان پـــێ مـــابێ لـــە عەقڵـــدا ،تەمەنـــەم وا بەهـــەمان شـــێوەکانی رۆژانـــە دووبـــارە بۆتـــەوە ئێســـتا چـــل ســـاڵم ، هەســـتەکەم لـــە ئێســـتا بـــە دواوە چـــەنێك چاوەکـــانم کـــزە دە ئەوەنـــدەی تـــر بینیـــنم بـــۆ ژیـــان روونتـــر بۆتـــەوە هەســـتەکەم ئێســـتا باشـــتر ئـــەبینم باشـــتر ئەناســـم باشـــتر رێ ئەکـــەم تەنانـــەت چێـــژی تـــەنیایی یەکـــەم

تـــامی زۆرتـــره ، بـــەڵام بەراســـتی تەمـــەن نـــا بـــەس خـــەم پیـــری کردین .

بەراســـتی بریـــارم داوه ئیتـــر واز لـــە ئیشـــی حکومـــەت بێـــنم هەســـتم کـــرد مـــن گیـــرۆدەی ئیلتزامێکـــی بـــەتاڵ بوومەتـــەوه ، نـــەم ئـــەتوانی لـــە نـــاو ئیشـــی دەوڵەتـــدا بمێنمـــەوه ، بۆیـــە بریارمـــدا کـــە دووکانێـــك بکەمـــەوه لـــە نـــاو بـــازاردا ئیشـــی سەربەســـت بکـــەم حەزەکـــەم ئـــەم شـــێوەیەش تـــاقی بکەمـــەوه بۆیـــە مۆڵـــەتم وەرگـــرت بـــۆ مـــاوەی ســـاڵێك و دووکـــانێکم کـــردەوه ئـــەوەی ســـەیر بـــوو بینیـــنم ئـــەوێ جیهـــانێکی جیایـــە مەملەکـــەتێکی تـــره زۆری جیـــاوازه لـــەوەی مـــن لـــە ناویـــدا ئەژیام .

دوکـــانێکی ووشـــکەم کـــری بـــەو پارانـــەی کـــە تـــا ئێســـتا کـــۆم کردبـــووەوه و لـــە نـــاو بـــازار خـــەریکی کـــرین و فرۆشـــتن بـــووم راســـتی ســـەرەتا شـــارەزا نـــەبووم ئیتـــر وورده وورده خـــۆم خـــەریك کردبـــوو گرنـــگ هەمیشـــە ســـەرقاڵ و مانـــدوو بـــووم کـــاتی بیرکردنـــەوەم نـــەمابوو بۆیـــە بـــەس ئـــیش و خـــەوم ئـــەزانی و هیچـــی تر .

رۆژێك لە دووكان بووم كەسێك هاتە لام سەر لە نوێ دەرگای شتە كۆنەكانی لێكردمەوە كە راستە جار جار ئەهات و شتی لێ ئەكریم بەڵام ئەمجارە بە شێوەیەكی جیا هاتبوو شتیكی گەورەشی بە دەستەوە بوو سەیرم كرد .

لەنیا : ئەم كاتەت باش كاك كاردۆ.

كاردۆ: ئەم كاتەی تۆش باش لەنیا خان ئەوە ئەزانی لە كەیەوە نەهاتووی بۆ ئێرە لەوەئەچێ نۆك و فاسۆلیاكەمان نەكڵۆك بێت ، وا نی یە ؟

لەنیا : نا ئەسڵەن تا ئەو رۆژەی ئەمرم لە غەیری لای تۆ نەبێ نۆك و فاسۆلیا ناكرم ، من و تۆ ژیانێكە پێكەوەین بیرت ماوە كەی بوو لە كوێ بوو ئەزانی من لە كەیەوە تۆ ئەناسم كاردۆ ، بیرت دێت یەكەم جار یەكمان بینی كە مناڵ بووین ، پێم بڵێ چۆنی دەنگ و باس ؟

كاردۆ: من باشم خراپ نیم ، ئەی تۆ باشی ؟ ( لە مێشكمدا بیرم لەوە دەكردەوە ئەمووت كاتێك باسی یادەوەری یەكەم ساتی بینیتی بۆ كردی ، بزانە كە رەگەكانی عەشقی تۆ تازە

لـەناخیا ڕۆچـووە بـە قـوڵایی ڕۆحیـا هـەرگیز نـاتوانیّ لـە یـاد بکـا ).

لـەنیا باشـم هـەر وەك خـۆمم ، ڕاسـتی یەکـەی بـۆ شـتێك هـاتووم بـۆ لات ، نازانم ئەمەویّ بۆچوونی تۆ وەرگرم .

کاردۆ : فەرموو بزانم ئەمرکە .

لەنیا : لێرە نابیّ ئەگەر بکریّ لە کافی یەك دانیشین .

کـاردۆ : بـە پێکەنینـەوە جـا مـن ئێسـتا دوکانـدارم بـە کـەڵکی کـافی و مافی دێم ؟

لــەنیا : نــا نــا ئــەتوانی ، ســبەینیّ ســەعات ســیّ لــە کافێکــەی لای مــاڵی خۆتــان ، بەراســت ئــەم وێنەیەشــم بــۆ هێنــاوی بــە دیــاری حەزەکەم لە دوکانەکەت هەڵیواسیت .

کـاردۆ : باشـە دەسـت خـۆش ، وێنەکـەی بـە دەسـتی خـۆی کردبـوو ، بەراســتی هەســتێکی ســەیری تێــدا بــوو وێنەکــەی ، بەراســتی زۆر جارفلچــە لــە زمــان جــوانتر قســە ئــەکات و لــەو ووشــەش جــوانتر دەر ئــەبریّ ئــەم فلَچەیــەی ئــەویش هەســتم ئــەکرد یــەك

رۆمانــه لــەم تابلۆیــەدا ، تــا ســەیرت بکردایــە خوێندنــەوەت زیــاتر ئەبوو بۆی.

کاردۆ: بەسەر چاو بێخەم بە لەوێ ئەبم .

لەنیا : باشە سوپاستەکەم دە با ئێستا برۆم ، خوات لەگەڵ .

کاردۆ: خوات لەگەڵ ، تا سبەینێ .

دوکانــــدارێکی تەنیشـــتم هـــەبوو کـــورێکی گـــەنج بـــوو کـــۆلیژی کــارگێری تــەواو کردبــوو وەك مــن زیــاتر ئــەمتوانی لەگــەڵ ئــەو مامەڵــە بکــەم ئــەوانی تــر هــەر لــە منــاڵی یــەوە لــەو گوزەرکــەدا بــوون بۆیــە ئــەوان زیــاتر بــە زمــانی بــازار راهــاتبوون بــەڵام مــن و ئــەو شــارەزایی یــەکمان نــەبوو لــەو زمانــە کــاتێ لــەنیا رۆیشــت ئــەو هاتە لام و وتی نیوەرۆت باش کاك کاردۆ .

کاردۆ: نیوەرۆت باش کاك کەمال .

کـــەمال : ئـــەرێ کـــاك کـــاردۆ ئـــەڵێن دۆخەکـــە بـــەرو خراپتـــر ئەروات تۆ لە وبروایەی وا بێت یا بۆچوونی تۆ جیاوازترە ؟ .

کــاردۆ: نــازانم چــی لــێ دێــت بــە تــەواوی بــەڵام ئەوەنــدە ئــەزانم هــەموو بابــەتێك ئــەبێ بگاتــە ترۆپێکــی خراپــی ئــەو کــات چــاك

ئـەبێت ئێمـەش هێشـتا ماومانـە خراپتـر بێـت تـا بگاتـە ئاسـتی بـاش بـوون ، ئـەزانی چـی کاکـە ئێمـە کێشـەکەمان لـەوەدا بـووە گەشـە کـردن و هەڵتۆقینەکـەمان ئاسـایی نـەبوو ئێمـە هـەموو رێسـاکانی رامیاری و ئابووری و مەدەنیەتمان شێواندووە کاکە .

کریارێك : ئابرام دوو کیلۆ چا م بەرێ .

کاردۆ : بەسەر چاو .

کەمال : تێنگام چۆن .؟

کـاردۆ: بـرام ئـەوەتا سـەیری بکـە کـابرا تـا دوێنـێ فلسـێکی نـەبوو ئێسـتا نـەك هـەر خـۆی بگـرە کچەکـەی سـەیارەیەکی پـێ یـە پـارەی گیرفـانی سـەد کەسـی وەك مـن و تـۆی پێـداوە باشـە ئەمـە لـە کـوێ و بـەچی ؟ سـەیری پیاوەکـانی ئـەم وڵاتـەت بـۆ ئەبـەن بـەرێوە بـە نـاوی سـەروەری نیشـتیمان و ئـاڵای وڵات و سەربەسـتیمانەوە ئـەم نیشـتیمانەیان پـڕ کـردووە لـە خـوێن و نەهامـەتی و زەلیلـی تەنانـەت خۆلەکەشـیان دزی سـەیرکە براکـەم ئـەوەتا هـەرچی نامـەرد هەیـە بـە دەسـەڵات گەیشـت، بـەهۆی کەرێتی ئێمەوە.

کـەمال : بـەخوا منـیش ئـەڵێم ئەمانـە بـە زەبـری چـەك نـەبێ لانـاچن تا ووشك ووشكمان نەكەنەوە .

کـاردۆ: نـا مـن لەگـەڵ ئـەوەدا نـیم بـەو شـێوەیە شـەر کاتێـك ئـەبێت کــە ئیتــر هــیچ رێگەیــەك نــەمابێ بــۆ بەدەســت هێنــانی مافــەکان بــەڵام ئێمــە هێشــتا هــەنێکمان مــاوە کــەی ئــەو هەنەشــمان نــەما ئــەو کات بە چەك .

کـەمال: ئـاخر خـەڵك لـەوە ئەترسـێ بـە رێگـای کـە بیکـا و کەسـانی تر سوودی لێ ببینن و بیقۆزنەوە .

کـــاردۆ : ســـەیرکە ئـــەوان تـــا ئێســـتا ســـوودیان لـــە کـــەرێتی و ترســـنۆکی و هەلپەرســـتی زۆرێـــك خـــەڵك بینیـــوە بۆیـــە تـــا ئێـــرە بۆیــان چۆتــە ســەر بــەَڵام کاتێـك دێـت ئەوانــەش ســوودی نــامێنێ چوونکـە ئـەو خەڵکـەش تـا سـەر بـێ مێشـك نـابێ . ئـەم وڵاتـە وای لێهــاتووە هــەر کــەس بێتــە ئــەم وڵاتــە مــن ئــەبێ زمــانی گــورگ و رێـوی بزانــێ ، هــەر کــەس بیــەوێ لێـرە سـەرۆك بـێ پێویسـت ناکـا شـێرێکی ئـازا بـێ تـەنها ئەونـدە بـەس کۆمـەڵێ سـەگ و جەڵـەبێك کـەری هـەبێ ، هـەر کـەس بـۆ ئـەم وڵاتـە بـێ ئـەبێ گـەمژە بـێ یـا بــێ ویــژدان و و ترســنۆك بــێ گــەر وا نــەبێ ئــەوا یەکــەم شــەوی

لێـره ئـەتۆپیێ ، بـەڵام ئەمـە ئێسـتا وایـە ، دڵنیـا بـە تـا سـەر وا نـابێ ئاسـان چـاك ئـەبێت ئەگـەر بیانـەوێت ئەگەر پێداویسـتی و خەرجیەكـانی وڵات بەیەكسـانی دابەش بكـرێن، كۆمەڵگـا بەهەرشـێوەیەك بێـت یەكسـان دەبێـت و هەرگیـز نـابەرامبەری سیاسـی و گەنـدەڵی و كـۆمەڵایەتی سـەرهەڵنادات ، بـةلاَم ئةمانـةى ئيَمـة خؤيـان ويسـتى تيَكـدانى ئـةم ئزمـوون و ولاَتـةيان هةية ثىَ ئةضيَت نةخؤش بن نةخؤش .

كـەمال : بـەخوا راسـتەكەت چـی بكـەین ئـەبێ بڵێـین خـوا چـاكی بكات .

لـەم قسـانەدا بـووین و دراوسـێ دووكانێكمـان هـات وو ووتـی كاكـە ئـەو ئـەڵێن هێلكـە نـەماوە چیتـان هەیـە هـەمووی بشـارنەوە تـا گرانتر ئەبێت و بیفرۆشنەوە .

كاردۆ: جا برام ئەوە ماوەكەی بەسەر ئەچێ .

دوكانـدار : نـا خـەم نـەبێ پـێش وادەی بەسـەر چوونەكـە دە قـات زیا ئەیفرۆشیتەوە خەڵكەكە مەمنونیشە .

کــاردۆ : کــاك کــەمال مــن و تــۆ ئاســان دەرەقــەتی ئــەم بــازارە نایەین ئەزانی

کــەمال: گرنــگ بەشــی رۆژەکــەمان پەیــدا کــەین ئێمــە بــە تــەمای کەش کەشە و فشە نین ، خوا نەیبرێ باشە .

راســتی ئێســتا ئێــواران کــە ئەگەرێمــەوە ماڵــەوە تــەواو مانــدوو ئــەبم بــەڵام ئــەم ئێوارەیــە وا بریــار بــوو بچــم بــۆ مــاڵی جــوانرۆی هــاورێم ، ئەوەتەی ژنی هێناوە یەك جار چومەتە ماڵیان .

ســـەرەتا تەلـــەفونێکم بـــۆ کـــرد و پـــێم ووت بـــة تـــةمای ضـــیت ؟ ووتـــی هێمـــە دووکـــان بەیەکـــەوە ئەرۆینـــەوە . منـــیش لـــة دووکـــان چاوەرێم کرد تا هات بۆ لام .

کــاردۆ: بــەخێربێت وەرە دانیشــە بــا ئــەو شــتانە کــۆ بکەمــەوە ئێســتا ئەرۆین .

جـــوانرۆ : باشـــە بـــرام ، باشـــە وەڵای ئـــەوەی مـــن تەســـەورم نــەکردوە تــۆ ببیــت بــە خــاوەنی دوکــانی ووشــکە ئــاخر بــە شــەرەفم تــۆ شــتەکان وا ســەیرە یــەکێ تــۆی بناســیایە ئــەیوت ئــەبیت بــە پروفیسور یان بة نوسةر یان شتێکی لةو بابةتة .

کــاردۆ: راســتەکەی ئەمــە ســاڵێکە خۆشــم نــازانم چــۆن ئەیبــەم بــەرێوە بــەڵاَم بــەخوا لــە کــاری دەوڵاتــداری باشــترە ، چــی بکــەم ئەمــەم پــێ خۆشــتر سەربەســی زیــاترم پــێ ئەبەخشــێت ئــێ ئــەم وڵاتــەش وایــە پرۆفیسـور ئــەکات بــە تەماتــە فـرۆش و پاتــە لــەپێش ئەکات بە سەرۆکی پەرلەمان .

جـوانرۆ : راسـتەکەی دە تـۆ خێراکـە بـا تـۆش بـە منـەوە دەرنەکـەن لـە ماڵـەوە بـا دوا نەکـەوین زۆر تـۆ نـازانی بۆڵـە بـۆڵی ژن چۆنـە ، بابە تۆ ژن ناناسی قەپاتی موشکیلەت نی یە .

کاردۆ: بەسە رچاو .

کــە چووینــەوە مــاڵی جــوانرۆ ، خێزانەکــەی خــواردنێکی خۆشــی کردبــوو بەراســتی تــام و لـــەزەتی خــۆش بــوو هەســتم ئــەکرد جــوانرۆ لەبــەر خــاتری ئــەم تامــە خۆشــانەی خواردنەکــەی ئــەم ژنــەی هێنــاوە کــاتێکی خۆشــمان لــەوێ بــردە ســەر بــەدەم نــان خواردنەوە کەمێ باسی کاتی زوومان کردوو پێکەنین .

لــەدوای نانخواردنەکــە جــوانرۆ ووتــی ئــەڵی ی چــی بــە یــادی جاران بچینەوە چایخانەکە چایەك بخۆین ووتم باشە .

لە رێگادا .

جوانرۆ : کاردۆ باشە تۆ تاکەی ئاوا ئەمێنی بۆ ژن ناهێنی ، بە تەمایی چیت ؟

کاردۆ: بە تەمام بە تەنیا بژیم ، نا گاڵتە ئەکەم منیش ئەزانم لەم وڵاتە ژیانی تەنیایی تا تەمەنێك ئاسانە بەڵام دوای قورس دەبێت بۆیە منیش رۆژێك دێت ئەو بریارە بدەم بەڵام خۆ ئەبێت کەسێك هەبێت کە من بتوانم لەگەڵی بژیم چونکە لای من وا چاکترە بە تەنها خۆت خۆشحاڵ بیت، لەوەی لەگەڵ کەسێکدا بژیت و خۆشحاڵ نەبیت .

جوانرۆ : باشە ئەی ئەو هەموو ساڵە ئەو هەموو کەسەت ناسیوە چۆن کەس نەبووە بتوانێ بگونجێت لەگەڵتا .

کاردۆ: نا هەبووە ، من زۆرم لەو کەسانە بینیوە ، هەیان بووە گونجا بوون بۆ ئەوەی من بتوانم خۆشحاڵبم لەگەڵیلن ، بەڵام یان من لە بێ مێشکی و نەزانی خۆم جێمهێشتون یان ئەوان جێیان هێشتوم یان قەدەر هەردوکمان جێهێشتوە .

جـوانرۆ : بـەخوا بـرام تـۆ خـۆت لـەوە نـاچێ بزانـی چ جـورە ژنێـك ئەوێت .

کـاردۆ: بـۆ ژن نـەوعی هەیـە براکـەم ، بـروا بکـە هـەمووی وەك یەکن .

جـوانرۆ : نـا کاکـە وا نـی یـە ، ئێسـتا مـن ئـەوەتا ژنـم هێنـاوە و عـەیبم نـی یـە ژیـانم جێگیـرە و ئـەزانم کـەی دێمـە دەرەوە کـەی دەرۆمەوە پابەندم بە خێزانەکەمەوە .

کـاردۆ: ئـاخر مەسـەلەکە لەمەدایـە تـۆ عـەیب بـە چـی دانێیـت ؟ پاشـان جێگیـری چـی یـە ئـەبێ ئەمانـە هـەمووی پێناسـەی تـەواوی هەبێت ئەو کات مرۆڤ هەست بە بوونەکەی دەکات .

جـوانرۆ: یـەعنی مورتـاحم خـراپ نـی یـە وەزعمـان، هەنـدێك جـار کێشەمان ئەبێت بەڵام ئەوش هەر ئەبێت لە ژیانی هاوسەری .

کـاردۆ :باشـە مـن پرسـیارێکت لـێ دەکـەم تـۆ ژنەکـەت خـۆش ئەوێت ؟

جـوانرۆ : ئـەیچۆن بـە دڵنیـایی خۆشـم ئـەوێت و رێـزی زۆریشـی ئەگرم .

کــاردۆ: باشــە کەواتــە ئەگــەر منــاڵی نــەبوو ئامــادەی تــا مــردن بیمێنیتـەوە لەگـەڵی ؟ ئامـادەی تـا مـاوی لەگـەڵ ئـەو بژیـت و بیـر لـە مناڵ نەکەیتەوە ؟

جـوانرۆ : ئـەوە نـازانم بـەڵام ئـاخر خـۆ ژن هێنـان بـۆ هێشـتنەوەی رەســەنایەتی مرۆڤایــەتی یــە خــۆ تــەنها کــات بەســەر بــردن و سـیکس کـردن نــی یـە چـۆن ئـەکرێ لەگـەڵ ژنێـك بمێنیتــەوە کـە منــاڵی نـەبێت ئـەی ئـەو کـات کۆمـەڵێ هەسـت هەیـە مـن بـێ بـەش ئەبم لێ ی لە کاتێکدا ئەو شتە چارەی هەیە و ئەتوانی بیکەی .

کاردۆ: کەواتە ئەگەر مناڵی نەبێت وازی لێ ئەهێنی ؟

کـاردۆ: نـازانم بـەس بـە دڵنیـایی ژنێکـی کـە ئـەهێنم تـا مناڵمـان ببێـت منیش حەزی بە باوك بوونم تێدایە .

کــاردۆ : دە ئەمــە جیــاوازی یەکــەی مــن و تۆیــە لــە تێگەیشــتنی خۆشەویستی .

جــوانرۆ : بــەخوا هــەر وەك جــارانی شــێتم ئەکــەی ئەمشــەو مــن هــیچ تێناگــەم کاکــە کــەیفی خۆتــە مەیهێنــەو بــا بچــین چاکــەمان بخۆینەوە باشترە .

دوای چـا خواردنەوەکـە کـە گەرامـەوە ماڵـەوە بـە راسـتی بیـری شـتی سـەیر بـە مێشـکما ئـەهات هەسـتم کـرد ئەمشـەو بەراسـتی ئەمـەوێت لەگـەڵ تـەنیایم قسـە بکـەم ئەمـەوێت پـێ بلـێم کـە ئێسـتا .. مـن دوورم دوورتـرم لـە دوری تۆتـەنیایی ، هەنـدێ جـار ئەمـەوێ ئێـرە جێبـیلم .. ئەمـەوێ لێـرە نـەبم، ئەمـەوێ تـەنیایم تـێ بگەیـەنم کـە ئـەم منـی دڵنەواییـە بـۆ ئـەو ئـەم منـی پـر لـە خـەون و سۆزە بـۆ ئـەو ئێسـتا بـەفر تەزاندویـەتی ، ئـەی تـەنیایی مـن پەنجـەکانم کـۆن بـوون ، دەسـتەکانم رزیـن لـە تـۆدا ، قاچـەکانم خۆیـان بوونـە گۆچـان و پشـتم چـەماوە بـوو ، تـۆش ... هـەر وەك خـۆتی رۆژ لـە دوای رۆژ جـوانتر دەبـی ، وورده وورده ، پیتـەکانی نـاوی مـن، تێکـەڵی نـاوی تـۆ دەبـێ ئـەی تـەنیایی ، کـەچی لـە دێرێکـدا ناتوانم ناوی تۆش و خۆشم بنوسم.

تـەنیایم ئـەزانی هـەور گومـانی بارانـە ئـەی مـن گومـانی تـۆ نـیم، ئـەزانی لـە دوری تـۆدا ئاوێنـە تاقـەتی وێنـەی منـی نـی یـە ، بـاران تاقەتی تەری نی یە ، هەور چیتر نایەوێ بفرێ .

ئـەزانی تـەنیایم مـن بـۆچی ئاوهـاش بـە تـۆوە مـاوم ، چونکـە وورده جوانیـەکانی تۆیـە ئـەم تەمـەم پـێ ئەبەخشـێ کـە تییـدا سـەما بکەم .

ئەمشــەویش لەگــەڵ تەنیایــدا بــاوەش ئەکــەین بــە یەکــدا و تیــر تێــر ئــەنووین تــازە مــن و تــۆ هــاو ڕێگــەو هــاورێ و هــاو ســەرینی یەکترین.

بــۆ بــەیانی یەکــەی وەك رۆژەکــانی تــر نــەبوو ویســتی چوونــە دەرەوەم نــەبوو تەنانــەت بریــارم دا کــە ئــەو رۆژە نــەچم بــۆ دوکــان و دووکانەکــەش نەکەمــەوە ووتــم مــادام پــاش نێــوەرۆش ئــەچم بــۆ لای لەنیا ئەوا ئەمرۆ لە ماڵ ئەمێنمەوە .

زۆری رۆژەکــەم بــە خــەو بــردە ســەر چونکــە راســتی یەکــەی شــەو زۆر درەنــگ نوســتم لەگــەڵ ئــەوەی کــە مانــدوو بــووم بــەڵام بیرکردنــەوە تــەواو جــەنجاڵی کردبــووم . کاتێــك هەســتام کــات ئەوەنــدەی مــابوو کــە خــۆم ئامــادە کــەم و بــەرەو لای لــە نیــا بــەرێ کەوم

مــن لای خــۆم وام دانــا بــوو کــە زوو گەیشــتومەتە ئــەوێ بــە کاتژمێرێــك پــێش کاتەکــەی لــەوێ بــووم کــەچی کــە ســەیرم کــرد لــەنیا لــەوێ دانیشــتبوو . راســتی ئــەو کاتــەم بیــر هاتــەوە کــە دوا جــار بــوو پێکــەوە ئــاوا لــە کــافێ دانیشــین و لــەنیا بــە دڵ شــکاوی

رۆیشــتەوە راســتە لــەوە کاتــەوە دانــەبراوین لــە هاورێیــەتی بــەڵام هەرگیز بە تەنها پێکەوە نەبووین تا ئێستا .

کــە چوومــە ژورەوە هەســتم بــە دڵ تــەنگی کــرد لــە روخســاریا ، کەمی پەشۆکا بوو .

کاردۆ: ئەم کاتەت باش لەنیا خان .

لەنیا ئەم کاتەی تۆش باش بەخێر بێت ، فەرموو دانیشە .

کاردۆ: سوپاس ، باشە خۆ کاتەکە سێ بوو وانی یە ؟

لــەنیا : بــا بــا خــەم نــەبێ تــۆ دوا نەکــەوتی مــنم زۆر زوو هــاتووم خۆت من ئەناسی هەمیشە پێش ژوان لەوێ ئامادە ئەبم .

کاردۆ: دەی تۆش بەخێر بێت و منیش بەخێر بێم .

لەنیا : چی ئەخۆێت داوای بکە فەرموو ؟

کــاردۆ: راســتی مــن نانیشــم نــەخواردووە بۆیــە داوای نــان ئەکــەم ســەرەتا ئــەمرۆ هــەر لــە مــاڵ بــووم خــەریکی نوســتن بــووم وە هــیچ خواردنێکیشــم ئامــادە نــەکرد راســتی تاقــەتم نــەبوو پاشــان ئێســتا

کـــەمێ کێشـــم زیـــادی کـــردووە بۆیـــە هـــەوڵ ئـــەدەم کـــەم بخـــۆم یـــان جاری وایە لە رۆژێکدا تەنها ژەمێك ئەخۆم .

لـــەنیا : فـــەرموو بـــە ئســـراحەتی خـــۆت ، ئیتـــر ئـــەم ریجـــیم کردنـــەش ئێســـتا مۆدەیـــەتی چـــی بکـــەین کەســـانێك هـــەن چەنـــدەها کیلۆمـــەتر راکـــەن تـــا پارویـــەك نـــان پەیـــدا بکـــەن لای ئێمـــەش کەســـانێ هـــەن چەنـــدەها کیلۆمـــەتر راکـــەن تـــا پارویـــەك نـــان هـــەزم کـــەن ئیتـــر ئەمـــە دنیایە .

تـــا نانەکـــەم خـــوارد و چاکـــەم خـــوارد ئاســـایی هـــەر کـــەم قســـەمان ئـــەکرد و تـــەنها باســـی شـــتە ســـادەکانی رۆژانـــی یـــەکترمان ئـــەکرد تا پرسیارێکی لێ کردم زۆر سەیر بوو لام ووتی .

لەنیا : کاردۆ شتێك بڵێم پێت ناخۆش نی یە ؟

کاردۆ: چی یە نا بیڵێ ئاسایی یە ؟

لـــەنیا : بـــۆ تـــۆ هەمیشـــە ئـــەو کەســـانەت خـــۆش ویســـتووە کـــە ئـــەوان خۆشـــیان ناوێیـــت وە ئـــەو کەســـانەش خـــۆش نەویســـتووە کـــە ئـــەوان خۆشـــــیان ویســـــتویت ، هەســـــت ناکـــــەی ئەمـــــە وای لێکـــــردووی

هەمیشە تـەنیا بیت ؟ من لـە کۆنـەوە هەست بەمـە ئەکـەم لـە تـۆدا ئەزانی .

کـاردۆ: بـروا ناکـەم ئـەوە هۆکارەکـەی بێـت ، خۆشەویسـتی ئێسـتا لای مـن جیـاوازە لـەو گەمانـەی لـە منـاڵی و هـەرزەکاری دەمکـرد و دەمبیسـت ، مـن ئێسـتا بـە چـاوێکی تـر مـرۆڤ ئـەبینم وە ئـافرەتیش لای مـن ئێسـتا نەخشـەیەکی جیـایی هەیـە لـەوەی کـە جـاران هـێلم بـۆ کێشـا بـوو لـە دەرون و نـاخی خۆمـا بۆیـە مـن تـەنهایی خـۆم وابەسـتە ناکـەم بـە خۆشەویسـتی و رقـەوە ،لای مـن تـەنهایی خـۆی بـۆ خـۆی هونەرێکـە پێـك هاتەیەکـە لـە پارچەیـەك میوزیـك و دوو رەنگـی تێکـەڵاو لەگـەڵ چـوار دێـر شـیعر ، ئـەزانی تـەنیایی جیهانێکـە زۆر پرتـرە لـە جیهـانی قـەرەباڵغی لە تەنیاییـدا شـتەکا جـوانتر دەبینـی بـەس بـەخوا مـن وام لێهـاتووە نـازانم تەمـەنم چەنـدە ، ئەوەنـدە دەزانـم لەگـەل تـەنیای یـەك تەمەنین

.

لـەنیا : راسـتەکەی شـیکردنەوەکەت جوانـە ، بـا بچینـە سـەر ئـەو بابەتەی کە ئەمرۆ ویستم بتبینم بۆی .

بیـرو راسـتی مـن ئەمـەوێ جیـا ببمـەوە لـە مێردەکـەم ، تـەواو توانـای شـانۆگەری کـردنم نـەما ، مانـدوو بـووم ژیـانم بـەو شێوەیە بۆ ناچێتە سەر .

کـاردۆ: ئـەوە تـۆ چـی دەڵێیـت ، ئـەزانی مێشـکم وەری نـاگرێ بـۆ ئەمـە کـەی ئـەم بریـارەت داوە مـن هەمیشـە وام زانیـوە تـۆ ژیـانێکی خۆشـگوزەران و باشـت هەیـە سـەیرم لـێ دێـت وا دەڵێییت بۆ گەیشتویتەتە ئەو بریارە قورسە.

لـەنیا : لـەنیا بـۆ مێشـك وەری نـاگرێ ، ئـەڵێم تـەواو توانـام نـەما ئەوەنـدە ی تـر بـەردەوام بم هـیلاك بـووم تـۆ لـە ژیـانی مـن نـازانی تـۆ نـازانی مـن لـە چ جەهەننەمێکـدا ئـەژیم کامـە خۆشـگوزەرانی کە منی تێدام .

کـاردۆ: ئەترسـم هەسـت بـە دۆران یـان روخـان بکـەیت ؟ یـان ئەترسم شتەکان لە ناو خۆتدا تێك دابێت لە خۆت .

لــەنیا : کـــاردۆ مەرج نــیە هەمــوو جیـــابوونەوەیەك مانـــای دۆڕان بێــــت ڕەنـــــگە دوورکەوتــــــنەوە لەهەنـــــدێ کەس ســــــەرەتای ســەرکەوتنمان بێـت وە روخـانیش نــی یــە بــە پێچەوانــەوە مـن بــە نیــازم لــە ئێســتا بــەدواوە خــۆم بنیــات بنــێم ،هەســتەکەم تەمــەنم هــەمووی رۆیشــت بــێ ئــەوەی تــامی بەختــەوەری بکــەم ،ئــێ منـیش مـرۆڤم مـافی ئـەوەم هەیـە بـژیم هەناسـە بـەم بگـەرێم پێبکـەنم بفـرم تـەواو مـافی ئـەوەم هەیـە پشـوو بـەم هەسـت بـە بـوونی خـۆم بکەم .

کــاردۆ: راسـتی ئـەوە ژیـانی تایبـەتی خۆتـە خـۆت باشـتر ئـەزانی بەڵام من وام پێ باشە پەلە نەکەی .

لـەنیا : کـاردۆ هەنـدێ جـار هەیـە کـە دڵـت دەیـەوێ لـە نـاوەو بگـری دەیــەوێ بقیژێنــێ هــاوار بکــا ، هــیچ ووشــەیەك پــێ نــامێنێ تــەنها ئــەبێ بــە فرمێسـك قسـە بکـەی ئـەبێ بـە گریـان شـتەکان بڵــێ ی ، هەنــدێ جــار هەیــە دڵــت ئەیــەوێ یــەکێ ببینــێ ئەیــەوێ پــر بــە گــەروی بانگـت بکـا .ئێسـتا لـەو جارانەیـە ئەمـەوێ لەبـەر دەم تـۆدا بگریم ، بگریم تا فرمێسکەکانم ووشك ئەکات .

راستی من ترسەکەم هەمیشە لەمەیە کاتێ لەگەڵ لەنیا ئەبم لە ووشەکانی تێ ئەگەم ، کاتێ ئەڵێ ئەمەوێ لەبەردەم تۆدا بگریم ئەوە ئەو کاتە ئەو لە هەموو کاتەکانی تر زیاتر منی خۆش دەوێ منیش هەمیشە لەو کاتە ئەترسم ، نازانم من ئەو هەموو ساڵە چەنێك ویستم لە هەستەکانم را کەم چەنێك ویستم ئەو منداڵەی ناخم خەفە بکەم و بیخنکێنم ، ویستم هەست نەکەم کە منیش مرۆڤم ، کەچی ئەم قەدەرە شومە هەمیشە ئەمدۆرێنێ .

کاردۆ : نازانم چی بڵێم لەنیا گیان چەنێك ئەتەوێت بگری چیت ئەوێت بیڵێ بەڵام پەلە مەکە لە هیچ بریارێکدا با لە پاشا پەشیمان نەبیتەوە.

لەنیا : کاردۆ گیان من ماندوو بووم وون بووم وون ، خۆم بۆ نادۆزرێتەوە لەگەڵ خۆمدا هەمیشە شەر ئەکەم ، لە هیچی خۆم تێناگەم ، هەستەکەم لەگەڵ خۆمدا دوژمنم ، تا کەی وا بم پێم بڵێ ، ئەمە چ قەدەری شومە ئاوام لێ ئەکا من و ئەو پیاوە لە چوار مانگدا دوو شەو یەك نابینین ئەو یا لە دەوامە یا لە نادی یە یا لەگەڵ هاورێکانی یا لە عیادە یا لە عەمەلیات بێزار بووم هیچ بوونێك بۆ من دانانێ وا ئەزانێ خزمەت کاری لە ماڵەوە

راگرتــووه نــازانێ منــیش مــرۆڤم هەســتم هەیــە پێویســتم هەیــە ، ئەمــەوێ بـزانم ئـەژیم یـان نـاژیم تاقـەتم نـی یـەو شـتەکان هـەمووی بـاس بکـەم بـروا بکـە قیـزت لـە پیـاو دێتـەوە بیبیسـتی بـا لـەوە زیـاتر نەڵێم باشترە.

بەراسـتی فرمێسـکەکانی ناخیـان سـر کـردم هەسـتم کـرد چەنێکـە لـە نــاوەوە پــرە لــە ئــازار ، هێــدی هێــدی فرمێســکیش بــە چاوەکــانی منـدا هاتـە خـوارێ ویسـتم قسـەی بـۆ بکـەم بـەڵام قـورگم تونـد تونـد بــوو ووشــەم بــۆ نەهاتــە دەرێ .هــیچم بــۆ نــەوترا تەنانــەت ئەمویسـت فرمێسـکەکانی خۆشـم بشـارمەوە ئـەو قسـەی بـۆ کـردم منــیش خــەیاڵ و بیــرم لای ئــەو رۆژانــە بــوو کــە ســەرەتا ئــەوم ناســی بیــری رابــردووم کەوتــەوە ئــەویش بــەدەم گریانــەوە وام هەســت ئــەکر لــە دەشــتێکی چۆڵــداین هەســتم بــە مێزەکــانی تەنیشـتمان نـەمابوو ، ئاگـام لـەوە نـەبوو کەسـانی دیمـان لەگەڵـە ، تێکــەڵێ فرمێســکەکانی ئێســتایی و ئەوانــەی رابــردووی بــووم ، ئـەویش هـەر ئـەیووت مـن چـیم کـردووە خوایـە بـۆ وام بەسـەر دێ ئــاخر بــۆ ئــەبێ هــەر لــەم جەهەنەمــەدا مــن بســوتێنرێم هــەموو رۆژێکم ئازار و خەم و خەفەت و گریان بێ تا کەی .

کـاردۆ: لـەنیا گیـان لەسـەر خـۆ بـە بـروا بکـە مـن هیچم بـۆ نـاوتریَ بـەڵام چـەنێك ئـەتوانی بگـری بـا ناخـت لـە هـەموو ئازارەکـان پـاك بێتەوە بگری پر بە قوڵای بوونت بگری

لــەنیا :کــاردۆ مــن تــەواو نــاتوانم لەگــەڵ ئــەودا بمێنمــەوە ، مــانەوە لەگەڵ کەســـێک کە قەدرت نازانێـــت وەفـــاداری نیـــیە بەڵکـــو گەمــژەییە ، منــیش نامــەوێ ئیتــر لــەو زیــاتر گــەمژە بــم و وون بــم و دۆراو بـم نامــەوێ تــەواو مــن کەسـێکی ئەوەنــە بــێ کــەڵك نـیم لەبـەر ئـەو خـۆم لـە نـاو بـەم مـن ئەمـەوێ ئیتـر هەسـت بـە بـوونی خـۆم بکــەم تەنانــەت نامــەوێ حســاب بــۆ کۆمــەڵگا بکــەم ئــەی مــن مــەرگی خــۆم ببیــنم هــەمو رۆژێ تــەنها بــۆ ئــەوەی ئارەزوەکــانی کۆمەڵگا وێرانەکەم بێتە دی .

کــاردۆ: مــن نــاتوانم هــیچ بریارێـك بـۆ تـۆ بـدەم ئـەوە ژیـانی خۆتــە سەربەسـتی چـۆن ئـەژیت بـەڵام مـن پـێم وایـە لەوانەیـە رێگـەی تـر مابێـت تـا تـۆ بتـوانی ئـەو تێبەگەیـەنی و نزیـك بنـەوە لـە یـەك بـروام پـێ بکـە ئـەو شـتەش وا ئاسـان نـی یـە مـن نـازانم تـۆ چـۆن ئـەژیت چـۆن هــە ڵسـو کــەوت ئەکــەیت مــن نــازانم ئــەو کــێ یــەو چۆنــە لەوانەیــە هـــەموو ئەمانـــەی تـــۆ ئـــەیڵێت ئـــەویش هـــەمان ئـــەم خەمانــەی هــەبێ تــۆ وا باشــترە ئــەو بناســی لای ئــەو ئــەم خەمانــە

بڵـێ بـرژە لەبـەردەم ئـەودا  ئەگـەر زانیـت سـوودی نـی یـە ئـەوە بـە دڵنیـایی مـافی خۆتـە بژیـت و کەرامـەت و خـودی خـۆت بپـارێزی بـۆ دوا جـار هەوڵبـدە لـە دوای ئەمـە کـە ئـەو دەرگایـەت داخسـت هــەرگیز نەیکەیتــەوە بۆیــە بریــار و عــەقڵ لای خۆتــە یــان ئــەبێ تــەواو بــاش بێـت یـان واز بێنـەوە ژیـانێکی تـازە بـژی بـۆ خـۆت ئـەوە مـافی خۆتـە چیشـت بوێـت مـن بـۆت ئەکـەم مـن ئەونـدە ئـەزانم مـرۆڤ یـەك جـار ئـەژی پێویسـت ناکـات ئـەو جـارەش بـە خـەم و مەراقەوە بەسەر ببات .

لــەنیا : ســوودی نــی یــە هــەوڵم داوە زۆر بــەڵام ســوودی نــی یــە ، پیـــاو لـــەم جیهانـــەدا بەرێگەیەکـــدا ئـــەروات زۆر دورە لـــەو رێگەیـــەی ئافرەتـــەکان پێیـــدا دەرۆن ، تەنانـــەت حـــەزو ئارەزوەکانیشـیان زۆر لـە یـەك دورە مـن تێناگـەم بـۆ ئـەبێ هـەر بـە یەکیشـەوە بـژین ، هـەتا ئێسـتاش نـە پیـاو توانیـوێتی ئـافرەت بناسـێ نــە ئــافرەتیش پیــاو ئەناســێ ئێمــە دوو مــەخلوقی لەیــەك وونــین کـاردۆ گیـان ، مـن و ئـەو هیچمـان لـە یـەك نـاچێ بـە هـیچ پێـك ناگەینـــەوە ، قورســـە قـــورس زۆر مـــن هـــەر ئەمـــەوێت بـــە ووشـیاری و عـاقلی رەفتـار بکـەم بـەس هەسـتەکانی خـۆم خەریکـە ئــەمخنکینێ بــروا بکــە ، ئــەزانی ئێســتاش هەمیشــە قســەکەی تــۆم

بـەبیرە کـە ئـەتووت ئەگـەر کۆتـایی یـەکانمان بزانیایـە وازمـان لـە زۆرینـــەی ســـەرتاکان دەهێنـــا چەنـــدێکیش خـــۆش بوونایـــە. .مـــن سەرەتاکەشـــەم خـــۆش نـــەبوو کۆتایشـــم رەش رەش بـــوو مـــن هـــەر هـــەوڵم دا دەوروبەرکـــەم فێرکـــەم وەك مـــرۆڤ لەگـــەڵما هەڵســـو کـەوت بکـەم کـەچی ئەوانـە هـەر وەك ئـاژەڵ سـەیریان کـردم شـێت بـووم تـەواو  بـە قسەشـت دەکـەم دوا فرسـەتی ئـەدەمێ و قسـەی لەگـــەڵ ئەکـــەم بـــەڵام ئەگـــەر نـــەگۆرا بـــە دڵنیـــایی ئیتـــر بـــێ بیرکردنەوە واز ئەهێنم .

لـــەو کاتـــەدا لـــە کـــافێکی گـــۆرانی یـــەك دەنگـــی ئـــەهات گـــۆرانی بێژەکە ئەیووت تەنیا بەو رێ بکە تا بە هێمنی ئەمرێت .

کاردۆ : لەنیا گوێ لەو گۆرانی یە بگرە .

لـــەنیا : راســـتەکەی کـــاردۆ مـــرۆڤ لێـــرە وا باشـــترە تـــەنیا بـــێ تەنیایی لێرە ناسنامەی بەختەوەری یە .

هەستم کـرد لـە نـاو لـەنیادا دێرێـك هەیـە ئـەڵێ لـە نێـوان مـن و تـۆدا یـــەك هـــەنگاو هەیـــە بـــەڵام بـــە تێپـــەر بـــوونی هـــەموو کاتـــەکان ناگەین بە یەك.

کــاردۆ: تــەنهایی خــۆی بــۆ خــۆی هونەرێکــە پێــك هاتەیەکــە لــە پارچەیــەك میوزیــك و دوو رەنگــی تێکــەڵاو لەگــەڵ چــوار دێــر شــیعر ، ئـــەزانی تـــەنیایی جیهانێکـــە زۆر پرتـــرە لـــە جیهـــانی قـــەرەباڵغی ، لە تەنیاییـــدا شـــتە جوانەکـــان دەبینـــی ، جـــوانتر دەبیستی .

لــەنیا : زۆر شــت هــەبوون ئەبوایــە زووتــر تــێ بگــەین بــەڵام ئێمــە کێشــەکەمان ئەوەیــە کاتێــك عاقڵیمــان پــێ ئــەگات ئیتــر سـوودی نــی یە بۆمان .

کــاردۆ: رێــك وایــە ئەوکاتــە بیــرو هۆشــمان ئــیش ئــەکات کــە ئیتــر نــاتوانین وەك جــاران گــوزەر کــەین ئــەزانی بــۆ ؟ لــەنیا تــۆ قــەت پرســـیارت لـــە خـــۆت کـــردووە بزانـــی کـــێ دەتـــوانێ ووردە ئاگرەکـــانی تـــەنهایی ببڕێـــت ؟ کـــێ لـــە توانایدایـــە مێـــژووی شمشـێرەکانی بـڕین بسـڕێتەوە؟ کـێ دەتـوانێ چیاکـان بکاتـە کـۆڵ و دەردەکان لەناو چەوان نێ ؟

کـــێ دەتـــوانێ گەردیلـــەکانی ئەبەدیـــەت کـــۆ کاتـــەوەو؟ ڕوومـــەتی کەرامـــەتی مرۆڤـــی پـــێ بسـڕێ کـــاتێ ئەشـــکێ ؟ کـــێ دەتـــوانی حــەزی هــەورەکان بداتــە دەســت بــاران بــێ ئــەوەی تــەڕبێ ؟ کــێ

دەتـوانێ ڕوونـاکی ڕۆژ بکاتـە باوەشـی و نەسـوتێ ؟ کـێ دەتـوانێ ئەسـتێرەکان لەبوخچەیەکـدا بداتـە دەسـت مانـگ ؟بـێ ئـەوەی تاریکی دڵی زیز نەبێ.

کـێ فرمێسـکی دایکـەکان دەگرێتـە باوەشـی ؟ کەنـەهێڵێ چاوەکانیـان بتـۆرێ وەختـێ جـەرگی ئەسـوتێ . کـێ دەتـوانێ بـۆنی گوڵێـك بکـات، هـەزاران پەپولـە دەوریـان دابێـت ؟سـیمای وێنەیـەك نیگـار کـا، هـەموو نیگارکێشـەکان فڵچـەیان بـۆ ڕەنـگ کردبێ.؟

کـێ دەتـوانێ بـەپێی کیسـەڵێك سـەفەرکا. وەختـێ کەروێشـکەکان مـەودایان لـێ گرتبـێ؟ کـەس ئەمانـە نـاتوانێ چونکـە ئەمانـە مرۆڤی ئەوێت مرۆڤ .

لـەنیا : سەرسـام کـردم کـاردۆ گیـان راسـتە کـەس ئەمانـە نـاتوانێ بەراسـتی بـاش وردت کردۆتـەوە ، لـیم ببـورە مـن ئـەمرۆ تـۆم سـەرقاڵ کـرد بـە خۆمـەوە ئیتـر چـی بکـەم هـاورێ نەبویتایـە نـەك هـەر هـاورێ ئـەزانی کـاردۆ مـن بەراسـتی لەوەتـەی هـەم تـۆم خـۆش ویسـتووە زۆر زۆر گرنـگ نـی یـە لام بـە چ شـێوەیەك بێـت گرنـگ وەك رۆحـی خـۆم هەمیشـە خۆشـم ئـەوێیت ، بـروا

بکــە نەمــەزانی چــی بکــەم بۆیــە ووتــم بــا قســە لەگــەڵ تــۆ بکــەم باشـترە هەرچەنـدە مـن بریـارم داوە کـە بـە هـەر شـێوەیەك بێـت ئـەم جۆرە ژیانەی ئێستام بگۆرم .

کــاردۆ: نــا ئاســایی یــە بــە پێچەوانــەوە مــن بەختــەوەر بــووم کــە بتــوانم کــەمێ لــە خەمــەکان بگرمــە بــاوەش وە مــن بــاش ئــەزانم خـۆت کەسـێکی ژیـری باشـتر ئـەزانی بـۆ ژیـانی خـۆت چـی باشـە ئــەوە هــەڵبژێرەو بیکــە ، راســتیش ئەکــەیت مــرۆڤ یــەك جــار ئـەژی وە ئـەوەش بـاش بزانـە منـیش بەراسـتی تـۆم خـۆش ئـەوێت وەك خــۆت وتــت گرنــگ نــی یــە لای منــیش بــە چ شــێوەیەك گرنگ هەمیشە خۆشم دەوێیت .

لــەنیا : بــا بــرۆین کــات زۆر درەنگــی کــرد ئێمــە گەشــتیارین لەسەر رێگەی خۆشەویستی ، بە دڵنیایی یەکتر ئەبینینەو .

راسـتی کـرد تـەواو دنیـا تاریـك بوبـو بـەڵاَم ئێمـە هەسـتمان پێنـەکرد ، بۆیە بە پێ بەرەو ماڵەوە بەرێکەوتم .

ئــای ووشــە بــێ بۆنــەکانم تەمــەن وا جێمــان دێڵــی و ئێــوەش نەتانـدوانم تاڵــە کـانی قـژم هـەمووی سـپی کـرد بـە دیـار رەشــی

ئێـوەوە نە ئێـوە ...شـیعرێکی نوێتـان بـۆ چنـیم نە منـیش...عاشـقانە هەڵوەریم بۆتان ئێوە بۆ ئازاردانی من هاتوون خۆتان نا

یادگاریـــەکانتان، ئـــەوتا هـــەموو رۆژەکـــانی پێشـــووم دێننـــەوە بـەرچاو بـە پێکـەنین و ئـازارو گریـانی یـەوە مـن ئەمـەوێ سـەما لەگـــەڵ دوکەڵـــدا بکـــەم ، ئەمـــەوێ بـــە پلیکانـــەکانی هـــەوردا سەرکەوم ، ئەمەوێ یەك جار دەریا بەم بە خۆمدا و بنووم

یــەك جــار لەگــەڵ بــا دا ســەفەر کــەم. ئــەمڕۆ ، ئــەمڕۆ مانــگ ، ئەستێرەکانم وەك

نــوقڵی بــەرات دەداتــێ ، تاوســەکان وێنــەکانی منــاڵیم بــۆ ڕەنــگ دەکــەن ، ئــەمڕۆ دەریــا بەشــەپۆلێ باڵــەفرێم پــێ دەکــات ، ماســی ســەدەفەکانی مــرواریم بــۆ یــاریکردن پــێ ئــەدا ، هــەورەکان بــاڵی بــارانم دەدەنــێ تــا چاوەکــانم خــۆی پــێ تــەربکات . ســبەینێ ......ســبەینێ چــاوەڕوانی ماچــەکانی شــەونمم تــا فرمێســکەکانی دوێنێــی پــێ بسـڕمەوە چــاوەڕێ ی ئاونگــەکانی بــەیانم تــا بــاڵی کۆترەکــانی دوێنێــی پــێ سـپی بکەمــەوە چــاوەڕێی ســەوزایی چڵــە گیایــەگی بــەهارم تاڕەنگــە زەردەکــەی پــایزی پــێ ســەوز کەمــەوە ئــاخر مــن رەشــە بیرەکــانی دوێنـێم نــەما بــۆ یــە غــەمگین نــابم گــەر

سبەینێش نەبینم ئەمڕۆ لەباوەشی بوونی ئەمڕۆدا خەو ئەبینم. گەیشتوینەتە ویستگەیەك کە ئیتر داهاتوومان باشتر نابێت لە ئێستا و رابردوومان......

ئەمرۆش تامەزرۆم بڕۆم بە تەنها بڕۆم ..بەبێ هیچ بەستنەوەیەك ، بەبێ رابردووم ، بەبێ داهاتوو ، بەبێ بیرکردنەوە ، بەبێ کەس ، تەنانەت بەبێ سێبەرەکەشم ، تامەزرۆم بە تەنها بڕۆم ، بۆ جێگەیەك تەنها تەنهایی هاورێم بێ ، من و ئەو بە تەنها بین دور لە مرۆڤ ، دور لە سیاسەت لە مێژو ، لەهەموو بونەوەرێك دوور بم ، تەنانەت لە ووشەو وێنەش دوور بم من ئەمەوێت تا ماوم بە تەنها بژیم تا ساتێك دێت پیردەبم تاڵە سپییەکانی پرچم دەهۆنمەوە ، بە تەنها گۆچانەکەم ئەکەمە هاورێم و لە کەناری مردنێکدا لە ئێوارە مەغریبێکدا لە گەڵ پرتەقاڵی بوونی ئاسمانەکاندا و گەرانەوەی چۆلەکەکان بۆ هێلانەکانیان ، ئاوابوون ڕاپێچم بکات و ئیتر لەم ژیانە وون ببم.

من ئێستا تێدەگەم هیچ شتێك هێندەی تەنیایی بە چێژ نییە.